# کاروان

٧٦

حوزەیرانی /١٩٨٩/ساڵی حەوتەم

ژمارەیەکی تایبەتە بە فۆلکلۆرو کەلەپووری کوردی

گۆڤارێکی رۆشنبیری ی مانگانەیە نەمینداریتی گشتی ی رۆشنبیری و لاوان بە زمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا







# کاروان

ژمارەیەکی تایبەتە
بە فۆلکلۆرو کەلەپووری کوردی

گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی مانگانەیە ئەمینداریتیی گشتیی ڕۆشنبیریو لاوان بە زمانی کوردیو عەرەبی دەری دەکا

سەرنوسەر
محمد أمين محمد احمد

جێگری سەرنووسەر
حسين رشواني

٧٦
حوزەیرانی / ١٩٨٩
ساڵی حەوتەم

لەم ژمارەیەدا



ئەدرەس
هەولێر ئەمینداریتی گشتی ڕۆشنبیریو لاوان
چاپخانەی ڕۆشنبیری
گۆڤاری کاروان
ت ٢٢٦٥٨

نرخی «٥٠٠» فلسە

لە نامەخانەی کتێب و بەڵگەنامەکان لە بەغدا ژمارە ٤٨٣ ی ساڵی ١٩٨٢ ی دراوەتێ
لە چاپخانەی دار الحرية لە بەغدا چاپکراوە

# سەرۆکمان قارەمانێکە هێزە نەوت دزەکانی جیهانی تێکشکاند!!

● سەرنووسەر ●

**یەکی حوزەیرانی لە ڕێبازی شاکارەکانی سەرۆکی تێکۆشەر کاک «صدام حسین ـ خودا بیپارێزێ» قوناغێکی گرینک و پڕ بایەخ و شکۆدار دەنوێنێ؛ چونکە پاش سەرکەوتنی شۆڕشی «١٧ـ٣٠»ی تەمووزی شکۆدار یەکەم تێک گیرانی کۆماری عیراق لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوتی هەرە گەورەو دڕندەو بە دەسەڵاتی جیهانی، شۆڕشی خۆماڵی کردنی نەوت بوو؛ کە بە سەرکردایەتی فەرماندەی تێکۆشەر «صدام حسین»ی بەڕێز بوو.**

لە سەرەتادا دۆستانی عیراق بەزەییان بە عیراق دا دەهات کە بەرامبەر بەم ئەژدیها سامناکەی جیهان تۆقێنەرە «کۆمپانیاکانی نەوتی جیهانی» دەجەنگێ، چونکە خەڵقی جیهان لەم باوەڕەدا بوون کە چ هێزێك لە دونیادا توانای ئەوەی نیە بەربەرەکانی لەگەڵ ئەم کۆمپانیایانە بکات کە هەموو ئیمپریالیزمی جیهانی لە پشتی‌یەوە وەستاوە، بە تایبەتی دەوڵەتێکی بچووکی وەکو کۆماری عیراق کە تازە هەستاوەتە سەرپێ دوای کۆمەڵێك تەنگ و چەڵەمەی دژوار کە پاش شۆڕشی «١٧ـ٣٠»ی تەمووز دووچاری بووبووو، پەیتا پەیتا خەریکی چارەسەرکردنیان بوو.

ئەوانەی ناحەزی عیراقیش بوون خۆشی خۆشی ئەوەیان بوو کە کۆماری عیراق، کۆماری شۆڕشی «١٧ـ٣٠»ی تەمووز ئەوەها زوو تووشی بە تووشی ئەو دوژمنە بێ بەزەییو سامناکە بوو، کە چەند دەوڵەتی تێکشکاندوە، چەند عەرشی ڕووخاندووە، چەند تاجی توورداوە، چ جای دەوڵەتێکی بێ‌تواناو کەم ووزەی وەکو عیراق کە بتوانێ بەری پیلان و فرۆفێڵی ئەو کۆمپانیایانە بگرێت؟

بەڵام سەرۆکی خۆشەویست کە پێی هاوێشتە مەیدانی ئەم جەنگە سەختە، بەدوو هێز پشت قایم بوو؛ **یەکەم**: هێزی بڕوا بە هەڵوێست، کە هەڵوێستی خاوەن مافێکی سرووشتیو یاسایی‌یەو، خاوەن مافەکەش گەلێکی وەکو عیراقە کە لە ماوەی «١٢» ساڵان بەسێ شۆڕشی وا هەڵستا کە گەلانی جیهان کەمیان توانیویانە تەنها بە شۆڕێکی وەکو لەو سێیانە هەڵسن.

**دووەم هێزیش**: هێزی گەلە، ئەو هێزەی ئەگەر باش کۆبکرێتەوە، ئاراستەی هەر دوژمنێکی بکەیت بێ‌گومان ڕای دەماڵێو تێکی دەشکێنێ، جا سەرەك صدام بەم دوو هێزە بەرەنگاری کۆمپانیاکانی نەوت دز بووەوە، ڕەگ و ڕیشەیانی لە ئەرزو بەروو بوومی عیراق هەڵکەندو، بەروو بوومی نەوتی خستەوە دەستی خاوەنە ڕاستەقینەکەی کە گەلی عیراقەو، ئەو بەروو بوومەیش لە پێناوی وەدی هێنانی بەرژەوندیی ئەو گەلەدا ئاراستە کرا.

ئەوەبوو بنیادنانی عیراقی نوێ لە هەموو لایەکەوە دەستی پێکردو بە ماوەیەکی زۆر کورت هەنگاوی زۆر فراوان ئەنجام درا، لە مەیدانی کشت و کاڵ و پیشەسازیو زانیاری و هونەرو بازرگانیدا لە سەرووی هەموو ئەوانەیشەوە دابین کردنی پێداویستی جەنگی «قادسیەی صدام»ی سەرکەوتوو دژی رژێمی خومەینی شەرفرۆش، کە هەشت ساڵی خایاند، هەر ئەو فەرماندە تێکۆشەرەی کە لە شکری نەوت دزانی شکاند، رژێمی خومەینیشی بەزاند، کە دار دەستی ئەو دزانە بووو، ئاراستەی کۆماری عیراقی تێکۆشەرو ئاشتی خوازیان کردبوو، بۆ ئەوەی رێبازی پێ بگۆرن، یان تۆڵەی ئەو سەرکەوتنەی لێ بکەنەوە کە لە خۆماڵی کردنی نەوتدا وەدی هاتبوو.

**ئێستاش دوای سەرکەوتنی عیراق لە جەنگ دا، قارەمانی بلیمەت کە هەمیشە ئالآی ئاشتی خوازیی بەدەستی خۆی دەشەکاندەوە، هەتا ملی بەرەگەزپەرستان و شەر فرۆشانی ئێرانی شۆرکرد، بۆ ئەوەی جەنگ لە دژی عیراق راوەستێنن و ئاشتی قەبووڵ بکەن.**

# بایەخی ڕۆژی یەکی حوزەیران لەمێژووی خەباتی گەلەکەماندا

حسن حسین الله داد

جێگری ئەمینداری گشتیی ڕۆشنبیریو

لاوانی ناوچەی کوردستان

ڕۆژی یەکی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٢ ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش بە بڕیارێکی مێژوویی و جوامێرانە پشکی زۆربەی زۆری کۆمپانیەکانی بێگانەی لەسامانی دەرهێنانی نەوتی عیراقی خۆماڵی‌کرد، ئەم هەنگاوە شۆرشگێرانەیە لە سەردەمانێك بڕیاری لەسەردرا کە شۆرشەکەمان هێشتا بە قۆناغێکی وورد و ناسکدا تێپەردەبوو بە تایبەتی کە هێشتا چوار ساڵ بوو دەسەڵاتی سیاسی گرتبووە دەست و هێشتا چاوچنۆك و دوژمنانی شۆرش و حیزب و کۆنە خوێنمژانی گەلەکەمان خەریکی داونانەوەو پیلان گێران بوون بۆ لەباربردنی شۆرش و دەسکەوتەکانی،

پارێزەرانی کۆمپانیا بێگانەکان گەف و گوریان دەکردو کۆنەپەرستو کرێگرتەکانیشیان لەناوەوەی وولات دا هەوڵیان ...! هەرچی بۆیان دەکرێ بیکەن. کۆسپ بخەنە بەر ئەم ڕێبازە پیرۆزە ئەمە لە لایەك لە لایەکی دیکەوە باری ئابووری عیراق لە پاش ماوەی ئەو ڕژێمە یەك لە دوای یەکانەی حوکمی وولاتیان دەکرد ئابووریەك بوو داری بە سەر بەردەوە نەبووە ئابووریەکی پاشکەوتووی بەرماوەی دەرەبەگایەتی لە لادێو بۆرژوای بازرگانی لەشار، چ پیشەسازیەکی ئەوتۆ نەبوو ئابووری نیشتمانی بەرەو پێش بەرێ ئەوەی کە هەش بوو بە بەرژەوەندیەکانی بازاری سەرمایەداری جیهانیەوە گرێدرا بوو. لەباری دەروونیشەوە کۆمەڵانی خەڵکی عیراق ئامادەییەکی دەروونی ئەوتۆیان نەبوو کە بتوانن ئەم کردە شۆرشگێریە هەرس بکەن (هضم) چونکە بەکرێ گیراوان وەها مێشکی گەلیان ئاو دابووین کە نەدەکرا هەرگیز کۆمپانیای بێگانە وا بە ئاسانی دەست لە بەرژەوەندیەکانی خۆیان هەڵبگرن تا لەم هەل و مەرجە ناسك و دژوارە ناوەکیو دەرەکیانە دابوو ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش بە بڕوا بەخۆبوونێکی لە ڕادە بە دەرو پشت ئەستوور بە کۆمەڵانی خەڵك زەبرێکی کوشندەو کاریگەری لەبەرژەوەندیە سیاسیو ئابووریەکانی ئەو کۆمپانیە بێگانانە داو موڵکایەتی ئەم سامانە نیشتمانیە بە بایەخە لەدەستی ئەوان سێنرایەوەبووە موڵکی هەموو گەلی عیراق، بایەخی ئەم بڕیارە مێژوویە سەرەرای ئەوەی هەنگاوێکی ئازایانەو چاو نەترسانە بوو بەکورتی لەم چەند خاڵانەی خوارەوە کۆ بۆوەتەوە.



### ١ـ بایەخی سیاسی

بایەخی سیاسی ئەم بڕیارە مەزنە لەوەدا خۆی دەنوێنێ کە بە یەکجاری نفوزو دەسەڵاتی بێگانەی لە وڵاتەکەمان لەناوبردو کۆتایی هێنا بە دەست تێوەردانی بێگانە لە کارو باری ناو خۆی وڵاتەکەمان و کوێخایەتیکردن بە سەر دەسەڵاتی سیاسیمان، پێشتر ئەم کۆمپانیە سەرمایەداریانە دەوری ترسناکیان دەگێڕا بۆ ئاراستەکردنی سیاسەتی ناوەخۆو دەرەوەی وڵات پێش شۆڕشی ١٧ـ٣٠ی تەمووزی مەزن و شەقڵی کاریگەری وجوودی ئەوان لە سیاسەتی دەرەوەو ناوخۆی عێراق بەتەواوی‌و ڕاشکاوی دیاربوو، ئەوانە بەپێی ئەو شوێنەی لە ئابووری عێراقدا هەبوویان شەرەفی چەند نۆکەرو قولە نۆکەرێکیان کڕیبوو بە هۆی ئەوانەوە پیلانی سیاسیان دەگێڕاو ئەویان دەبردو ئەویان دەهێنا بەڵام ئەم بڕیارەی شۆڕش ئەم هەموو دەسەڵات و نفوزی سیاسیەی ئەوانی زیندەگۆڕکردو بەمەش دەسەڵات و سەربەخۆیی دەسەڵاتی سیاسی وڵاتەکەمان بەتەواوی بەدی هات.

### ٢ـ بایەخی ئابووری

بێگومان سامانی نەوت گەورەترین سەرچاوەی داهاتی نەتەوەییمانە وەبەرهێنانی گەورەترین پڕۆژە پیشەسازی‌و پیترۆکیمیایی‌و کشت و کاڵیەکان لەسەر داهاتی ئەم سامانە وەستاوە، پێش خۆماڵی کردنی نەوت بە حوکمی ئەوەی قازانجەکەی دەچووە ناو گیرفانی بێگانەوە، نەدەبوا بیر لەم جۆرە پڕۆژانە بکرێتەوە، بێجگە لەمە لە هەموان ئاشکرایە کە سەربەخۆیی سیاسی بێسەربەخۆیی ئابووری لەتواناداً نیەو ناکرێ.

ئەمڕۆ سامانی نەوت بووەتە بنکەیەکی ماددی پتەو بۆ ئەو هەموو گۆڕانکاریە ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیریانەی کە شۆڕشەکەمان بەسەرکردایەتی سەرۆکی فەرماندە صدام حسین ـ خوابیپارێزێ ـ پێیدادەڕوا.

### ٣ـ بایەخی ستراتیژیی

خۆماڵیکردنی نەوت بایەخێکی ستراتیجی هەیە ئەویش بریتیە لەوەی کە دۆست و دوژمن هاتنە سەر ئەو باوەڕەی کە دەبێ شۆڕشی ١٧ی گەلاوێژ بە چاوێکی دیکە سەیری بکرێت، چونکە بڕیاری (١)ی حوزەیران بەگژدا چوونەوەیەکی سیاسی‌و ئابووری بوو دژی بەرژەوەندیە ستراتیژیەکانی بێگانە لە نیشتمانی عەرەب و هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەم هەنگاوە ستراتیجیە خەوو خەیاڵی پارێزەرانی ئەم کۆمپانیانەی پووچەڵ کردەوە، بایەخی ئەم سامانە لە پشتگیری کردنی جەنگی عادیلانەی قادسیەی صدام ی ئەمڕۆدا دەرکەوت و ستراتیجیەتی عەسکەری لەدژی شەڕی بەسەردا سەپێنراومانی لە دژی ئێراندا ڕاوەستاوو سەقامگیرتر کردو بە دونیاشمان سەلماند کە ئێمە لەژێر سێبەری فەرمەندەی مەزنمان صدام حسین ی تێکۆشەر هەر سەرکەوتووین و دوژمنانیشمان جگە لەسەر شۆڕی‌و بەزیوی ‌هیچ بەشێکیان نیە.



عەزیز رەشید حەریری

# ڕاپۆرتێکی تایبەتی دەربارەی چالاکی‌یەکانی لیژنەی فۆلکلۆر

وێنەگر: أبوبکر ابراهیم

ئەوەی ڕاستی بێت ماوەیەکی دوورو درێژە کۆمەڵە نووسەرو ڕۆشنبیرێکی کورد چاکی مەردایەتیان لێ کردووە بەلاداو، گورج و گۆلانە کەوتوونەتە کۆکردنەوەو بلاوکردنەوەی بەشێکی دەولەمەندو بەپێزی ئەدەبی نەتەوایەتیمان ، کە فۆلکلۆرو کەلەپوورە.

ئەوەتا ئەو هەوڵە مەردانەیەی ئەوان برەوی سەندو ڕۆژ دوای ڕۆژ گەشەو نەش و نەمای کرد تا وای لێهات ئەڵقەی هەوڵ و کۆشش و چالاکی‌یەکان فراوانتر بوو، کەسانێکی دیکە لەم شارو لەو لادێی کوردستان خولیای خزمەت کردن و پەرەپێدانی ئەم کارە پیرۆزەیان کەوتە دڵ و ، ئەوانیش لەم مەیدانەدا ئەسپی خۆیانیان تاوداو، گری مەشخەڵی ئەم کارە پڕ لە دڵسۆزی‌و ئەمەگ داری‌یەیان زیاتر تەشەنەی کرد. هەوڵی تاکە کەسی ئەوانیش کەم تا زۆر ڕەوسەی ئەم بەشەی ئەدەبە نەمرەکەمانی دەولەمەندتر کردوو، بەهەرچی چۆنێ بێت توانییان کۆمەڵە بەرهەمێکی چاك و بەسوود بە چاپکراوی بخەنە نێو کتێبخانەی کوردی‌یەوە.

بەم کارەی ئەوان و کەسانی بەر لە خۆیان توانرا کەرەستەیەکی زۆر لە کەلەپوورو فۆلکلۆری کوردیمان لە فەوتان ڕزگاری بێت و بکەوێتە بەردەستی نەوەی ئێستاو، ببێتە زەخیرەیەکی چاك بۆ نەوەکانی داهاتوو، بەڵکو ئەوە خوایە ئەوان چاکتر بیان پەرژێتە سەر لێکۆڵینەوەو ساغ کردنەوەی ئەو لایەنانەی پێویست بە ساغ کردنەوە دەکات ، تاوەکو زیاتر دەولەمەند بێ‌و، بەشێوەیەکی تازەترو لەبارتر بیخەنە بەردەستی ڕۆشنبیرانی کوردو بێگانە..

نکوڵی لەوە ناکرێ کە هەر ئەم دڵسۆزی‌و خۆشەویستی‌یەی فۆلکلۆرو پاراستنی ئەدەبی فۆلکلۆرو کەلەپوور بوو وای لە هەندێ برادەری فۆلکلۆر پەروەر کرد کە لە سەرەتای ساڵی «١٩٨٨»دا بیر لەوە بکەنەوە ئەمجارەیان هەنگاوێکی دیکە بەرەو پێشەوە بهاوێن و، لە مەیدانی هەوڵی تاکە کەسی‌دا دەربچن و ئیتر بە کۆمەڵ بکەونە کۆشش کردن، ئەوەبوو هەر زوو بیر لەوە کرایەوە کە بە هاوکاری لەگەڵ دەزگایەکی ڕەسمی سەر بە دەوڵەت و پەیوەندار بە جموجوڵی ڕۆشنبیری لیژنەیەکی تایبەت بە فۆلکلۆر دابمەزرێ‌و، هەوڵ بدرێ سنووری کارکردنەکەیشی بەرە بەرە فراوان بکرێ بۆ ئەوەی هەموو ناوچەکانی کوردەواری بگرێتەوە..

**ئەم هەنگاوە وەکو سەرەتایەك لە شاری هەولێر سەری هەڵداو، لە ڕۆژی - /ی تەمووزی ساڵی ١٩٨٨دا ئەو لیژنە فۆلکلۆری‌یەی کە لەم بەرێزانە پێکهاتبوو یەکەمین کۆبوونەوەی خۆی کرد**

**● مولود قادر بێخاڵی.**

● محمود عبدالله زامدار.
● عزیز رشید حەریری.
● أسعد عدو رسول.
● طارق مجمد جمباز.
● داود محمد شرۆڵ.
● عمر ابراهیم عزیز.
● چتو حسن عزیز.

## ● «گۆڤاری کاروان» ژمارەیەکی تایبەت بە فۆلکلۆر.

لیژنەکە هەر لە یەکەم کۆبوونەوەدا «دە» راسپاردەی بەرز کردەوە بۆ بەرێوەبەرایەتی رۆشنبیریی جەماوەر بۆ ئەوەی بەرێوەبەری ئەو بەرێوە بەرایەتیە کاك «عبدالرزاق مرعی» کە بە شێوەیەکی رەسمی سەرۆکی لیژنەکە بوو بەرزیان بکاتەوە بۆ ئەمینداریەتی رۆشنبیریو لاوانی ناوچەی کوردستان، خوا هەڵناگرێ ئەوانیش وە بە تایبەتی بەرێزان کاك محمد أمین محمد احمد ئەمینداری گشتیو، کاك محمد محی الدین جێگری ئەمینداری، کاك کیسرێ جاف بەرێوەبەری رۆشنبیری لە دیوانی ئەمینداریەت، رەزامەندییان لەسەر هەر هەموو راسپاردەکان نیشان داو لە رۆژی ١٩٨٨/٨/١٧دا بە فرمانێکی تەنفیزی ئاگاداریان کردینەوە. هەر لەو رۆژەوەش بەرێز ئەمینداری گشتی ئاگاداریگۆڤاری «کاروان»ی کرد دەربارەی تەرخان کردنی ژمارەیەکی گۆڤارەکە کە تایبەت بێ بە فۆلکلۆرو کەلەپووری کوردی، ئیتر هەر زوو لیژنەی فۆلکلۆر دوو بانگەوازی لە گۆڤاری کاروان و پاشکۆی عیراقدا بڵاو کردەوە دەربارەی ژمارە تایبەتی‌یەکە، ئەوەتا وا ئیمرۆ بەتێرو تەسەلی لەبەر دەستتانەو، هیواخوازین ساڵانی دادێ گەر ئەم بوارەمان بۆ رەخسا زۆر لەوە باشتریش بێت.

## ● دیدارێك بۆ فۆلکلۆری کوردی.

دەربارەی راسپاردەی یەکەمیش کە بەستنی دیدارێك بوو لەسەر ئاستی ناوچەی کوردستان ، ئەگەرچی بۆ ئەویش هەر دیسان دوو بانگەوازمان بڵاوکردەوە لە گۆڤاری کاروان و پاشکۆی عیراق بەڵام بەداخەوە تەنها توانیمان میوانداریی کاك عوسمان هەورامی بکەین لە شاری سلێمانی‌یەوە، لە هیچ لایەکی دیکە ئەو جۆرە بابەتە چروپرانەمان بۆ نەهات کە شایانی دیدارەکە بن، هەر چەندە حەزمان بەوە دەکرد برادەرانی شاری دهۆك و شارەکانی دیکەیش بەشداریمان بکەن ، بۆیە دیدارەکە لەگەڵ دەست کورتیشدا، چونکە لە «١٩»ی مانگی دوازدەی ساڵی ١٩٨٨دا دەستی پێکرد؛ لەگەڵ ئەوەشدا دوو رۆژی خایاند و چوار باسی تێدا پێشکەش کرا لەگەڵ دوو ووتار کە بەم جۆرە بوو..

**ا ـ ووتارەکان** :

● ووتاری بەرێوەبەرایەتی رۆشنبیریی جەماوەر لە هەولێر ـ کاك «عبدالرزاق مرعی» خوێندیەوە.

● ووتاری لیژنەی فۆلکلۆر ـ کاك «عزیز رشید حەریری» خوێندیەوە.

**ب ـ باسەکان** :

**ئەم بەرێزانە بەشدارییان تیایدا کرد:**

١ـ کاك أسعد عدو.
٢ـ کاك خالد جووتیار.
٣ـ کاك عوسمان محمد هەورامی.
٤ـ کاك کەریم شارەزا.

**ج ـ رێز لێنان:**

**هەر لەو دیدارەدا رێز لەم سێ مامۆستا بەرێزە نرا..**

١ـ عبد جاسم .
٢ـ عەزیزی مەلای رەش .
٣ـ محمد روشدی دزەیی.

● لە کۆتایی دیدارەکەشدا ئەم بەرێزانە خەڵات کران..
● مامۆستا کەریم شارەزا.
● مامۆستا عوسمان محەمەد هەورامی.

● ماموستا خالد جووتیار.
● ماموستا ئەسعەد عەدۆ.
● ماموستا مولود قادر بێخاڵی.
● ماموستا محمود زامدار.
● ماموستا چەتۆ حسن عزیز.
● ماموستا عزیز رشید حریری
● ماموستا طارق محمد جمباز.
● ماموستا داود محمد شرۆڵ.
● ماموستا عمر ابراهیم عزیز.
● ماموستا جعفر قادر بەرزنجی.

ئەوەی شایانی باسە دیدارەکە بە چاودێریی ماموستا (محمد پیرۆز) بووکە ئەوسا وەکیلی ئەمینداری گشتیی رۆشنبیریو لاوان بوو، بەرێز کاك محمد محي الدين جێگری ئەمینداری گشتی ئامادەی دیدارەکە بوو لەگەڵ کۆمەڵێك ئەدیب و ئەدەب دۆستانی کورد.

**لەدوا رۆژی دیدارەکەشدا بەرێزان محمد محي الدين جێگری ئەمینداری گشتی رۆشنبیریو لاوان و، دکتورە شوکریە رسول و، کاك محمد أمين پێنجوێنی بەشدارییان لە دابەشکردنی خەڵاتەکاندا کرد.**

دەبێ ئەوەیش بڵێین کە لە مانگی ئەیلولی ١٩٨٨دا کاك جعفر قادر بەرزنجی بووە ئەندامی لیژنەی فۆلکلۆرو، لەپاڵ ئەندامانی دیکە کەوتە کارکردن .

هەر لەگەڵ ئەم راپۆرتەدا دەقی هەردوو ووتارەکەی بەرێوەبەرایەتی رۆشنبیریی جەماوەرو لیژنەی فۆلکلۆر بڵاو دەکەینەوە، لە شوێنێکی دیکەشدا هەر چوار باسەکە بڵاوکراونەتەوە.

بۆ زیدە ئاگاداربیش کاك ئەسعەد عەدۆ لە ژمارە «٧٢»ی گۆڤاری «کاروان»دا لە گۆشەی کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا بەدرێژی لە دیدارەکە دواوە.

## ● بەشداری کردن لە هەفتەی فۆلکلۆرو کەلەپووری عیراقدا، لە بەغدا..

بە نیسبەت خاڵی سێیەمی راسپاردەکانیش کە بریتی بوو لەوەی داوا لە وەزارەتی رۆشنبیریو راگەیاندن بکرێ شوێنێکی تایبەتی بۆ لیژنەی فۆلکلۆر دیاری بکەن لە هەفتەی کەلەپوورو فۆلکلۆر کە هەموو ساڵێك لە بەغدا دەبەسترێ ـ کە ساڵان لە مانگی نیسان بوو؛ بەڵام ئەمساڵ لە رۆژی «١»ی حوزەیران دا دەبێت ـ ؛ بۆ ئەویش هەر دیسان ئەمینداریەت بە نووسراوێکی تایبەتی ئاگاداری وەزارەتی کرد، ئەوانیش بێ سێ و دوو داواکارییەکەیان بەلاوە پەسند بوو، داوای ئەوەیشیان کردبوو پرۆگرامێکی ئەو بابەتانەی مەبەستمانە بۆیان بنێرین، ئەوەبوو لە رۆژی «١٦»ی تشرینی یەکەم بەرێزان کاك «چەتۆ حسن و عزیز حەریری» چوونە بەغداو سەردانی بەرێز «باسم تکریتی» بەرێوەبەری دایەرەی کەلەپوورو فۆلکلۆری عیراقییان کرد، ئەویش بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە ئامادەیی خۆیانیانی نیشان دا بۆ هەموو بەشداری کردنێکی تایبەت بە فۆلکلۆرو کەلەپووری کوردی، هەروەها باسی ئەوەیشی لەگەڵدا کرا کە دوو باسی تایبەت بە فۆلکلۆری کوردییەوە لە هەفتەکەدا لەتەك کۆڕی وڵاتە عەرەبییەکان پێشکەش بکرێ. ئەم مەسەلەیە تاوەکو ئامادەکردنی ئەم راپۆرتە بەردەوامەو، دوا جار لە مانگی نیسانی ئەمساڵدا کاك «چەتۆ حسن» کە نوێنەری ئەمینداریتی گشتیی رۆشنبیریو لاوان بوو لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادەبوو کە بە سەرۆکایەتی بەرێز وەزیری رۆشنبیری و راگەیاند لە بەغدا بەسترابوو، دەربارەی هەفتەی باسراو، کاك (چەتۆ) دووبارە مەسەلەی بەشداری کردن و هەردوو باسەکەی خستبووە روو دیسان ئەوان رەزامەندیی خۆیانیان نیشان دابوو، ئەوەبوو لە سەرەتای مانگی ئایاری ئەمساڵدا بە نووسراوێکی تایبەت داوای پرۆگرامی بەشداری کردنی لیژنەی فۆلکلۆرو کەلەپووریان کردبوو. بەڵام بەختانە ئێمە زووتر بە تەلەفۆن دەقی پرۆگرامەکەی لیژنەمان پێ راگەیاندبوون.

**ئەڵبەتە بەشداری کردن لەم هەفتەیەدا کە لە ١/٦/١٩٨٩دا دەست پێ دەکاو «١٠» رۆژ دەخایەنێ، خۆی لە خۆیدا خزمەت کردنێکی گەورەیە بۆ ئەدەبی فۆلکلۆری نەتەوەکەمان و، دەشبێتە هۆیەکی چاك بۆ**

**ئەوەی زیاتر کەلەپووری کوردو فۆلکلۆرەکەی بە گەلانی عەرەب بناسێنین.**

ئەوەی شیاوی باسیشە بۆ ئەم بەشداری کردنە دەبێ بە هەمـــوو رێـــزەوە سوپـــاسی کاك محمـدأمـــین محمـد احمـد، ئەمینـداری گشتـیی رۆشنبـیری‌و لاوان و، جێگـرەکەی کاك محـمـد محــي الدین محمـد بکــەین کە هەمـــوو کۆسپ و تەگـەرەیـەکیـان لەبـەردەمـدا هاسان کردین و، بەردەوامیش دەستی هاوکاریمان بۆ درێژ دەکەن.

لەراستــیدا ئەمـــە کورتـــەیـــەکی چالاکییـــەکـانی لیژنەکەمانەو، هیوادارین لەم چەند مانگەی دادێ هەوڵی زیاتر بدەین بۆ ئەوەی خزمــەتێکی باشتــری ئەم بەشـــە هەمیشـــە زینـدووەی ئەدەبی گەلەکەمان بکەین. ئەڵبەتە دەبێ هەر بەم بۆنـــەیـــەشـــەوە سوپاسی ئەو بەرێزانە بکەین کە بەشدارییان لەگـــەڵدا کردووین، هەروەهـــا ئەو برا بەرێزانەی کە ئەندامی یەکەم لیژنەی فۆلکلۆر بوون ، دوای ئەوەی لەبەر هەندێ هۆی هونەری کە پەیوەندارە بە شێوەی بەشداری کردن لە کاروباری ئیداری‌و هونـــەریی لیـــژنـــەکـــە، لە لیژنەی دووەمدا دووبارە نەبوونەوە، کە بەم شێوەیە پێکهاتەوە:

**- بەرێز جێگری ئەمینداری گشتی رۆشنبیری‌و لاوان - کاك محمد محي الدین محمد - سەرۆك**
**- بەرێز مولود قادر بێخاڵی - جێگری سەرۆك**
**- بەرێز عەزیز رەشید حەریری - سکرتێر**
**- بەرێـــز کاك چەتـــۆ حســـن - ئەنـــدامـــی پەیـــوەنـــدی ئەمینداریەت لەگەڵ لیژنە.**
**- بەرێز داود محمد شرۆڵ - ئەندام .**
**- بەرێز طارق محمد سعید جمباز ئەندام .**
**- بەرێز عمر ابراهیم عزیز ئەندام .**

بەهــەر حاڵ هیـــواخـــوازین ئەم دەستـــەی تازەیە زیاتر کۆشش بکەن و، هەوڵی سەرکەوتوو بدەن بۆ زیاتر فراوان کردنی ئەڵقەی خزمەتکردنی فۆلکلۆرو کەلەپووری کوردی بە پشتیوانی هەموو ئەو برادەرە ئازیزانەی بێ سێ‌و دوو مەبەستیانە ئەدەبی رەسەنی نەتەوەکەمان گەشە بکات و پێش بکەوێ..





**نص الكلمة التي القاها السيد «عبدالرزاق مرعي» مدير الثقافة الجماهيرية في اربيل، في يوم افتتاح ملتقى الفلكلور الكردي الذي انعقد بأربيل خلال يومي ١٩ ـ ٢٠ / ١٢ / ١٩٨٨، وقد ارتأينا نشرها ضمن نشاطات لجنة الفلكلور في هذا العدد الخاص بالفلكلور.**

**لجنة الفلكلور**

**السيد وكيل الامين العام لادارة الثقافة والشباب المحترم**
**الأخوة والاخوات الحضور.**
**اهلا ومرحبا بكم في هذا الملتقى الفلكلوري الذي تنظمه مديرية الثقافة الجماهيرية ضمن الأنشطة التي تعنى بها الامانة العامة للثقافة والشباب في منطقة الحكم الذاتي**

الاوهي:
دراسة التراث الشعبي واعداد البحوث فيه والعمل على تطويره والاستفادة منه والحفاظ على الحرف والفنون والمأثورات الشعبية ونشرها...
والتراث باعتباره رافدا من روافد حضارة الشعوب والأمم ومقياس حي لدرجات تقدمها ونهضتها ورقيها؛

**حظي بإهتمام القيادة السياسية والرسميين المعنيين في الدولة. فماضي شعبنا زاخر بتراثه الثر كإشعاعات مهدت لابداعات العراقيين ورافقت حياتهم الأجتماعية والسياسية على مر العصور، وكان لنا نصيب وافر في تشكيل مكونات التراث والفلكلور العراقي حيث تضافرت جهود العراقيين عربا واكرادا في صياغة هذا اللون من الفنون.**

ومن المسلمات أنه توجد علاقة وثيقة بين الأدب والشعب فالأدب يحفز الشعب نحو انجازات جديدة في بناء المجتمع السعيد ويهدف في النهاية الى خدمة الشعب والعمل على تطوير الثقافة الفنية للمجتمع وتطوير التطبيق الابداعي للأدب الجديد.
بل انها تحافظ على السمات القومية والوطنية للشعب في نتاجه الفكري واليدوي (المصنوع).
وفي هذا السياق يقول أحد الباحثين:«ان أساس الادب في الفلكلور ـ أي أدب الشعب ـ والفلكلور مادة خام كبيرة وهو مصدر معين لجميع الشعراء والأدباء وان فهمنا الماضي جيدا كان نتاجنا الحالي رائعا جدا».
ودراسة الأدب الشعبي أو الفلكلور يعيننا على فهم الحضارات التي ظهرت في بلادنا ـ بلاد الرافدين وآشور، بابل، سومر أربئلو (أربيل) / الحظر الى..الخ ومن خلال مفرداته سواء الحكايات أو

جذور حاضرنا المزدهر وصولا الى غد مشرق ومن هنا يتضح لنا عمق المعاني التي جسدتها مقولة السيد الرئيس القائد صدام حسين (حفظه الله): « ان الأمة التي ليس فيها فنانون كبار وشعراء كبار ليس فيها سياسيون كبار».
واذا كانت الأمانة العلمية في مجال البحث تقتضي منا الدقة والتحري والتمحيص طلبا للحقيقة، فإن التزام الموضوعية في البحث والتنقيب يعتبر مطلبا أساسيا للباحث في مجال الفلكلور وبقدر عنايتنا بكتابة التأريخ لأنه جزء من حركة التأريخ.
**نتمنى لهذا الملتقى الموفقية وأن تغني الدراسات والبحوث المقدمة إليه الأدب الشعبي بصفة عامة والكردي بصفة خاصة وفي سياق البيئة الراقية ككل وكحالة غير مجتزئة في ضمير ووجدان ابناء**





**ئەم بابەتەی خوارەوە دەقی ووتارەکەی لیژنەی فۆلکلۆرە، کە لە رۆژی ۱۹۸۸/۱۲/۱۹دا لەکاتی کردنەوەی دیداری فۆلکلۆردا لە لایەن کاك (عەزیز حەریری) خوێندرایەوە.**

**لیژنەی فۆلکلۆر**

دەقی

**● بەرێز وەکیلی ئەمینداری گشتیی رۆشنبیریو لاوانی ناوچەی کوردستان.**

**● بەرێز جێگری ئەمینداری گشتیی رۆشنبیریو لاوانی ناوچەی کوردستان.**

**میوانە ئازیزەکان، ئەم کاتەتان شاد..**

بە خۆشحالییەکی زۆرەوە، بەناوی لیژنەی فۆلکلۆر لە بەرێوەبەرایەتی رۆشنبیریی جەماوەر، گەرمترین بەخێرهاتنتان دەکەین و، هیوای بەختەوەریو سەرفرازیتان بۆ دەخوازین.

بەرێزان ...

ئەڵبەتە هەموو لایەکتان، لەوە ئاگادارن کە لەم چەند ساڵەی دواییدا، لە هەر سێ پارێزگاکانی کوردستاندا، جموجوڵێکی چاك لە مەیدانی کۆکردنەوەو زیندوو کردنەوەی فۆلکلۆرو کەلەپووری کوردیدا بووەو بەردەوامیشە، بۆ بەجێهێنانی ئەم ئەرکە پیرۆزەیش هەندێ نووسەری لاوو پیری بەتەمەن جاحێڵ کەوتوونەتە خۆو، ئەوەی بۆیان کرابێ کردوویانەو، بەردەوامیش هەوڵی لەخۆبووردوانەیان داوە، بۆ فراوان کردن و، گەشەپێکردنی ڕەوسەی فۆلکلۆرو کەلەپووری کوردی بەهەموو جۆرو بابەتەکانیەوە. بە ئامانجی پاراستن و دەوڵەمەندکردنی ئەو سامانە بەپێزو چروپڕەی لەباوو باپیرانەوە بۆ نەوەکان ماوەتەوەو، هێشتا دەستی لەباربردن و فەوتانی پێ ڕانەگەییووە.

بۆ ئەم مەبەستەش هەوڵ و کۆششی چەند کەسانێکی دڵسۆزی کەلەپووری نەتەوایەتی کە بە ئەرکی تاقە کەسی لێرەو لەوێ بازووی مەردایەتیان لێ هەڵماڵیوەو، توانیویانە بەشێکی چاکی ئەم سامانە مەزنە بپارێزن و، لەفەوتان ڕزگاری بکەن.



**شان بەشانی ئەوانیش، هەندێ دام و دەزگای پەیوەندار بە مەسەلەی پەرەپێدانی کاروباری رۆشنبیریو. بوژاندنەوەو پاراستنی سامانی نەتەوایەتیمان، کە لایەنێکی زۆر گرنگ و مەزنی رۆشنبیریی - لێ پێك دێ، ئەڵبەتە ئەویش فۆلکلۆرو کەلەپوورە.**

ئەوەی راستی بێ دەمێکە ئەو لایەنانە چاکی مەردایەتیان لێکردووە بەلادا، چ لە رێگای دەزگاکانیانەوە لە پارێزگاکانی ناوچەی کوردستان و، چ لە رێگای دەزگاکانی مەرکەزی لە بەغدا، بە پشتگیریو هاوکاری سەرکردایەتیو حیزب و دەوڵەت، توانیویانە دەستی یارمەتی بۆ هەموو هەوڵ و کۆششێکی خێرخوازانە درێژ بکەن.

**هەر لەم روانگەیەشەوە ئەمینداریەتی گشتیی رۆشنبیریو لاوانی ناوچەی کوردستان لە رێگای بەرێوەبەرایەتییەکانی رۆشنبیریی جەماوەر لە هەرسێ پارێزگاکانی ناوچەی کوردستاندا هەر لەگەڵ هاتنە کایەوەیدا هەوڵێکی زۆریان داوە بۆ ئەوەی بە هاوکاری هەموو لایەك و، بە پشتگیریی ئەمینداریەت و، دەزگاکانی دیکەی ناوچەی کوردستانەوەهەرچی لەتوانادا بێت بیکەن بۆ کۆکردنەوەو پاراستنی بەشێکی زۆری ئەو ئامێرو کەرەستە فۆلکلۆریانەی کە لە ناوچەی کوردستاندا وەدەست دەکەون و، هێشتا لەنێو نەچوون، بۆ ئەم مەبەستەیش هەر لە زووەوە چەند لیژنەیەکی تایبەتی بۆ دامەزراوە. ئەو لیژنانەیش لە ساڵانی رابردوودا توانیویانە ئەنجامی چاك بەدەست بێنن و، بەرهەمێکی چاك و دەوڵەمەندی کەلەپووری کوردی کۆبکەنەوەو**

**بیپارێزن، کە تا ئێستاش بەشێکی ئەو ئەرکە لەو پیشانگا هەمیشـەیی‌یـەی قەڵای هەولێردا بە ئاشکـرا هەستی پێدەکـرێ‌و، ڕەنگدانەوەی ماندووبوون و هیلاکی‌یەکی زۆری کاری خزمەتگوزارانەی لیژنەکانی ئەوسایە.**

هەر لە چوارچێوەی پەرەپێدانی ئەو نەخشەیەو، بە هەوڵ و کۆششی دەستـەیـەك لە دڵسۆزان و خەمخۆرانی فۆلکلۆرو کەلەپـووری نەتـەوایـەتیمـان و، لە ئەنجامی پێشنیاز کردنی ئەوانـەوە کە ئیمـرۆ لە لیژنەیەکدا کۆبوونەتەوە، لە سەرەتای ئەمسـاڵداو، بە پشتگـیری‌یـەکی دڵسـۆزانـەی بەرێـوەبەری بەرێـوەبـەرایـەتی ڕۆشنبـیری جەماوەر مامۆستا «عبدالرزاق مەرعی»، لە سەرەتای مانگی تەمووزی ڕابردوودا لیژنەیەك بۆ کاروباری فۆلکلۆرلەم بەرێزانە پێکهات :

● **مولود قادر بێخاڵی**
● **چتۆ حسن عزیز**
● **محمود عبدالله زامدار**
● **عزیز رشید حریری**
● **طارق محمد سعید جمباز**
● **داود محمد شرۆڵ**
● **عمر ابراهیم عزیز**
● **اسعد عدۆ رسول**
● **جعفر قادر بەرزنجی.**

ئەوەبـوو لە ڕۆژی ٣/ی تەمـووز لیـژنـەکـە یەکـەم کۆبـوونـەوەی خۆی کردو، لە ئەنجـامدا کۆمەڵێك ڕاسپاردەو پێشنیازی بەرزکردەوە بۆ بەرێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری‌ی جەماوەر، کە بریتی بوون لە مانەی خوارەوە:

● **یەکەم**: هەوڵدان بۆ ڕێکخستنی دیداریکی فۆلکلۆری کوردی لەسەر ئاستی پارێزگاکانی ناوچەی کوردستان.

● **دووەم**: ئەو لیـژنـەیـەی کە پێکهـاتووە بکرێتە لیژنەیەکی هەمیشەیی‌و، سەر بە بەرێوەبەرایەتی ڕۆشنبیریی جەماوەرەوە بـێت.

● **سێیەم**: هەوڵی ئەوە بدرێ لە ڕێگای ئەمینداریەتی گشتی‌ی ڕۆشنبـیری‌و لاوانـەوە ڕەزامـەنـدی‌ی وەزارەتی ڕۆشنبـیری‌و ڕاگـەیاندن وەربگیرێ، بۆ تەرخان کردنی ڕۆژێك بۆ فۆلکلۆرو کەلەپـووری کوردی، لەو میهـرەجـانە ساڵانەیەی کە هەموو ساڵێك لە مانگی نیساندا دەکرێ‌و، لەسەر ئاستی وولاتانی عەرەبە.

● **چوارەم: هەوڵدان بەردەوام بێت بۆ دەرکردنی گۆڤاری زبـارەو، بەزووتـرین کات بەچـاپ بگـەیەنرێ‌و، بکرێتە گۆڤـارێـکـی وەرزی، هەر سێ مانـگ جارێ دەربـچێ‌و، ئەمینداریەتی ئەرکی لەچاپدانی بگرێتە ئەستۆ.**

● **پێنجەم**: یەکێ لە ژمارەکانی گۆڤاری کاروان تایبەت بێت بە فۆلکلۆرو کەلەپووری کوردی.

● **شەشـەم**: ڕاسپـاردنی چەنـد ئەدیب و نووسـەرێـك بۆ وەرگـێڕانی چەنـد کتێب و بڵاوکراوەیەکی فۆلکلۆری لە زمانی عەرەبی بۆ کوردی، لە کوردیشەوە بۆ عەرەبی.

**حەوتەم**: ساڵانە ئەمینداریەتی‌ی گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوان ڕێـز لەچـەنـد خزمـەتگوزارێکی بواری فۆلکلۆرو کەلەپووری کوردی بنێت و، کۆڕو کۆبوونەوەی یادکردنەوەیان بۆ ساز بدات.

● **هەشتەم**: ئەو بابەت و بەرهەمە فۆلکلۆری‌و کەلەپووریانەی لە ناوچـەکـەدا هەن بە ڤیـدیـۆ وێنـە بگـیرێن، بۆ ئەوەی بە پارێزراوی بمێننەوە.

**نۆهـەم: داوا لە هەندێ هونەرمەندی شێوەکاری بکرێ تاوەکو چەند پۆرستەرێك بۆ ئەو خزمەتگوزارانە دروست بکەن کە لە بواری فۆلکلۆردا دەوریان بووەو بەردەوامن.**

● **دەهەم**: بودجەیەکی لەبار بۆ لیژنەکە دیاری بکرێ.

بە هەقیقەت ئەم پێشنیازو ڕاسپاردانە هەر هەموو وەکو خۆی بە نووسراوێکی تایبەتی بەرزکرانەوە بۆ ئەمینداریەتی گشتی‌ی ڕۆشنبـیری‌و لاوان، لەوێشـەوە بەرێز ئەمینداری گشتی کاك محمـد أمـین و جێگـری ئەمینـدار کاك محمد محي الدین ، بەوپـەڕی گەرم و گوڕی‌و بەگیانێکی دڵسۆزانە پێشوازیان لە سەرجـەمی ڕاسپاردەکان کردو هەر لە یەکەم ڕۆژەوە دەستی یارمـەتی‌یـان بۆ درێژ کردین و بە دەنگمانەوە هاتن. ئەوەبوو ڕەزامـەنـدی خۆیـانیـان بە نووسراوێکی تایبـەتی گەیـانـدە بەرێـوەبـەرایـەتی ڕۆشنبـیری‌ی جەمـاوەرو، هەندێ برگەی ڕاسپـاردەکـانیش پەیـوەنـدی‌یـان بە وەزارەتی ڕۆشنبـیری‌و ڕاگەیاندن و دیوانی پارێزگاوە هەبوو، یەکسەر بۆیان نووسین و



ئاگاداریان کردن، ئەڵبەتە ئەوەی بەغدا بۆ بەشداری کردن بوو لە هەفتـەی فۆلکلۆرو کەلەپووری عیراق، ئەوەی پارێزگاش بۆ ئەوەبـوو دەستی یارمەتی بۆ ئەندامانی لیژنە درێژ بکەن گەر هاتـوو ویستیـان دەست بە پشکنـین و کۆکردنەوەی بابەت و کەرەستەی فۆلکلۆری بکەن.

بۆ دیدارەکەو بۆ ژمارە تایبەتی‌یەکەی کاروان لیژنەکەمان هەر زوو دوو بانگـەوازی بڵاوکردوەو، داوای هاوکاری کردنی هەموو لایەکی کرد.

ئەوەتـا وا دیـدارەکـە ئیمـرۆ دەستی پێکـردو، یەکەم هەنگـاومـان ئەم بەیـەك گەیشتنـە بچکۆلانەیەی گرتۆتە خۆ، ئەگەرچی حەزمان دەکرد گەلێ لەوە فراوانتر بێ، بەڵام بە پەلەیی ئێمـەو دەست کورتیی کۆتایی ساڵ هەر ئەوەندەیان بوار بۆ رەخسـاندین، لەگەڵ ئەوەشدا نیازی گەورەترمان لە دڵدایەو، پەنا بەخواو بە هاوکاری هەموولایەك لە داهاتوودا ئەنجامی دەدەین.

● بە نیسبەت گۆڤاری کاروان و ژمارە تایبەتی‌یەکەشەوە، ئەوە هەر لە زووەوە، رەزامـەنـدی سەرنـووسـەرو جێـگـری سەرنـووسـەرو سکـرتـاریـەتی گۆڤارەکەمان وەرگرت و، ئەم خاڵەیش نیوەی قوناغەکەی بڕیووە.

بۆ بەشـداربـوونیش لە میهـرەجانەکەی بەغدا، کە لە مانگی نیسانی ساڵی داهاتوودا دەکرێ‌و لەسەر ئاستی هەموو وڵاتـانی عەرەبە، ئەوەبوو لە ١٦ی تشرینی یەکەمی ئەمساڵ دوو ئەندامی لیژنەکە کاك (چتۆ حسن و عزیز حریری) نێردرانە بەغـدا بۆ پەیـوەنـدی کردن بە لێپـرسراون و زامن کردنی بەشـداری لەو میهـرەجانەدا، خوا هەڵناگری ئەوانیش زۆر بە گەرمی‌یەوە بە دەنگمانەوە هاتن و، تەنانەت پێیان راگەیاندین کەوا دەرگـای میهرەجانەکە لەبەردەم بەشداربووانی ناوچەی کوردستانەوە لەسەر پشتەو لە ئێستاوە پێشوازیتان لێ دەکەین.

بۆ ئەم مەبەستەیش نیاز وایە لیژنەکەمان لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٩دا مشـووری خۆ ئامادەکردن و بەشداری‌کردن بخوات و، پرۆگرامێکی تایبەتی‌بۆ دابنێ، ئەڵبەتە ئەویش لەسەر داخـوازی‌ی مەکتەبی بەرێز وەزیری رۆشنبیری‌و راگەیاندن؛ مامۆستا «لطیف نصیف جاسم» بوو.

**بەڵێنی ئەوەشتـان دەدەینێ بەنیسبەت ئەو چەند خاڵەی تریش کە باسمان کردن، ساڵی داهاتوو کاریان بۆ بکەین بۆ ئەنجامدانیان، بەم بۆنەیەشەوە داوای یارمەتی لە ئەمینـداریەتی گشتیی رۆشنبیری‌و لاوان دەکەین و ئاواتی ئەوە دەخوازین کە پرۆژەی گۆڤاری زبارە گیانی وەبـەر بخـرێتـەوەو، زبـارەیش ببێتـە نمـوونـەیـەکی بچکـۆلانەی گۆڤاری «التراث الشعبي» کە لەسەر ئاستی وڵاتدا دەردەچێ.**

**لێرەدا بە ئەرکی وەفـاداری‌ی خۆمانی دەزانین کە پێتانی رابگـەیەنین و بڵێین: کاربەدەستانی ناوچەی کوردستان بەگشـتـی‌و، بەرێـزان وەکیـلی ئەمـینـداری گشتی‌ی رۆشنبـیری‌و لاوان مامـۆستـا محمـد پیرۆز رۆستـەم و، جێگرەکەی بەرێز مامۆستا محمد محي الدين محەمدو، بەرێز بەرێـوەبـەری بەرێـوەبـەرایـەتی رۆشنبیریی، جەماوەر مامـۆستـا عبـدالرزاق مرعي بەتـایبـەتی کە بە هەمـوو توایـەکیانەوە بەدەنگ لیژنەکەمانەوە هاتن و، ئەوەی لە تـوانـادا هەبـوو بۆیـان کردین ، ئەڵبەتە ئەم کارەیشیان مایەی شانازی هەموو لایەکمانە.**

**هەر بەم بۆنـەیـەشەوە سوپاسی برای وێنەگر کاك «ابو بکر ابراهیم» دەکەین کە بەچەند وێنەیەکی فۆتۆگرافی فۆلکلۆری‌ی دیدارەکەی رازاوەتر کرد، هەروەها سوپاسی بەرێـوەبـەرو کارمـەندانی چاپخانەی رۆشنبیری‌و لاوان دەکەین، کە بەماوەیەکی زۆر کەم فۆلدەری دیدارەکەیان بۆ چاپ کردین.**

هەروەهـا سوپـاسی هەموولایەکتان دەکەین کە بەدەنگمانەوە هاتن و، لەم دیدارەدا بەشداریتان لەگەڵدا کردین.. هەر شادو سەرفرازبن و هەربژین .

**لیژنەی فۆلکلۆر**



# کورتە باسێك لە بابەت

# ئەدەبی میللی فۆلكلۆرای كوردییەوە

«ئەم باسە فەسڵێكی بچووكە لە كتێبی (مێژووی ئەدەبی كوردی تازە) كە لە ساڵی ١٩٦٧ لە مۆسكۆ بە زمانی رووسی لە لایەن ئێمەوە بڵاو كراوەتەوە . وا بۆ سوودی گشتیو لەسەر داوای هاورێیان كردمان بەكوردی » .

دوكتۆر مارف خەزنەدار

**رەسەنیو سەربەخۆیی بەرهەمی شیعری میللی سەرزاری نەنووسراوی كوردی لە بنجدا دەگەرێتەوە قۆناغەكانی پێش ئیسلام لە مێژووی نەتەوەی كورددا . فۆلكلۆر ـ كە بریتییە لە تاقی كردنەوەی میللەت و بەرهەمێكی یەكجار جوانی خستۆتە ناو گەنجینەی هونەرەوە ، بە راستی سەرچاوەیە بۆ گورانی ئەدەبی كوردی رەسمی نووسراو.**

بەرهەمی داهێنانی شیعری میللی كوردی ، تا ئێستا لە كۆكردنەوەیدا نەگەیشتۆتە ئەنجام ، واتە كەم كۆكراوەتەوە، كەمتریش لێی كۆڵراوەتەوە . لێكۆڵینەوەكانیش وەنەبێ زۆر بەهێزبن و لە پلەی هونەریی بەرهەمەكەدا بن . رۆژهەلاتناسی ئەورووپا لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەم دا دەستیكرد بە تۆمار كردنی تێكستی فۆلكلۆری ، واتە كۆكردنەوەی . ئەم كارەش بە زۆری بۆ مەسەلەی لێكۆڵینەوەی زمان و دەستووری زمان بووە .

لە سەرەتادا بایەخیان تەنیا بە فۆلكلۆری ناوچەكانی سەرووی كوردستان دەدا . لەگەڵ ئەوەش دا ئەم تێكستە تۆماركراوانەو[١] هەندێ تێبینی و بیرو رای زانستی لەبابەت تێكستەكان و فۆلكلۆر بەتایبەتی كارێكی یەكجار گرنگە بۆ مێژووی ئەدەب و رۆشنبیری كوردی بەگشتی.كۆكردنەوەو لێكۆڵینەوە لە فۆلكلۆری نەتەوەی كورد لە لایەن كورد خۆیەوە لەم بیست ساڵەی دواییەدا دەستی پێ كردووە[٢] . هەرچی ئەورووپاییەكانیشە بە گشتی لەسەر ئەو باوەرەن كە بەرهەمی شیعری میللی كوردی گەلێ دەوڵەمەندە ، لەروخسارو ناوەرۆك دا رەنگاو رەنگ و بابەتی زۆرەو پلەی هونەریی بەرزە .

لەم لایەنەوە O.Blau دەڵێ :« هەژارترین عەشرەتی كورد دەوڵەمەندترین عەشرەتە لە گۆرانیو ئاواز ، ئەمە تەنیا لەناو عەشرەتە كۆچەرەكاندا نییە ، بەڵكو لەناو عەشرەتە نیشتەجێكانی كوردیش دا هەیە .

گۆرانی بێژە میللییەكان خەڵكی كۆدەكەنەوە گۆرانیی مێرانی (حەماسی) یان بۆ دەڵێن و بە سەر رووداوی مێژوویی و دڵداری و ئاوارەیی و دەست لێك بەردان دا هەڵدەڵێن[٣]

فۆلكلۆری كوردی بە هەموو دیالێكتەكانی زمانی كوردی و لە هەموو ناوچەكانی كوردەواری دا لە ناوەوەیە ، شەقڵی نەتەوایەتیی خۆی هەیە رەنگدانەوەی سروشتی تایبەتیی خاكەكە و خوو و رەووشتی كۆمەلایەتییە .

بەلام لەگەڵ ئەوەش دا فۆلكلۆری هیچ ناوچەیێك تەنیا لە

مەڵبەندی خۆی ناخوڵێتەوە ، زوو بڵاو دەبێتەوەو دەچێتە سەر شێوەکانی تریش ، زۆر زوو لە هۆزێکەوە بۆ هۆزێکی تر دەچێ لە دیالێکتێکەوە بۆ دیالێکتێکی تر لەو گەرانەی دا دەوڵەمەندتر دەبێ، بەوەی سۆزو خەیـاڵ و وێنەی لێ زیادو کەم دەکرێ ، هەندێ جاریش کە لە جێگەیێك بۆ جێگەیێك، لەعەشرەتێك بۆ عەشرەتێـك دەخشێ، گەلێ تێکستی تازەی لێپەیدا دەبێ، واتە بەرهەمێك دەبێ بە چەند بەرهەمێکی هەندێ لەیەکتری جیاواز، ئەگەرچی ناوەرۆك لەبنجدا هەر یەکە، بەمە بە تەواوی دەبێ بە سامانی هەموو نەتەوە و هەموو لایێك تێ ی دەگەن .

ئەدەبی کوردی میلی لە بابـەت و ناوەرۆکـەوە بریتی‌یـە لە : چیرۆکی ئەفسـانـەیی، گاڵتـەو گەپ، هەڵهێن (ألغاز)، قسـەی نەستەق و پەندی پێشینان[4] .

باوتـرین جۆری حیکـایـەتی کوردی ئەوەیە کە ناوەرۆکەکەی پێـوەنـدی یێکی راستـە و خۆی بە ژیـانی خەڵکـەوە هەیـە، بەشێـوەیێکی ریـالیـزمیـانـە وێنـەی خاسیـەتی بنچینـەیی دامەزراندنی کۆمەڵ دەگرێ لەو سەردەمەی کە حیکایەتەکەی لێ دروست بووە، ئەمە دیارە پێوەندی‌ی بە مێژووی میللەتیشەوە هەیە

بەشێکی‌تـری کە ئەگەر لە هی یەکەم گرنگتر نەبێ لەو کەمتـر نی‌یە ، ئەو جۆرە حیکایەتە کە لە ئەفسانە (میتۆلۆجی) یەوە هەڵقوڵاوە ، ئەمەش لە ناوەرۆکی گێرانەوەکانی مێژوویی یا ئاینیی رۆژهـەڵاتی هەرە کۆن وەرگـیراون و دەسکاریان تێدا کراوە . بێ گومان هەندێ لەناوەرۆك و رووداوی ئەم ئەفسانانە دەگـەرێنـەوە بۆ ئافێستا (سەدەی هەفتەم ـ شەشەمی پێش مەسیح). گەلێ جۆری ئەم ئەفسانانە ، بە تایبەتی ئەوانەی بە سەر قارەمانیەتی پاڵەوانە بەتواناکان هەڵدەڵێن ، دەتواندرێ لە شانامەی فیردەوسی‌دا ببینرێن .

یەکێ لە شێـوە هەرەبەرزەکانی ئەفسانەی کوردی ئەو بەشە حیکایەتانەن کە پێوەندی‌یان بە سیحرو جادووگەری‌و خەیاڵی بڵاو و دێـو و درنجـەوە هەیـە ، بەشی زۆری ئەم بابـەتـە قارەمانەکانیان دێو و درندەو باڵندەی ئەفسانەیی دەبن.

لەناو کوردا بابەتی گاڵتەو گەپ لە فۆلکلۆرا جێگەیێکی بەرزی هەیـە ، ئەمـە بریتی‌یـە لە گێرانەوەیێکی کورتی تیژ ، پێوەندی‌یێکی تەواوی بە جۆری بیرکردنەوەی خەڵکی ساکارەوە هەیە و بەزمانێکی روون و ئاشکرا پیشان دەدرێ .

ئێمـە لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی‌دا بەرهەمێکی گەلێ دەوڵەمـەنـد لە هونـەری گاڵتـەوگەپ دا دەبینین وەکو ئەوەی زنجیرەیەك لە گاڵتەوگەپ رووداویان لەدەوری تاقە قارەمانێك دەسووڕێتەوە.

بۆ بەڵگـە لەناو کوردەواری‌دا ئەو گاڵتەو گەپە توانج ئامێزانە باوون کە لەسەریا بە زمانی لالە سەرحەد دەگێرینەوە ، ئەم گاڵتـەو گەپـانـە بۆ ئامـانجی سەربـەستی و ئازادی ، یا رەنگـدانـەوەی رووداوی مێـژوویی هاتـوونـەتـە ناوەوە . هەندیکیشیان بیری قووڵ و داهێنان و دانایی و ژیری‌ی خەڵکی ساکاری کۆمەڵ دەنوێنێ ، لەمانە بە تایبەتی گاڵتەو گەپەکانی ئەحەی کورنۆ کە لە ناوچەی سلیمانی بە ناوبانگە[5] .

پەنـدی پێشینـان و قسـەی نەستەق و[6] بۆ پێکەنین و هەڵهێن و زمان شێوێنەرو قسە بە زمانی منداڵ گەلێ لە هونەری تر هەموو سووچێکی ژیانیان گرتۆتەوەو وێنەی ژیانی کۆمەڵن، لەرووی ناوەرۆك و ماناوە رەسەن و سەربەخۆو داهێنراوون، لەرووی روخساریشەوە هونەروەرانە داڕێژراون، هەندێ جار بە شیعر یا بە پەخشانی قافیەدار خۆیان دەنوێنن.

هەرچی گۆرانی‌ی کوردیشـە جۆری یەکجـار زۆرە لە رووی روخسـارو ناوەرۆکـەوە؛ بەڵام پێـویستـە سێ جۆری بنچینەیی لە ناویاندا دیاری بکرێ.

ـ ١ ـ

گۆرانی‌ی کورتی کە ناوەرۆکێکی رەنگـاو رەنگی دەبێ ،وەکـو دڵداری و ماچ و مووچ و لێك دوور کەوتنەوە و خەبات لە دژی داگیر کەری عوسمانی و عەجەم .

ئەم جۆرە گۆرانی‌یە لە سەرووی کوردستاندا «لاوك»و لەخـوارووی کوردستاندا «حەیران»ی پێ دەڵێن[7] . یەکێ لە ئەدگارەکانی ئەم گۆرانی‌یانە ئەوەیەوە ژمارەی کێشی دێرەکانیان رەنگاورەنگە ، واتە چەند کێشێك لە گۆرانی‌یێك دا بەکار دەهێنن ، جگە لەمە بێ گومان کێشی سیلابی (پەنجە ، کەرت) ی خۆماڵی دەبێتە سەنگی کێشانیان وە لە بنجیش دا بۆ مەبەسی گۆرانی و

ئاواز دادەنرێ.

لێرەدا نموونەیێك لە لاوك بڵاو دەكەینەوە كە گۆرانی بێژی كورد لە دوای جەنگی گێتیی یەكەم دایناوە :

**های ل منێ**

**ئەزێ ب دەشتا دیاربەكرا شەووتی كەتم**

**دلێ منێ ب حالێ من شەووتی**

**گرانە دەنگی تۆپ و مەترلوسا و تەیارا**

**ب شەفەقا سبێ‌را**

**ب سەر ئەشیرێ كوردا حەركی**

**شێخ سەعید ئەفەندی [8] بافێ عەلی رەزا**

**ل ئالیێ كوردستانێ دەكر گازی ، دگو :**

**بافی كینو . مێرێ چی بن، چی بخەبێن**

**مێرێ تركا بكوژن**

**دلێ منێ ب حەربا كورداو تركا پر شەووتی [9] ..**

**- ٢ -**

گۆرانییێك كە بە ئاواز دەوترێ و رووداوی تێدا دەبێ كە «بـەیت» ی پێ دەڵێن . لەرووی ناوەرۆكـەوە گێرانـەوەی قارەمـانی و پاڵەوانییـە . هەنـدێ جار پەنـدو ئامۆژگاری و ئاراستـەی خوو رەوشتی چاكیش تێـدایـە. جاری وا هەیـە قارەمانی بەیت خەڵكی ساكاری كۆمەڵەو هەندێ جاری تریش سەرۆكی عەشرەتە .

دەستورێكی تایبەتی لە دروست بوون و ژمارەی دێری شیعر لە بەیت دا نییـە ، لە حەوت هەشت دێرەوە دەست پێ دەكا تا هەشتا دێر. ئەم جۆرە گۆرانییانە بە گشتی لە سەر یەك كێش دادەنرێن ، قافیەشیان بە زۆری جووت دەبێ . هەندێ جارێش وا روو دەدا كە بەشێـك لە گێرانـەوەكـان بە شیعـر دەبن و هەندێكیشیان بە پەخشان ، واتە شیعرو پەخشان یەك لە دوای یەك دێن بۆ دروست كردنی بەرهەمەكە بەشی هەرە زۆری بەیت رەسەن و خۆماڵییە ، واتە لە رووداوی نەتەوایەتیی كوردەوە هەڵقـوڵاوە ، بەڵام لە هەنـدێ گۆرانیدا ناوەرۆكی گشتیی كۆمەڵی ئیسلامی بەكار هاتووە [10] .

لەم ماوەیـەدا پارچـەیێـك لە بەیتی «خەج و سیامەند» بۆ نمـوونـە بڵاو دەكـەینـەوە . سیـامەند لە تەك گۆڕی خەجی خۆشەویستی فرمێسك دەرێژێ و دەلاوێنێتەوە :

**سینگ سپیەكەی نەرم و نۆڵ**

**سۆرە گوڵە ژیكەلەكەم خەجێ گیان**

**تاقە گوڵە بۆن خوشەكەی زەرزاو دەموركریانێ**

**دەردی من دەردێ بوو دەردەكی زۆر گرانێ**

**بە خەوا لێم وەراست گەرا بەندی كوتووانە**

**هەر دەردەدار بە دەردی دەردەداری دەزانێ**

**خەجێ گیان نەمینم لە بۆ ئەوی جوانێ ... [11]**

**- ٣ -**

ئەم بەشـە گۆرانییـە بەشێكی یەكجار گرنگ و بڵاوەو ئەدگاری تایبەتیی خۆی هەیە ، هەر «گۆرانی»شی پێ دەڵێن و بەرامبـەر بە زاراوەی «تـرانـە» دەوەستێ .ئـەمە بریتییە لە كۆپلێتێكی كورتی دڵداری بۆ مەبـەستی ئاواز واتـە گۆرانی چرین دادەنرێ . بە زۆری لەدوو نیوە دێر، یا سێ نیوە دێر یا چوار نیوە دێر پێك دێ، لەرووی كێشەوە بە زۆری بریتییە لە حەوت یان هەشـت یا دە سیـلاب ، وە بە زۆریش لە دە سیلابییەكەدا وەستان لە ناوەراست دا دەبێ . گۆرانی ئاوازی تایبەتی خۆی هەیە . ئەم جۆرە هونەرە بە شێوەیێكی فراوان لە هەموو كوردستان دا باوە ، بە تایبەتی ناوەرۆكی ئەم كۆپلێتانە گەلێ دەوڵەمەندن لە دیالێكتی گۆرانیی زمانی كوردیدا . بە گشـتـی ئەم هونـەرە زۆر خەریكی جوانكـاری و خەیـاڵ و ئەندیشەیە و بایەخێكی زۆر بە غەزەل و دڵداری و ماچ ومووچ و دەست بازی دەدا . لە هەنـدێ لە گۆرانییـەكانی ناوچەی كرماشان گۆرانی بێژ دەڵێ :

شەم بیم شووڵە بیم پەروانەم كەردی

فرە عاقل بیم دێوانەم كەردی [12]

**كزكز دانیشم لە سای دیواران**

**زنجیر وە گەردەن چون گوناهكاران [13]**

**سێ كەس لەی دنیا شەو نەداروٚ خەو**

**ئەووەل بایەقوش دووەم نارەی ئەو**

**سێیەم ئەو كەسە لە دۆس بڕیایە**

**چو برا مەردی جەرگی سزیایە [١٤]**

بریکی دیکە لە گۆرانییەکانی سنە :

**ئەو بالا بەرزە ئەو گوڵ بە سەرە**
**خۆمی کوشتکەو خۆی بێ خەبەرە [١٥]**

**کووچەی کوردستان باران تەرمی کرد**
**گۆنای ئافاق گیان لەدین دەرمێ کرد [١٦]**
**کارەکان گەردوون ئەشێ هەروابێ**
**لەیلێ دەوڵەمەند مەجنوون گەدا بێ [١٧]**

تاکێکیش لە گۆرانییەکانی بانە :

**باڵاکەت بەرزە مەیدە بە خەسار**
**دڵ هەر یەکێکە مەیدە بە هەزار [١٨]**

بەشێکیش لە گۆرانییەکانی سابلاغ (مەهاباد) :

**یاخوا بەخێر بێی میوانی عەزیز**
**بە رۆژی بەهار بە شەوی پاییز [١٩]**
**خۆ من جووتێر نیم جووتم بلبل بێ**
**تۆوم رەیحانە خەرمانم گوڵ بێ [٢٠]**

لە گۆرانییەکانی سلێمانی :

**لە دوور دیارە پەرچەمی خاوی**
**دێوانەی کردوم بە گۆشەی چاوی [٢١]**
**دیسان شەو هات بۆ حاڵی من**
**بۆ دڵەکەی پڕ خەیاڵی من**
**عالەم سووتا بۆ ناڵەی من [٢٢]**

لە گۆرانییەکانی هەولێر:

**وەکی دەچیە شاییێ چەن شیرن پێ دەبزۆی**
**تۆق و تەلەسم و دوگمە بەناز مەمکان دەنگێوی [٢٣]**

لە گۆرانییەکانی کوردی تورکمانستانی سۆڤیەت:

**دورنا خانم گەردەن زەری**
**جایل ژێرا دەدەنە گری**
**ل حالی مە تو نەفکری [٢٤]**

★★★

داهـێـنـانـی شیعـری میللی نە نووسراوی کوردی ناوەرۆکی لە ئایینیشـەوە وەرگـرتـوە . گەلی رێـرەوی ئایینیو فەلسـەفیو ئیـد یۆ لۆجی لاهـووتی رەنگیان لە ئەدەبی میللی کوردی داوەتەوە ، بیرو باوەری موسڵمانی (سوننەو شیعە) و یەزیـدیو یارسـان (ئـەهـلی هەق = کاکـەیی) لە فۆلکلۆری کوردیدا ئاشکراو دیارە. بۆ بەڵگە دەبینین فۆلکلۆری دیالێکتی کرمـانجیی سەرووی زمـانی کوردی کەوتۆتە ژێر تەئسیری ئایینی یەزیدی ، هەر وەها فۆلکلۆری دیالێکتی گۆرانیی زمانی کوردی کەوتۆتە ژێر تەئسیری ئایینی یارسان .

هەر وەهـا دەبینـین سۆفیـزیش بە هەر دوو تەریقـەتە پراکتیکییەکەی کە لە کوردستاندا لە دەروێشیزمی «قادری» و «نـەقشبـەندی» خۆیان دەنوێنن کاریان لە فۆلکلۆر کردووە ، یاخـود دەتـوانـین بڵێـین دەروێشیـزم کە لە سۆفیزم بۆتەوەو رەنگدانەوەی لایەنی پراکتیکیی سەلبی ئەوە ئەدەبی تایبەتیی دروست کردووە کە بریتییـە لەو گۆرانیو سروودانەی کە لە زیکرو حاڵ گرتندا بە ئاوازەوە دەووترێن.

فۆلکـلۆری کوردی بە شێـوەیـەیێکی فراوان وێنـەی رەنگدانەوەی ژیانی میللەتە ، گەلێ سووچی گرتۆتەوە وەکو هیواو ئامانج و جۆری بیرکردنەوەو هەست کردن بە جوانکاریو راڵێ بوون لە هەموو شتێکی کە دەکەوێتە بەر چاوی . لەبەرهەمی داهێنـانی میللی دا بیرەوەریو رووداوی مێـژوویو خوو و رەووشت و نەریتی کۆمەلایەتیی کۆنی کوردەواری بە روونیو ئاشکرا خۆی دەنوێنێ.

لەمـاوەی سەدان ساڵ دا فۆلکـلۆری کوردی رەسەنایەتیی خۆی پاراستووە هەر وەها کەوتۆتە ژێر تەئیسری داهێنانی نەتەوەکانی تری رۆژهەلاتی ناوەراست، ئیتر لەسەر هەڵدانەوە تاقیکردنەوەی چاکی بووە بۆیە باش پەروەردە بووە، ئەگـەر تەئسـیری فۆلکلۆری نەتـەوە دراوسێکـان تا پلەیێکی دیـاریکـراو بە سەر فۆلکلۆری کوردیدا دیار بێ، تەئسیری فۆلکلۆری کوردی، بە تایبـەتی هونـەری گۆرانی گەلێ لە هی ئەوان زیاتر بووە. جەوهەری گۆرانیی کوردی لەناو گۆرانیی نەتەوە دراوسێکان دا دەبینرێ. بەم جۆرە م. ڤاگنەر (M. Wagner ) ئەوە پیشـان دەدا کە تورکـەکـان گەلێ گۆرانیی کوردیو یەزیـدیـان گۆریوەتە سەر زمانی خۆیان [٢٥]. ی. ئا. لالایـان (E.A. Lalayan )یش دەڵێ: ئاسـووریەکانی ناو شاخ

(مەبەسی تەیاریەکانە ـ م. خ.) گۆرانیی کوردی دەچڕن و حیکایەتی گوێی ئاگردانی کوردی دەگێڕنەوە[٢٦].

هۆی لە باوبوون و بڵاوبوونەوەی شیعری کوردی میللیی نەنووسراو بە شێوەیێکی فرئاوان ئەوەیە کە میللەت بەهۆی ئەوەوە هەموو هیواو ئاواتە گیانیو ئیستێتیکییەکانی دەبینێ.

لە بەرهەمی شیعری میللی نەتەوەی کورد تاقی کردنەوەو ئەدگارەکانی شیعری زمانی کوردی بە گشتی دەبینرێ. ئەو ئەدگارانە رەگیان داکوتاوە. کێشی شیعری خۆماڵی یەکێ بووە لە جەوهەرە هەرە گرنگەکانی ئەو شیعرە، هەر وەها ئەو کێشانە لە شیعری زمانەکانی هیندو ـ ئەوروپاییش دا بەکار دەهێنرێن[٢٧]. کێشی خۆماڵی زیاتر لەگەڵ شیعری میللی دەگونجێو گەلێ لە کێشی عەرووز نزیکترە بۆی. لەبەر ئەوەیە سنووری دیاریکراوی کێش و قافیە لە عەرووزداو تەنگەبەریو نەگونجانی لەگەڵ سەربەستیو ساکاریی بەرهەمی شیعری میللی لەیەکتریان جیا دەکاتەوە.

بێگومان هەندێ شاعیرو گۆرانیبێژی میللی بەشدارییێکی تەواویان کردووە لە دەوڵەمەند بوونی فۆلکلۆری کوردی، دیارە زۆربەی ئەم ناوانە وون بوون. ئەمە دەستووری فۆلکلۆری هەموو نەتەوەیێکە. لە سەرەتادا بابایێك گۆرانییەکە دادەنێو لەسەر زمان بڵاو دەبێتەوەو دەسکارییو مشتوماڵ دەکرێو ناوی خاوەنەکەی وون دەبێو دەبێتە موڵکی نەتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا مێژوو ناوی هەندێ شاعیری میللیی کوردی سەدەی پێشووی پاراستووە. لەمانە عەلیی بەردەشانی (دیالێکتی کرمانجیی خوارووی)، حەمە کۆر بادینانی، هەرەکۆل بۆتانی، زەرۆ هەکاری (دیالێکتی کرمانجیی سەروو)، وەلیی دێوانە (دیالێکتی گۆرانی).

شیعری میللی کوردی لەژیانی ڕۆژانەدا بەردەوامە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ میللەت دەوڵەمەندتری دەکا بە بەرهەمی هاوچەرخی تازە. ئەم گۆرانییانە تەنیا لە بابەت دڵدارییەوە نین، بەڵکو ناوەرۆکیان یەکجار ڕەنگاوڕەنگەو هەموو سووچێکی ژیانی گرتۆتەوە، وەکو خەباتی نەتەوایەتی کوردو نەتەوە بەش خوراوەکانیتر، لە بابەت ڕووداوی گەورەی سیاسیی ڕۆژانە لە گێتیدا. گۆرانیبێژی میللی لە کوردستان دا، پلەی کۆمەلایەتیی بەرزە، ڕێزی دەگیرێ، ناوبانگی گەورەیە. گۆرانی بێژی وەکو عەلی مەردان و رەسووڵ گەردیو تاهیر تۆفیق (کوردستانی عیراق)، حەسەن زیرەك (کوردستانی ئێران)، عەرتاری شەرۆ (کوردی ئەرمەنستانی سۆڤیەت) جێگەی تایبەتییان هەیە لەناو دڵی میللەت دا.

فۆلکلۆری کوردی سەرچاوەی بلیمەتیەتیو ژیریی میللەتە، لە کۆنەوە بە هانای ئەدەبی نووسراوی کلاسیکی کوردی گەیشتووە. گەلێ وێنەو تاقیکردنەوەو ناوەرۆك و ماناو بەسەرهاتی داوەتێ. شاعیری گەورەی کوردی سەدەی هەڤدەم ئەحمەدی خانی نویشکی ناوەرۆکی ئێپوسی (چیرۆکە شیعرییەکەی) «مەم و زین»ی لە چیرۆکی میللی کوردی «مەم و زین» یا «مەمی ئالان» وەرگرتووە ئەوەی تا ئێستاش بە

بەڵام ئەم دیاردەیە، واتە ئەم پەیوەندییە راستەو خۆ لەنێوان ئەدەبی میللیی نەنووسراو ئەدەبی کلاسیکیی نووسراودا وەنەبێ لەلای هەموو شاعیرە کلاسیکییەکانەوە لە ناوەوە بێ، بەتایبەتی ئەمە لەلای هەندێ شاعیرانی دیالێکتی کرمانجیی سەروو دیالێکتی گۆرانی دەبینرێ، بەڵام لەلای شاعیرانی دیالێکتی کرمانجیی خوارووی نابینرێ. ئەوەی ئاشکرایە بە گشتی ئەوەیە لە کۆنەوە تا ئێستاش ئەدەبی میللیو ئەدەبی نووسراو هەر یەکەیان ڕێگەی تایبەتیی خۆی گرتووە.

لە ئەدەبی کوردی تازەدا شۆڕشێکی گەورە بەرپابووە، بەوەی بووە بەئاوێنەی ژیانی میللەت و هیواو ئامانجی، ئەدەبی میللی دەورێکی گەورەو گشتیی هەیە لەم شۆڕشەدا. هەموو ئەدگارە تایبەتییەکانی فۆلکلۆر لە ڕووی ڕیالیزمیی ناوەرۆك، وێنەی ڕوون و دیار، ئاسانیی کێش و قافیە، ساکاریی ووشەو زمان، ڕستەی کورت و ڕوون و ئاشکرا، ناوەرۆکێکی کە پێوەندیی بە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکەوە هەبێ، ئەمە هەمووی لە ئەدەبی نووسراوی تازەدا ڕەنگی داوەتەوە.

هەولێر ـ ڕووناکی ١٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨

**پەراوێزەکان**

(١) لەناو ئەمانە لەپێش هەموویانا پێویستە ناوی ئەم کارانە ببرێ:

١- پ. لێرخ، لێکۆڵینەوە لەبابەت کوردی ئێران و باپیرەکانیان لە خالدیەکانی سەروو، سانت پیترسبورگ، کتێب ١، ١٨٥٧؛ کتێب ٢، ١٨٥٦؛ کتێب ٣، ١٨٥٨.

2– Jaba, A. Recueil de Notices et Recits Kourdes. Servant a la Connaissance de la langue, de la Litterature des tribus du Kourdistan. Spb., 1860

3– Prym, E, Socin, A. Kurdische Sammlungen, a. Texte, Abt. I – II Spb., 1887, 1890, b. Ubersetzung, Abt. I – II, Spb., 1887, 1890

4– Albert von le Coq, Kurdische Texte,Berli, 1903

*) لەناو کاری کوردەکان لەم بابەتەوە پێویستە ئەمانە بخرێنە ڕوو:

١- شێخ محەمەدی خال، پەندی پێشینان، بەغدا، ١٩٥٧.

٢- عەلائەدین سەجادی، ڕشتەی مرواری، بەغدا، بەرگ ١و٢، ١٩٥٧؛ بەرگ ٣، ١٩٥٨.

٣- سەرنجێك لەدەروازەی فۆلکلۆری کوردی، بەغدا، [١٩٦١].

٤- جیگەرخوێن، گۆتنا پێشینا، شام، ١٩٥٧ (بە تیپی لاتینی).

(3) O.Blau, Die Stamme des nordostichen Kurdistan, (Zeitschrift des Deutschen Morgenlandischen Gesell – scheft) 1858, Bd. 12. S.596

(٤) هەندێ تێکستی فۆلکلۆری کوردی گۆڕراوتە سەر زمانی ڕووسی و بڵاوکراوەتەوە، لەمانە:

١- چیروکی ئەفسانەیی کوردی، مسکۆ، ١٩٥٩.

٢- گۆرانیی داستانی کوردی، مۆسکۆ، ١٩٦٢.

٣- قسەی نەستەق و پەندی پێشینانی کوردی «لە کتێبی قسەی نەستەق و پەندی پێشینانی نەتەوەکانی ڕۆژهەلات»، مۆسکۆ، ١٩٦١، ل ٣٣٠ - ٣٣٩.

(٥) لە کوردەواریدا ئەم بابەتە هونەرە لە بێگانەش وەردەگیرێ، یاراستتر کلتەو گەپی گشتیی ڕۆژهەلاتی هەیە وەکو ئەوانەی لەسەر مەلای مەشهوور یا مەلای مەزبووره دەگێڕیتەوە، چیروکە کورتە کۆمیدیەکانی مەلای مەشهوور کە لەناو هەموو نەتەوەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەراست و قەفقاس و ئاسیای ناوەراست دا هەیە، دیارە لە ناو کوردیش دا بە زمانی کوردی باوە.

(٦) لە بابەت نموونەی قسەی نەستەق و پەندی پێشینان، بنوارە:

١- ئیسماعیل حەقی شاویس، پەندی پێشینان، بەغدا، ١٩٣٣.

٢- معروف جیاووك، هەزاربێژو بەند، بەغدا، ١٩٣٨.

٣- شێخ محەمەدی خال، پەندی پێشینان، ج ١، بەغدا، ١٩٥٧.

(٧) لە بابەت نموونەی لاووك و حەیرانەوە، بنوارە کۆمەڵە بڵاوکراوەکانی گۆرانیبێژی میللی ڕەسووڵ گەردی: بژاری لاووك و حەیران، بەغدا، ١٩٥٧؛ گوڵەمێلاقەی کوردستان، بەغدا، ١٩٦٠.

(٨) شێخ سەعید سەرۆکایەتی هەڵسانی کوردی کرد لە ساڵی ١٩٢٥، لەپاش دامرکاندنەوەی هەڵسانەکە دەسەلاتی تورکیا شێخ سەعید و هاوڕێکانی لە سێدارەدا.

(٩) ئەم گۆرانییە لە لایەن خاوەنی ئەم کتێبەوە لە شاری یەریڤان لە ساڵی ١٩٦١ لە زاری گۆرانیبێژی کوردو بە نەتەوە ئەرمەن کەرەمێتی خاچۆ وەرگیراوەو تۆمارکراوە.

(١٠) عوبەیدوڵلا ئەیووبیان ناوی زیاتر لە دوو سەد بەیتی کوردی گەورە ئەدا بەدەستەوە، بنوارە: (مجلە دانشکدە تبریز، ١٣٤٠، شمارە ٢، ص ١٦٧ - ١٧٤).

(١١) ڕەحیمی قازی، پێش مەرگە، بەغدا، ١٩٦١، ل ٥٣.

(١٢) محمد مکری، گورانی یاترانەهای کردی، تهران، ١٩٥١، ص ٣٤.

(١٣) سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٢.

(١٤) سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٣.

(١٥) سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٩.

(١٦) سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٢.

(١٧) سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٧.

(١٨) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٣.

(١٩) سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٧.

(٢٠) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٤.

(٢١) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٣.

(٢٢) سەرچاوەی پێشوو، ل ١٣٥.

(٢٣) گۆڤاری «الاصلاح الزراعی»، بەغدا، ١٩٦٢، ژمارە (٨)، ل ١٤٤.

(٢٤) ئەم گۆرانییە لەلایەن دانەری ئەم کتێبەوە لە هاوینی ساڵی ١٩٦٢ لەشاری لینینگراد لەزاری عەباس مەمەد نیزرۆڤ ی کوردی کۆماری تورکمانستانی سۆڤیەت وەرگیراوەو تۆمارکراوە.

(25) M. Wagner, Reise nach Persien und dem Lande der Kurden, Leipzig, 1852, Bd II, S. 255.

(٢٦) ی. ئا. لالایان، ئاسووریەکانی ویلایەتی وان، - «بڵاوکراوەی کۆمەڵەی جوگراف ڕووسی - لقی قەفقاس»، ١٩١٤، کتێبی ژمارە (٢٧)، بەشی ٤، ل ٣٨.

(٢٧) کێشی سیلاب تا ئێستا لە شیعری میللی کوردی بە هەموو دیالێکتەکانیەوە بەکار دەهێنرێ. هەر وەها شیعری نووسراوی کلاسیکی دیالێکتی گۆرانیی زمانی کوردیش تا ئێستا ئەم کێشەی پاراستووە، بنوارە: (مارف خەزنەدار، کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا، بەغدا، ١٩٦٢، ل ٣٠ - ٤٥).



# هەندێ وێنە لە فۆلکلۆرو کەلەپووری کوردی



ئامادەکردن و نووسینی

عوسمان محەممەد هەورامی

[ پێشەکی ]

بانگەوازەکەی لیژنەی فۆلکلۆر لە بەڕێوەبەرایەتیی ڕۆشنبیریی جەماوەر، لە هەولێر، کەسەر بە ئەمیندارێتیی گشتیی ڕۆشنبیریو لاوانی ناوچەی کوردستانەو، لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی عیراق - ی خۆشەویست، ژمارە ٥٨- ڕۆژی ٢٦- ١٠- ١٩٨٨- بڵاوکرابووەوە، گەلێ مایەی شادیو بەختەوەریی شەیدایان و تینووانی سەرچاوەی ڕەسەن و ڕوون و، بێگەردو ڕەوانی کوردی بوو...

ماوەیەکی زۆرە، وائێمەش وەکو گەلانی هوشیارو خاوەن ئەزموونی بەکەڵك، بازوومان لێ هەڵ کردووە، چاکی دڵسۆزیمان لێکردووە بەلاداو، بەدوای ڕەچەڵەك و نەژادو سەرچاوەی ڕاست و دروستی هەموو بابەت و لایەنە پیرۆزەکانی هونەرو ئەدەب و کەلەپوورو فۆلکلۆر، دیاردەکانی ژیانی نەمری کوردەواریمانا، وێڵ و سەرگەردانین، سوپاس بۆ یەزدان، کەمێك هەنگاوی پیرۆزو بەجێمان ناون؛ ئەمەش مایەی شانازیو بەختەوەریی هەموانە... خوا یار بێ، بە یاریدەی دڵسۆزانی مشوور خۆر، کاروان بەردەوامەو هەر بەردەوام ئەبێ...

منیش بۆ ئەم دەرفەتەو، بەگوێرەی قەوارەو شوێن لەسەر لاپەرەکانی گۆڤاری کاروان - ی بەردەوام و نازدار، هەروەها سەیی شارەزاییم، ئەم بابەتانەم بەسەرکردنەوە: [سیاچەمانەو گۆرانی‌و بەستەو پیشەی دەستی، لەناوچەی هەورامانا - جیوکی فۆلکلۆری کوردی]...

هیوادارم کەلێنێك بگرن و، سوپاس بۆ سەوداسەرانی جلوەی رەچەڵەك و نەژادی رەسەن...

## [ سیاچەمانەی هەورامان ]

بێ‌گومان هونەری رەسەن و، کەلەپوورو فۆلکلۆری نەژادو خاوەن مۆرکی تایبەت و باڵا، کار ئەکەنە سەر هەموو هەستێکی ناسك و، تەزووی کاریگەر بەهەموو دەمارەکانی هەست و بوونا گوزەر ئەکات و، چێژی قووڵ جێگازی بەتامی، لە قووڵاییی ناخا بەجێ ئەهێڵێ...

سیاچەمانەی تایبەت بە ناوچەی هەورامانیش هەمان کارو، بگرە زۆرتریشی کردۆتە سەر هەمووان و، ئیلهامی زوربەی زۆری هونەرمەندان و شاعیرانی هەژاندووەو، ئەی هەژێنێ... یەکێ لەوانەش شاعیری مەزن و بلیمەتی کورد - گۆران - ی نەمرە؛ ئەویش لە گۆشەی پڕ لە هونەری تایبەتی خۆیەوە تابلۆیەکی زۆر ناسك و بەرزی کێشاوەو، بانگی سیاچەمانەی کاریگەری هەناوی بەرزئەکاتەوە...

بەڵێ، گۆران - ی هونەرمەندو شاعیر، لەهاوینە گەشی هەورامان - ی سەردەمی خۆی‌داو، لە بەشی گۆرانی‌دا، بە شێوەیەکی زۆر بەرزو، ئاوازێکی دانسقەو بەهرەیەکی خوایی، ئەچریکێنێ‌و ئەفەرموێ:

عەشقی ئێوارەی سەرمڕێ کانی
بەر ئەداتە چەم کڵپەی گۆرانی

رۆژ ئاوا ئەبێ، چەم تاریك دایە
دەنگی کنا لەیل هەر دوایی نایە

مانگ بە تریفەی ناودێ ئەکا کەیل
هێشتا هەر گەرمە ناڵەی کنا لەیل

سیاچەمانە، ...... سیاچەمانە
بە هەشتی عەشقە ئەم هەورامانە

ئەومەندەی دارو بەردی هەورامان
رەحمەت لە ژنی بەژن و باڵاجوان،

سیاچەمانە، ....... سیاچەمانە
هەورامان جێگای سیاچەمانە...[1]

هەرکاتێکیش گۆرانی‌بێژی هەورامی، شاڵاوی ناخ و هەستی بەجۆشی کڵپەی لێ‌هەستێ‌و، کاری توندو تیژی خۆی بکات، پەنا ئەباتە بەر سیاچەمانەو بەم چەشنە باری دەروونی سووك ئەکات... سیاچەمان بە واتای چاوەرەشان، سیاچەمانەش هەر لەهەمان وشەوە هاتووە، لێرەشا بە واتای جۆرە ئاوازێکی تایبەت و گۆرانییەکی خاوەن مۆرکی تایبەت و جیاواز هاتووە، کە تایبەتە بە ناوچەی هەورامانەوە.

هەروەکو روون و دیارە، کە، هۆرە - هی ناوچەی جافەتی‌و لورە، حەیران - هی ناوچەی شێوەزاری موکرییە، لاوك - یش هینی ناوچەی شێوەزاری کرمانجیی ژووروەوە، قەتارو ئەڵڵا وەیسی - ش زۆرتر تایبەتە بە ناوچەی گەرمیانەوە، هەر بەهەمان رێبازو شێوە سیاچەمانەش تەنیا هەر لەناوچەی

هەورامـانـا باوەو، باوبووەو، زادەی هەمان ناوچەیە!.... هەر مەگەر تەنیا گۆرانیبێژو خەڵکی ناوچەکە بتوانن بیچریکێنن.... لێرەشا ئەبێ‌و، ئەشێ ئەوە بڵێین کە لە هونەری سیاچەمانەدا، بەندو بەیت و داستان و سەرگوزەشتەی بەزنجیرەو نەپچراوی بەدوای یەکا، نەوتراون و نین، بە پێچەوانەی لاوك و حەیرانەوە، کە گەلێ بەندو بەیتی تایبەتی کوردەواری هەن و، لەتوێی ئەم دوو ئاوازە رەسەن و بالایەدا، تۆمارکراون.... ئەم بابەتە، واتە سیـاچـەمـانـە، زۆرتر لەکاتی سەختەتیدا، داد لە چەرخی گەردوون و، زۆرداری ستەمکارو، رژێمی ناهەموارو، کسپەی ئاوارەیی‌و غوربەتا وتراوەو ئەوترێ... هەروەها لەچرکەی جۆش هێنانی تینی نازداری گیانیدا، دوورکەوتنەوەو، دابران لە لەیل و، کڵپەی بەرزی ئەشقی راستی، بەهەموو هەستێکەوە پەنا براوەو ئەبرێتـە بەر سۆزی سیاچەمانەو لە بارەگای ئەوینی راستا، چریکەی پڕ لەدادو فەریاد، دراوە بە تەختی بارەگای گەردووناو... سەرەنجام بە هاوارو ناڵەی کنا لەیل، واتەـ کچێ لەیل ـ دڵان ئارام ئەگرن...

سەرەتای سەرهەڵدان و، خاوەنی ئەم جۆرە ئاوازو بابەتە دیارنین! ئەوەندە هەیە کە ئەمیش بەشێکە لە فۆلکلۆرە چاخ و دەوڵەمـەنـدەکـەمـان، هەروەکـو لاوك و حەیـران و هۆرەو مەقـامـەکان، زادەی هەناوی کوردەوارییەو، وەکو سامانێکی هونـەری رەسـەن پارێزراوەو، پشتاوپشت بۆمان ماوەتەوە... ئەمیش هەر وەکو مەقامەکانی تر، چەشن و ئاوازی زۆری هەیە، لەمانەش:

[دەرەیی ـ بەواتای ئاوازی ناو چەم و دۆڵ، پەسەك، مینا داد، ولە هەنار ـ گوڵە هەنار ـ گیان، خاڵ سیاو لەیل ـ لەیلی خاڵ رەش، ئایشێ رۆ(٢)]

هەمـوو گۆرانی بێژێکی فۆلکلۆری کوردیش ناتوانێ لە هونـەری سیـاچەمانە چریکاندن دا، بە شێوەیەکی راست و دروست سەرکـەوێ، چونکـە دەستـوورو شێـوازو رێبـازو پەیرەویی تایبەتی خۆی هەن، جائەگەر کەسێ تواناو سەلیقەی تەواوی نەبن، هەناسەیەکی ساف و قووڵ و بەهێز، هۆنراوەی کاریگـەرو بەچێـژ، گەروویـەکی پڕ لە ناڵەو لەرەی کارامـە، سۆزێکی دڵ گیر!... بەڵێ، ئەگـەر ئەم مەرجـانـەی تیا نەبن، ناتـوانێ خۆی لە قەرەی سیـاچـەمـانـە بدات... کاتێکیش سیاچەمانە چریکێن دەستی ئەخاتە بن گوێیءو، تەڵی گەرووی ئەلەرێتـەوە، دەنگدانەوە بەدی دێت، هارمۆنییەکی درێژەدارو پەیوەست و گونجاو سەرهەڵ ئەداو، گۆرانیبێژ زۆرتر مەست و سەوداسەری ئاوازو سەداو، سەودای رەسـەن ئەبێ... خۆ ئەگـەر بێت و بەدەم گەشتی لوتکـەو چیاو کوێستانە رەنگینە سەرکەشەکانەوە، سۆزی کڵپە بسێنێ، ئەوا جوانترین وێنەی هونـەری بەرزو بەچێژ دێتە کایەوە.... بە تایبەتی لە گەشتی لوتکەو لاپاڵ و نشێوو هەورازەکان دا، ئەوەندەی تر سیمفۆنیەو هارمۆنی سروشت سەر هەڵ ئەدەن و، گۆرانیبێژیش زیاتر بۆی هەڵ ئەستێ... دەربـارەی چریکاندنی سیاچەمانەش، ئەگەر دوو کەس سیـاچـەمـانـە بڵێن، وادەرئەکـەوێ مانـدوو ئەبن و، هەنـاسـەشیـان زۆر باشترو بەهێزتر ئەبێ‌و، باشترو جوانتر ئەچـریکێنن، چونکـە کە یەکـەمیـان نیـوەی یەکـەمی دێـڕە هۆنـراوەیـەك ئەڵێ، دەم ودەست ئەویتـر بۆی ئەسێنێتەوەو، نیـوەی دووەمی لەگـەڵا پەیـوەست ئەکـات!.... خۆ ئەگـەر سێکەسیش بن، ئەوا باشترو زۆرتر بەردەوام ئەبن...

شایـانی سەرنجـە، کە سیـاچـەمانە چریکێن دەستی پێکرد، وەستانی بۆنییە، واتە بەردەوام و پەیوەست، هەروەکو بین بخواتەوە، پشوو نادات! بە پێچەوانەی لاوك و حەیران و قەتارو ئەڵلاوەیسی.... تا ئێستاش هونەرمەندە مۆسیقازەنەکان و ئاوازدانەرە لێهاتووەکانمان نەیان توانیوە لەگەڵ سیاچەمانە چریکێن دا یەك کەون و، رایبێنن کە پەیرەویی مۆسیقا بکات، بەهیـواین هونـەرمەندانی بواری ئاوازو مۆسیقا لەم بارەیەوە هەنگاوی نوێ‌و سەرکەوتوومان بۆ بنێن...

لەبەرئەوەی تا ئێستا کەمتر لایەك لە هونەری چریکاندنی سیـاچـەمـانە، کراوەتەوەو، کەمتریش بەسەرکراوەتەوە، کەڵە گۆرانیبێژە کۆنەکانیش فەرامۆش کراون و، ناویان لەسەرزار نەماوە....

لەسەرێکی کەشەوە، لەبەرئەوەی ناوچەی هەورامانیش زۆر سەخت و بەرین و لەیەك دابراوە، نەتوانراوە ناوی هەموو گۆرانیبێژە ناودارەکان تۆمار بکرێ... لەگەڵ ئەوەشا دەماودەم

ئەیگێرنەوە کە- یوسو یاسکە- هونەرو گۆرانیبێژی تایبەتی خان ئەحمەد خانی ئەردەلانی، [١٠٠٢ - ١٠٤٦ی کۆچ[٣] ] بەناوبانگترین گۆرانیبێژی سەردەمی خۆیبووەو، لە سیاچەمانە چریکاندن دا، بەتواناترین کەس بووە..

ئەوەندەی منیش ئاگاداربم و لەم و لەوم پرسیوە، لە گۆرانیبێژە ناودارە کۆنەکانی ئەم دواییە، کە ئێستا نەماون و، لەم بابەتەدا زۆر وەستابوون، ئەحمەدی نازداریّ لەبیارە، خاڵە حەمەرووش لەگوندی گوڵپ، حەمە کەریمی لاڵە لە تەوێڵە، حەمە ساڵحی فەرەج لە تەوێڵە، حەیدەری نۆدشی، کە بە هێدەر لە بەناوبانگ بووە....

لەوانەیش کەماون و پەکیان کەوتووە، ئەلیلەی ئەوسوودی، یۆسۆ جانەی دزاوەری، حاجی عەزیزی تەوێڵەیی.... ئێستاش باشترین و ناودارترین گۆرانی بێژی بواری سیا چەمانە ، ئەم دوو هونەرمەندەن : ئوسمان کەیمنەیی و حەمەحسێن کەیمنەیی ...

ئەو هۆنراوانەش کە بۆ سیاچەمانە ئەشێن ، ئەتوانین بڵێین ، کە تێکرا لەو بابەتانەن کە وێنەی ورووژاندنی هەناو و جۆشی دەروونی پڕ کڵپە ئەنوێنن... ئەم هۆنراوانەش هەموویان لەسەر کێشی پەنجە دارێژراون، کە کێشێکی خۆماڵیو نەژادی کوردەوارییە...زوربەی هۆنراوەکانیش فۆلکلۆرن... خۆ ئەگەر سیاچەمانە بێژ هەندیّ دێڕی بەرزو گونجاوی هەندیّ شاعیرانی لەبەربن، لەتوێی سیاچەمانەی بەتینا ئەیان چریکێنیّ... بەم چەشنە گەلیّ هۆنراوەی شاعیران تێکەڵ بە فۆلکلۆر بوون، هەندیّ جار جیاکردنەوەیان ئاسانەو، زۆرجاریش ئەم کارە زۆر سەخڵەت و دژوارە...

## [ بەستەو گۆرانی ]

هەورامانیش، وەکو ناوچە بەهەشتەکانی تری کوردستانی رازاوەو رەنگین، مەڵبەندی ئەشق و ئیلهامی خاوێن و بێگەردە... دیمەنی جوان و، وێنەی هەمە جۆری ژیانی دانیشتووانی، فریشتەی بەهەشتی بەرینی، هەڵکەوتنی سروشتی نازدارو شیرینی، ئەمانە هەموو هەوێنی ئەوینی دڵداری شەیداو خاوێنن... گۆرانی بێژی میلی بۆ خۆی لەخۆیا



شاعیرەو، سەرەرای ئەمەش بەهرەی دەنگ خۆشییەکەی ئەوەندەی تر کڵپەی لیّهەڵ ئەسێنیّ...

لەسەردەمانی پێشووترا، ژیانی ناوچەکە زۆر سادەو کەم ئەرك بووە... پارە لەناوانەبووەو، کەس ئەوەندە مەراقی دارایی‌و سامانی دنیای نەبووە... هاوینان لەسای دارگوێزو توو، هەنارو هەرمیّو، مێوو سێوو، هەڵووژەو بەهیّدا، لەپاڵ تاڤگەی سازگارو شیرینا، لەناوباخی فراوان و بەرین و چاو ئەنداز رەنگینا، ژیانێکی پڕ لە کامەرانییان بەسەر بردووەو، لە ئاژەڵیش باشترین کەڵکیان وەرگرتووە...

بۆ وەرزی پاییزیش بەرهەمی باخیان کۆکردۆتەوە، کووپەی گەورەو کەنووی فراوانیان پڕکردوون لەگوێز، توو، مێوژ، لەتکە هەرمێو لەتکە بەهێ، دەنکە هەناری وشك کراو بۆ مزروکەی مزرو بەتام وچێژ، وە بەدەیان بەرهەمی تری باخانیان هەڵ گرتووە بۆ وەرزی زستانی سەخت و دوورو درێژی پڕ لە شەختەو سەرما..

هەموو پاییزانێکیش، ڕەوە ڕەوەو پۆل پۆل، کاروانی گەرمیان بەرەو ناوچەکە کشاون بۆ گۆڕینەوەی هەمەچەشن دانەوێڵەو، خوێو نەوت، دۆینە، هتد... بە بەرهەمی باخەکانی ناوچەکە.. بەم چەشنە هەموو خێزانێك، بە تەواوی ڕۆزیو پێداویستی ساڵانەی تەواوی خۆی پاشەکەوت کردووە، بێ خەم پاڵیان لێداوەتەوە....

کوردواتەنیش، کاسەی پڕ ئاشتیی ماڵە، بەم چەشنە، نەك هەر کاسە، هەموو ماڵیش پڕبووە، نەك بەشی ڕۆژو دووڕۆژ، بەڵکو بۆ ساڵێکی تەواو... لەبەر ئەوە هەمووان بێخەم و شادو ئاسوودەو کامەران بوون، ژیانیان دابین و مسۆگەر بووە، هیچ ئیشیان نەبووە!... شەونشینی بەتام و چێژی زستان و، سەیران و گەشتی کوێستانە نەخشینەکان بوونەتە خولیای دڵەی فراوان و بەختەوەریان... ئیتر هەربۆنەو سەبارەتێکی شادو بەختەوەریان بۆ هەڵ کەوتبێ، لە دەست خۆیان نەداوە، ژن و پیاو، کورو کچ، مناڵ و مەزن، هەموویان هاوبەشییان کردووە... لەڕۆژانی بەهاری شادیدا، ڕوویان کردۆتە لوتکەو دۆڵی کوێستانە سەرکەشەکان و، لە سەیرانگاو پانتاییو بەهەشتی بەچێژا، گۆرانیبێژی بەهرەمەندو سەرگەرم، بەچەشنی بەفراوی لاپاڵ و سەرچاوەی سازگارو، شنەی ژین بەخشی ناوچەکە، کانگای ئاوازو هۆنراوەی تەقیوە، نەك یەك ودوو، چەندان گۆرانیبێژی شەیدا، کۆڕی هەڵپەرکێی هەمە چەشنیان گەرم کردووە، هەموو ڕۆژێ تادرەنگ کاتێ بەهەشت ئاسا ژینیان بەسەربردووە...

لەو بەستانەی کەلەکاتی، هەڵپەرکێو چەپڵە ـ ڕێزانا هەڵ قوڵاون، ئەوەندەی کەبەردەستم کەوتوون تۆماریان ئەکەم، شیاوی وتنە، کەهەر بەستەیەك بەناوی سەرەتای گۆرانییەکەوە، واتە وشەکانی سەرەتای بەستەکەوە ناونراوە... لەو بەستانەش: «بیمارم گیان بیمارم، شیرینەو خانم، ئەرێ هۆناز، ئامان لەرزانە، بۆ تۆرت کرد بۆ تۆرای....... ناوی ئەم بەستانەم لە باوکم محمد صالح فرج ـ ١٩٠٠ ـ ١٩٨٤ ـ وەرگرتوون....» هەموو بەستەکانیشی بەدەنگی خۆی لەبەهاری ١٩٧٦دا، بۆ تۆمارکردووم و تا ئێستاش کاسێتەکەم ماوە... لەئەیلوولی ـ ١٩٨١دا، دامەلای هونەرمەندی بەهرەمەند مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی، بۆ ئەوەی لەسەری بگرێتەوەو کەڵکی لێوەرگیرێ.....

هەروەها ئەم بەستانەش لەکاتی زەماوەندو هەڵپەڕین و چەپڵە ڕێزانا ئەوترێن: «هەورە هەورە، خرنگە خرنگە، ئای لە شەدەلار، کەنیلە کاڵەکەم، ئای بەناز بەناز:....»

دوای شەکەت بوون و ماندووبوونی پڕ تام وچێژی ئەو کوێستانە خۆشانە، وردە وردە لەسەرخۆ، بەرەو ئاوایی بەرێبوون؛ جا بۆ ئەوەی بێتاقەت نەبن و جۆش و خرۆشی ئەوینی یەزدانی بەردەوام بێ، بەدەم ڕێگاوە، چەندان بەستەی نەرم و ئارامیان وتوون، لەهەندێ هەڵوێستیشا دەستیان گرتووەتەوەو، بەهەڵپەرکێی دیلانێ دڵیان ئاوی خواردۆتەوە... لەم جۆرە بەستانەش:

«ئای شلێ شەمامەت خەت خەتە، کەواخامەك خاوەر خاوەر، هەوری لەمل، باوانم باوانم، ئەرێ هۆ ڕەعناخان، چاوەکەی چاوم، هەیخانمەی ڕێبوار، چاوڕەشە کاڵێ، لێم یاخی، زەنگیانە..... ئەمانەشم هەر لەباوکم وەرگرتوون....»...

لەکاتی سوارکردن و گواستنەوەی بووکیشا، بەستەیەکی زۆر نەرم و ناسك و هێمن وتراوە، کە ناوی [بادەبادە]یە، ئەمیش بە دەنگی باوکم تۆمارکراوەو لامە...

شایانی یادخستنەوەیە، کە لەگۆڤاری بەیان ـ ی ئازیزدا، ژمارە ـ ١٠٧ ـ مایسی ١٩٨٥، لەژێر سەرباسی ـ چۆپیی هەواران ـ دا، هۆنراوەیەکم بڵاوکراوەتەوە، تارادەیەکی زۆر وێنەی سەیران و چۆپیی ئەو کوێستانانە دەرئەبرێ.....

ئێستاش نۆرەی تۆمارکردنی هەندێ هۆنراوەیە، کەلەسیا ـ چەمانەو بەستەو گۆرانیدا ئەچرێکێنرێن:

**یا بە قەومت بم، یا بە خوێشت بم**
**یا بە قەتارچی دارمکێشت بم،**

**بەفدای دەمت بم، بەددانەوە**
**ماچی سوورەتەن بە دووکانەوە**

مـچی: ئەڵێن.....

**هەر چەند هەوڵم دا دنیام ئۆکۆ بەرد**
**غەیر جە خەجاڵەت چێشم زیادکەرد!!**

ئۆکۆ بەرد: بۆ کوێ برد، بەچیگەیاند...

**شەوان خاستەرەن بەش بەینە خاوم**
**بەرۆ مەوینووت، دیدەی لێلاوم**

واتە: شەوان باشترە، بەڵکو بێیتە خەوم، چونکە کوێراییم دایە، بەرۆژ نات بینم...

**عەشرەت هەی هاوار ئاخر زەمانە**
**مەلّلا ماچش سەند سەر قەڵەمانە**

**خانەگمانەکان هەڵیان کێشین دار**
**فەلاقەیان کەین بەتووڵی هەنار**

**هەر بێوەژنێ شاڵ کرمانی بێ**
**هەزار گەورە کچ بە قوربانی بێ**

**هەناسێ لەمن، یەکێ لە شەماڵ**
**سەبەب کارما بۆ بەکۆی زوخاڵ**

بۆ: ببێ...

**بەفدای زوڵفەکەی دەستە دەستەت بم**
**بەفدای کوڵی سوور کەس نەگەستەت بم**

**بەیدێ باکەرمێ جاهێڵی وێما**
**دنیای تاوسەر نەمەدا پێما**

واتـە: وەرن باهـەرزەکاریی خۆمان بکەین، چونکە تاسەر ئەم دنیایەمان نادەنێ...

**دەنگم نەمەندەن، هەرهەناسەما**
**پەی دووریی بالآت خەیلێ تاسەما**

پەی: بۆ...

**شووت نەکرد وەمن، کاکۆڵم قیتە**
**شووت کرد بەکابرا، کۆنە دەویتە،**

**چاوت چوون گەوهەر شەوچرا گرۆ**
**ئەبرۆت چوون نەشتەر جەرگۆ من برۆ**

چوون: وەکو... گرۆ: ئەگرێ... برۆ: ئەبرێ...

**هەرساتێ کریوەم تاسەی گۆرانی**
**نەچۆڵم پەی هەن، نەئاوەدانی**

کریوەم: بمکرێ... پەی هەن: بۆ هەیە...

«ئەم هۆنراوانەشم لەکاسێتەکەی باوکم وەرگرتوون...»

ناڵەونـرکـەی دەهۆڵ و زورناش خولی گەورەو تایبەتیی خۆیـان گێراوەو ئەیگـێڕن؛ هەر کە پیقەی زورنا هات و زرمە لەدەهـۆڵ هەسـتـا، لوتکەو دۆڵ دەنگ ئەدەنەوە، دارو دەوەن ئەشـەکێنـەوە، دڵانی شەیـدایان ئەوەندەی تر ئەگەشێنەوە، دەمـارە سستەکان ئەبزوێننەوە... زورنا ژەن و دەهۆڵ لێدەر، لەکـاتی مانـدووبـوونی گۆرانیبێـژانـا فریاکەوتوون و، وەکو پێـویست ئاوازی هەڵپەرکێیان ژەندووەو گەرمتر کۆریان گەرم کردووە.... تائێستـاش ناڵەی سەحـەریی زورنا ژەنی دێرین «حەمە قولتەی کەیمنەیی» لەدۆڵ و کێوە سەرکەشەکەنا دەنگ ئەداتـەوە... شمشاڵیش خولی باڵای خۆی لەهەموو کۆڕەکانا دیوەو هەمیشە بەچێژە...

**[ پیشەی دەستی لە ناوچەی هەورامانا ]**

هەر بە وێنـەی ناوچـە شاخـاوییـە سەختەکانی تری کوردستانی سەرکەش و بەرین، لە دێرین رۆژگارەوە، بەپێی پێـداویستیی ژیـان، گەلێ پیشـەی دەستی لەم ناوچەیە شا سەریـان هەڵداوە، پشتـاو پشت کەڵکیان لێوەرگیراوە... لەو پیشـانـەی کە تا ئێستـاش درێـژەدارن و، زۆرتـر مۆرکی ناوچەکەیان پێوەیەو پەسەندو باشن: کڵاش کردن، ئاسنگەری، جۆلآیی:... خانـوو دروست کردن:... گەلێ پیشـەی تریش باون، وەکـو دارتـاشی، بەرگ دوورین، چنین، دروست کردنی فەرەجی کوڵە باڵ....

لەم بوارەداو، لەبەر کەمیی دەرفەت، تەنیا یەك پیشەی تایبەت بەم ناوچەیە بەسەر ئەکەینەوە، ئەویش ـ کڵاش کردن ـ ە...

## [ کڵاش کردن ]

وەکـو وتـراوە، پێـویستی دایکی داهێنانە... جا لەبەر ئەوەی ناوچـە شاخـاوییـەکـان بە سروشت زۆر سەختن و، پێـداویستی ژیـانیش زۆرە، هەر لەمێـژەو ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر تێکۆشاون بۆ ڕاپەڕینی پێویستیی ڕۆژانەیان...

که دانیشتـوانی هەورامـانیش سەیریان کردووە پێڵاو بەرگـەی بەردی سەخت و درو، ئەرکی گرانی ئەم ناوچـەیـە ناگـرێ، بیریـان کردۆتەوە کە جۆرە پێ بۆشێك دابێنن زۆرتر کەڵکی لێ وەرگـرن... بەم چەشنەو دوای چەندان ئەزموون و تاقیکـردنەوە، کڵاشی پەڕۆ داهێنراوە... ئەم کڵاشەش بۆ پێ گەلێ فراوانـەو لەش ئاسـوودە ئەبێ، چونکـە زۆر فێنـك و سووکەڵەو تەندروستەو، لەگەڵ چەمانە ـ وەی پەنجەو سینەی پێدا، هەڵ ئەسوورێ، لەبەر ئەوەی سفت و سادەیەو، پاژنەی نییـە لە هەڵدێرو سەرەو ژوورو سەرەو لێژا لە هیچ ناگیرێو، مرۆڤ فرکەی بۆ ئەکات...

باشتـرین و بەنـاوبـانگترین وەستا کڵاشی پەڕۆی ئەم ناوچەیە، وەستا [ئەبوو بەکر عەلی ـ ١٩٠٨ ـ ١٩٨٦] بوو، لە گفتوگۆیەکی نێروتەسەل و چڕا، کە لە شەوی ٨/٣/١٩٨١ ـ دا، لەگـەڵیا تۆمارم کردووە، بە درێژی دەربارەی شارەزاییو بەرەو پێش بردن و بەسەرهاتی ئەم پیشەیە، دوا... منیش لێرەدا کورتەیەکی تۆمار ئەکەم... وەستا ئەبوو بەکر وتی:

وەکـو لە باوو باپـیرەمـانـەوە بیستـوومـانەو، ئەوانیش لەپێشنیـانی خۆیانەوە بیستوویانە، لە دێرین ڕۆژگارەوە، لەم ناوچـەیـەدا کڵاش هەرهـەبووەو دروست کراوە.... من لەبەر دەستی باوکمـا فێری ئەم پیشـەیـە بووم... بەر لەمن دەق و دوختی کڵاش زۆرقـەبەو ئەستووربوو، بەڵام دوای کۆشش و هەوڵدانی زۆرو، هاندانی بەڕێز خوا لێخۆش بوو شێخ حسام الدینی تەوێڵە، توانیم وردە وردە شێوەی کڵاش جوانتر بکەم... تا ئەمـڕۆ بەم شێـوە جوانـە لەبەر دەستی هاوڵاتیانایەو، بە «کـڵاشی بەکری» ناوی دەرکردووە... پێش ئەوەی من ببم بە وەستایەکی باش، پاژنەو لووتی کڵاش، کە جەمسەری تیرەی سیرمـەکـەی ناو کڵاشـەکە ئەبەستنەوە، لە سیرمەی چەرمی گادروست ئەکرا، کەزۆر ناقوڵاو دزێو بوو، سەرەڕای ئەمەش زوو هەڵ ئەوەشایەوە، پاشان واهات بە بیرما، کە کێرکەڵەگای پیرۆك لەبەر هەتاو، وشك بکەمەوە، دوای خووسانەوەی لەئاودا، بەقـاڵبی تایبـەتیی خۆی بیبـڕمـەوەو، بەم جۆرەی ئێستـا لەبەرچاوتانە، بەکاربهێنرێو کڵاشەکەش جوانتر بنوێنێ...

دەربارەی ئەو سەرە کڵاشە چنراوەی دائەکوترێو پێی ئەڵێن پەرگ، یاقـەڵتاخ، وتی: من لەسەر دەمی لاویما، لەسەر داخوازی بەڕێز شێخ حسام الدینی تەوێڵە، دەجووت کڵاشم بۆ دروست کرد، لەسەر ڕاسپاردەی ئەو پەرگەماکەیان ـ شێرازەی دامـەزراندنی چنینی کڵاش ـ لە دەزوو بوو... بەڕاستی پێم سەیـر بوو، چونکـە ئێمە هەر بەنی موومان بەکار ئەهێنا.... حەمـەی گوڵە هەبـوو لە سلێمانی، دووکانی کڵاش فرۆشتنی هەبـوو، پاییـزێ کە کڵاش لائەبات بۆ ئەوەی پێڵاوی زستانە دانێ، بەرێکـەوت جووتێ لە کڵاشـە دەست کردەکـانی من ئەکەونە پشت دۆڵابی دووکان؛ کە بەهارێ دووکان ئامادەئەکات بۆ بابەتی کڵاش و، سەیرئەکا جووتێ کڵاش کەوتوون، هەڵیان ئەگـرێتـەوەو دەستیـان پیـادێنێ، سەیر ئەکا سەرەکەیان لە بنـەکـەیـان جیـا ئەبێتـەوە، تمـەزە پەرگـەمـاموومکە مۆرانە خواردوویەتیو دارزاوە جا ئەوسا بۆم دەرکەوت کە ئە بەرچی پەنجـا ساڵێ لەوەو پێش شێخ حسام الدین داوای لێکردم کە پەرگەمای کڵاشەکانی لە دەزوو بێ!!! تمەزە دەزوو مۆرانە نای خوات....

حەمەی گوڵێ، کە ئەبینێ سەرە کڵاشەکان زۆر جوان و نایابن، ئەیان دا بە پێڵاو دروویەك و، داوای لێئەکات بە شێوەی سەرە پێڵاو بۆی داکوتێ... بەم جۆرەو لەڕێی ڕێکەوتەوە ئەم پیاوە ئەم سەرە کڵاشەی داهێناو، لەسەرەتاوە چەندان قاڵبی مقەباو کارتۆنی ئەهێنان بۆ تەوێڵەو ئەیدان بە کڵاش چنەکان بۆی بچنن... وا ئێستـاش ماڵ نییـە بە چنینی کڵاشی پەڕۆو سەرەکڵاشەوە خەریك نەبن...

پاشان تۆماری یادی کردەوەو، وتی: بەر لە پەنجا ساڵ،

لەم تەوێڵەیەدا دوو سەد وەستا کڵاش هەبوون، کە هەریەکەیان شاگردی تەواوی خۆی هەبوون،... کە وەرزی بەهار سەری هەڵ ئەدا، دەستە دەستە، ئەم وەستایانە روویان ئەکردە ناوچەکانی دەوروبەر، بۆ کڵاش کردن، بەم جۆرە تا دەمەو پاییز ئەوێ ئەمانەوە؛ دوایی بە گیرفانی پڕو ئازووخەی زستانەوە ئەگەڕانەوە...

## [ چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی ]

خۆشترین شەوچەرەی کوردەواری، بۆ بەسەربردنی شەوانی پاییزی کپ و مەنگ و خەمگین و، زستانی یەخبەندو شەختە؛ بۆ بەسەربردنی کاتی بێکاریو حەسانەوە، گێڕانەوەی چیرۆکی فۆلکلۆری بووە... کۆڕی شەیدایانی گوێگرو، گوێڕایەڵان، بەشەوق و ئارەزوویەکی گەرمەوە، کپ و ئارام و بێدەنگ و بەئاگا، وشە بە وشە لەگەڵ بەسەرهاتی پڕ لەدرامای چیرۆکەکەدا هەڵسن و کەوتیان کردووە...

ناوەرۆکی چیرۆکەکان هەموو لایەنەکانی ژیانی سەردەمی خۆیان بەسەر کردۆتەوەو، گەلێ فەلسەفەی دروستی بەرەو ژیانی کامەرانی رەچاوکردووە... گەلێ ئامۆژگاریی نەخشی بەرد ئاسای لەهەست و ناخ و مێشکی هەموانا چەسپاندووەو، بوونەتە فەرهەنگی ژیانی پاشەرۆژ...

لەتۆماری یادی دێرینەی کوردەواریمانا، گەلێ چیرۆکی پڕ جەوهەری بێ وێنەمان بۆ ماونەتەوە، هەر کامێکیان بگرین، چەندان مەبەستی جوان و باڵای گرتۆتە توێی خۆی....

لەم دەرفەت و بوارە کەمەشا، بە شێوەیەکی کورت ئەم چیرۆکە پێشکەش ئەکەم...

## [ بە چاودا دانەوەی چاکە ]

ئەگێڕنەوە، کە لەسەردەمی زۆر کۆنا، پیاوێك بە فەرمانی پاشای سەردەم ئەخرێتە زیندانی تەنگ و تارەوە... یەکێ لە هاوڕێ زۆر دڵسۆزەکانی نەخشەی دەربازبوونی بۆ ئەکێشێ... پاش لێدانی خەندەقێکی دوورو درێژ، ئەگاتە سەر زیندانەکە... پەلی هاوڕێکەی ئەگرێو، لە تاریکایی شەوەزەنگا بۆی دەرئەچن... هەر لە قۆناغی یەکەما، هاوڕێی دڵسۆز لەسەر یەك و چەندان جارێ ئەیداتەوە بەگوێی رزگارکراوا: هاوڕێ ئەبێ وەکو من بێ!! هاوڕێ ئەوەیە لەتەنگانەدا فریاکەوێ!! چاوت لێیە چۆن فریات کەوتم!! بەخوا کارێکم کردووە مەگەر لەدەست رۆستەمی زاڵ هاتبێ!!!...

هەرچەندە ئەمیش زۆر سوپاسی ئەکات و گەلێ ستایشی ئەکا، بەڵام تا ئەهات ئەو زیاتر بە خۆیا هەڵ ئەداو، چەندان جار کردە وەبێ وێنەکەی، چاکەی بێ نموونەی ئەدایەوە بە دیدەی هاوڕێکەیا!!...

هاوڕێی رزگارکراو، لەدڵی خۆیدا وتی: ئەگەر کار بەم جۆرە بڕوا، تا لە ژیانام ئەبێ هەمیشەو هەردەم و لەهەموو شوێنێکا چاو لەبەری ئەم کابرایە بم و، لەژێر باری گران و نالەباری منەتی دژواری ئەگریس دا بناڵێنم!!... نەخێر، هەر هەناسەیەکم مەرگێکە!!... بەخوا وا باشترە بگەڕێمەوە بۆ زنیدانەکەی خۆم، مردن یەك جارەو ئەبڕێتەوە!!..

بەبیانووی دەست بە ئاو گەیاندنەوە، لارێ ئەگرێو، هەتا تینی تیا ئەبێ بەرەو دواوە، ڕوو بە زیندان ئەکەوێتە ڕێ... کە ئەگاتە نزیك زیندان، سەیر ئەکا بگرەو بەردەیەو، پاسەوانەکان هەموویان شپرزەو سەر لێشێواون و، هەیدادو فەریادیانە!! بێترس و لەرز سنگ ئەنێ بۆ پێشەوەو خۆی ئاشکرا ئەکات... لەسەرخۆو ئارام بەرەو زیندانی خۆی ئەکشێو لەکونجێکا بۆ خۆی هەڵ ئەتروشکێ... کاتێ پاشاش بەم بەسەرهاتە ئەزانێ، دەماری مەردایەتیی ئەبزوێو لە زیندانیەکە ئەبووڕێو ئازادی ئەکا....

«ئەم چیرۆکەم لە خوا لێخۆش بوو ـ عبدالله احمد اسحق ـ ی تەوێڵەیی ـ ١٩٠٠ ـ ١٩٨٢ ـ وەرگرت».

پەراوێز :ـ

١ـ بڕوانە، محمدی مەلا کەریم، سەرجەمی بەرهەمی گۆرانا ل ١٢٤...
٢ـ بڕوانە، محمد بهاءالدين صاحب، پیشالیاری زەردەشتی، ل ٩٦...
٣ـ بڕوانە، محمد رسول هاوار، پیرەمێردی نەمر،ل ١٣٣...

# بنیاتەکانی چیرۆکی گیانداران لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا

کەریم مستەفا شارەزا

پێشەکی: کۆمەڵگای کوردەواری خاوەنی کەلەپوورێکی نەتەوایەتیی یەکجار بەپیت و دەوڵەمەندە، گەنجینەیەکی گرانبەهای لە ئەدەبی فۆلکلۆریی کوردیدا پێکەوەناوە، چیرۆکی فەولکلۆریی بە هەموو جۆرەکانییەوە، جێگەیێکی دیاری لە ناو ئەو گەنجینەدا هەیەو، شیاوی ئەوەیە بە وردی لێیبکۆڵرێتەوەو نرخی ڕەوای خۆی پێبدرێ.

مەیدانی چیرۆکی فۆلکلۆری گەلێک فراوانە، چونکە هەموو ئەو چیرۆکە میللییانە دەگرێتەخۆ، کە پەیوەندییی ڕاستەوخۆیان بە هێزی سروشت یان فەرماندەو قارەمانەوە هەبێ، یان داستان یاخود ئەفسانەو چیرۆکی گیانداران بن، یان چیرۆکی لوغزو مەتەڵ بگرنەخۆ. لێکۆڵینەوەش لەم هەموو جۆرو لق و پۆپەی ئەو چیرۆکانەش پێویستی بە شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەیەکی وردو قووڵی میثۆلۆژیو کۆمەڵایەتی ئەو میللەتەوە هەیە[١]، تاکو بزانین چۆن سەریان هەڵداوە، بە چ بیرو باوەڕێکی کۆن ئاوەدراون و چۆن لە ناو کۆمەڵی ئێمەدا بەم شێوەو قاڵبەی ئێستایان ڕەنگیان داوەتەوە؟

بەر لە هەموو شتێک دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین کە ئەدەبی فۆلکلۆریی بە گشتیو چیرۆکی فۆلکلۆری بەتایبەتی، لە بارەی ناوەڕۆك و ڕوخسارەوە زادەی پاشماوەی ڕۆشنبیریی کۆنی ئەو میللەتەیە، لە سەردەمە زووەکانی ژیانی خێڵەکیو دەرەبەگایەتیو بگرە پێشتریش خوڵقاوە، چونکە هیچ لایەنێکی ژیان و چالاکییەکی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی نابینی کە شارەزاییو زانیاریی قۆناغەکانی پێشووی ژیاریی مرۆڤایەتی نەنوێنێ. کەواتە چیرۆکی فۆلکلۆری لەئەدەبی فۆلکلۆریی نەتەوەوە هەڵێنجراوەو خاوەنی ڕەگێکی قووڵەو، بە ناخی مێژووی میللەت و ڕۆشنبیریی کۆن دا دەچێتە خوارەوە، ئەمڕۆ وەك بەری تاقیکردنەوەی کۆنی ڕۆڵەکانی میللەت و بیرو باوەڕو بۆچوونی کۆنیان بۆمان ماوەتەوە، بۆیە لە ڕوەت ناکەون و تا کۆن دەبن هەر نوێدەبنەوەو هەر پشتە بۆ ئەوەی نوێی خۆی دەگێڕێتەوە، تام و چێژی خۆشی لێوەردەگرن. بۆیە ئێمە لەگەڵ ئەو ڕایەداین کە دەڵێ: [فۆلکلۆر دەنگدانەوەی ڕابوردووە، بەڵام لە هەمان کاتیش دا، دەنگی توندو بەهێزی ئەمڕۆکەشە[٢]].

کەواتە: هەر نەتەوەیەك کەلەپوورێکی تایبەتیی خۆی هەیەو، ڕەگی بە ڕابوورووی‌دا چۆتە خوارەوە، قەدو لق و پۆپ و گەڵاکانیشی لە ئاسمانی ساف ئەمڕۆکەیدا بە جوانی دەشەکێتەوە، بۆیە گوتراوە: [ئەو کۆمەڵەی قوربانی بە ناسنامەو کەلەپووری جیاکەرەوەی خۆی بدات، بێگومان دەبێتە چەند کەسێکی نیگەران و پەشۆکاوو لەکاتی تەنگانەدا دەبێت بە پووشی ووشك و خۆیان لەبەردەم بادا ڕاناگرن وەهەست بە هیچ قەوارەیەکی لە خۆیان گەورەتر ناکەن کە بەسەر بەرژەوەندییی تایبەتیی خۆیان بکەوێتەوە[٤]]. چونکە کەلەپوور زادەی تێکرای کۆمەڵگای ڕابوردووە، بۆیە ئەمڕۆ گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە فۆلکلۆرییانە، وەکو یەك لە دێهات و لەشاردا لە ڕوومەت دان و، خەڵکێکی زۆر بەتایبەتی منداڵان بە ئارەزوویێکی زۆرەوە گوێی بۆ ڕووداوەکان و پاڵەوان و کەسەکانی شل دەکەن و دەکەونە ناو جیهان و ئاووهەوای خۆشی ئەو چیرۆکانەوە.

## چیرۆکی فۆلکلۆریو جۆرەکانی :-

لەبارەی چیرۆکی فۆلکلۆریو جۆرەکانییەوە، گەلێک بیرو ڕای جیاواز هەنەو هەر فۆلکلۆرستە بەپێی بۆچوونی خۆیو ڕێبازی زانیارییەوە، لێیەوە دواوەو دابەشی کردووە. هەیە دەڵێ: [زاراوەی - فۆلکلۆری - لە ئەدەبی جیهانیدا زاراوەیەکی نوێیە، چونکە هەر چیرۆکێکی گێرانەوەی تێدابیو ڕەگی بچێتەوە بۆ ڕابوردووی ژیانی میللەت ئەوا بەچیرۆکی میللی دادەنرێت و[٥]، بەم پێیەش گەلێ جۆرە چیرۆك و حیکایەتی کۆن دەگرێتەوە.

چیرۆکی فۆلکلۆری دوو تایبەتمەندیی سەرەکی هەیە، یەکەم: کۆنەو زادەی سەردەمێکی دیاریکراو یاخو هەڵوێستێکی زانراو نییە. دووەمیش: لە کەسێکەوە بە سەربەستی دەگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی ترو، کەس ناتوانێ بڵێ دارشتن و ڕەسەنییەکەی لەمەڕ منەو، بە زۆری گێرانەوەکەیشی هەر زارەکی دەبێ[٦].

چیرۆکی فۆلکلۆری ناونیشانێکی گەورەیەو، گەلێک لق و پۆپی لێدەبێتەوەو، گەلێك زاراوەیان بۆ دانراوە، وەکو ئەمانەی خوارەوە:-

١. چیرۆکی ئەفسانەیی ٢. داستانی میللی ٣. چیرۆکی جنۆکان ٤. چیرۆکی گیانداران ٥. چیرۆکی کۆمەڵایەتی ٦. چیرۆکی گاڵتەو گەپ ٧: چیرۆکی سەیروسەمەرە[٧].

دەبێ پێش هەموو شتێکیش ئەو ڕاستییە بزانین کە لێکۆڵەرەوە ناتوانێ لە چیرۆکی فۆلکلۆری بکۆڵێتەوە تاکو نەزانێ ئەفسانە (الاسطورة و الخرافة) چییە؟ چونکە ئەفسانە ئەمڕۆ بووەتە بابەتێکی بەپیت لە بابەتەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی ئینسان و، زانستێکی سەربەخۆی هەیە کە (میثۆلۆژی) یاخود زانستی ئەفسانەی پێدەڵێن و، ئەم بابەتەی ئەفسانەش سەرچاوەو بنەڕەتێکە کە چیرۆکی فۆلکلۆری لێدەبێتەوە[٨].

کەواتە هەرچەندە چیرۆکی ئەفسانەیی بەشێکە لە چیرۆکی فۆلکلۆری، بەڵام لە هەمان کات دا، بابەتی ئەفسانەیی خۆی ڕەگەزێکی سەرەکییە لە زۆربەی جۆرەکانی چیرۆکی فۆلکلۆریدا، لە کوردیش دا ووشەی [ئەفسانە] هەر بۆ [الاسطورة] بەکارنایەت، بەڵکو بۆ چیرۆکی [دێو و درنج] و [چیرۆکی جنۆکان] و [چیرۆکی گیانداران]یش بەکاردێت، بەتایبەتی لەو کاتەی کە کەسەکانی ئەو چیرۆکانە وەکو ئادەمیزاد هەڵس و

کەوت دەکەن و دەدوێن.

ئێمە ئەم سەرەتایەمان بۆیە هێنایەوە، تاکو ببێتە ڕێخۆشکەرێک بۆ چوونە ناو جیهانی چیرۆکی فۆلکلۆریی گیانداران. کە ئەو جۆرە چیرۆکانە دەگرێتەوە کە گیانداران دەوری سەرەکی تێدا دەبینن، تاکو بە وردی لە بن و بنچینەی بنیات و ناوەرۆکی بکۆڵینەوە، بۆ ئەوەی بزانین بنیات و هەیکەلی دروست بوونیان لە چەند وێنەو نموونەدا خۆیان دەنوێنن و ناوەرۆکیان چ چەمک و مەبەستێک دەدەن بەدەستەوە؟

**چیرۆکی فۆلکلۆریی گیانداران :-**

وەک لەمەوبەر گوتمان : چیرۆکی گیانداران ئەو جۆرە چیرۆکە فۆلکلۆرییانەن کە گیانداران کەسی سەرەکی لە بنیاتیاندا دەبینن و، ئەم جۆرە بەکۆنترین چەشنەکانی چیرۆکی فۆلکلۆریی هەر نەتەوەیەک دادەنرێ، لە شێوە سادەکەیدا، بە هەوڵدانێک دادەنرێت بۆ ڕاڤەکردنەوەی خاسیەت و خووی گیانداری هەمە جۆر، وەکو سەرچاوەیەکی بەپیت دادەنرێ بۆ بابەتی چیرۆکی کۆنی بەرایی[9].

چیرۆکی گیانداران ڕەگی دەچێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی کە مرۆڤ جارێ هەر لە ئەشکەوت دا بووە ژیانێکی دڕندەیی ژیاوە، بەرەنگاری گیانداری دڕندە بووە لەگەڵیدا جەنگبازیی کردووە گیانداری بێهێزیشی ڕاوکردووە گۆشتەکەی خواردوە. بۆیە ئەو چیرۆکانەی لەو سەردەمەوە ماونەتەوە خووو خاسیەتی ئەو گیاندارانەی دەرخستووە بە جوانی لەناو چیرۆکەکانیدا ڕوون کردۆتەوە، کۆمەڵگای پێشکەوتووی ئەمڕۆ ئەو توانایەی نییە، وەکو ئەو سەردەمە زووە ئەم جۆرە چیرۆکانەی گیانداران داڕێژێ، چونکە ئێستا بە پێی زانستی گیانداران (زوولۆژی) لە هەموو نهێنیو خاسیەتێکیان گەیشتووە. بەڵام جاران ئەو نهێنییانەی نەزانیوە، بۆیە ویستوویەتی بە چیرۆک لێیانەوە بدوێو شییان بکاتەوە خووو خاسیەتەکەیان بزانێ.

لەچیرۆکی گیانداران دا دوو ڕووی سەرەکی هەست پێدەکرێن، ڕووی یەکەمی: ئەوەیە کە هەموو ڕووداوێک کە لە ژیانی گیان لەبەرانی تر دەبینرێ کراوە بە ڕواڵەت و ڕاستییەکەی بە زمانی کەسێکەوە دەگێڕێتەوە وەک بڵێی زمانی ئەو گیان لەبەرانە دەزانێت، ئەمە ڕووێک و ڕووەکەی تری ئەوەیە کە ئەم جانەوەرو ئاژەڵ و باڵندانە، تەنیا نیشانەبن و لەو دیو پەردەوە بە ناوی ئەمانەوە ژیانی ڕاستەقینەی کۆمەڵ و ئادەمیزاد بخرێتەڕوو[10]، ئەم جۆرە چیرۆکانە لە ئادەبیاتی زۆربەی گەلان دا بەدیدەکرێت و هەمیشە بەسەر زارانەوەن و دەگێردرێنەوە. چونکە ئادەمیزاد ئارەزوویەکی غەریزی بۆ زانینی هەموو خاسیەتێکی گیانداران هەیەو تاکو ئێستاش ئەم مەیل و ئارەزووە لەلای منداڵان هەرماون و دەیانەوێ هەموو شتێک لە بارەی گیاندارانەوە بزانن و[11]، تەنانەت دەیانەوێ بزانن ڕەنگی یا چاوی یان ددانی یاخود کلکی ئەو گیاندارانە بۆ ئەو جۆرەن و، منداڵان وا دەزانن کە گیاندارانیش وەکو ئەوان: زمانی ئاخاوتنیان هەیە، بۆیە شتێکی دەگمەن نیە کە چیرۆک بێژی کورد سەرگوزەشتەی یەکێک دەگێڕێتەوە بڵێت: زمانی هەموو گیان لەبەرێکی دەزانی، کەواتە: ئەو کاتە ئادەمیزاد وای زانیوە کە گیان لەبەری تریش زمانی تایبەتی خۆی هەیە[12].

کەواتە : لە کاتی گێڕانەوەی چیرۆکی گیانداران خەڵکەکە بەتایبەتی منداڵان وا تێدەگەن گیاندارانیش وەکو ئادەمیزاد زمانی ئاخاوتنی خۆیان هەیەو لە نێوان خۆیان دا دەدوێن و لەگەڵ ئادەمیزادیش دا قسەدەکەن و لە یەکتری دەگەن!!

**بنیاتی چیرۆکی گیانداران :-**

زانایانی فۆلکلۆر ئەمڕۆ کە چیرۆکی گیانداران لە ڕووی بنیاتەوە، بەپێی جۆرو چۆنیەتی دەورگێڕانی کەسەکانی یان بەپێی ژمارەی کەسەکانیو بەشداریکردنیان لە دروست کردنی هەیکەلی ئەم چەشنە چیرۆکە فۆلکلۆرییانە دەکەن بەم بەشانەی خوارەوە:-

**١. چیرۆکی گیانداران بەپێی دەوربینینی کەسەکانی:**

فۆلکلۆرستەکان ئەم بەشە دەکەن بە سێ جۆری سەرەکی کە ئەمانەی خوارەوەن:

أ - ئەو چیرۆکانەی کە گیانداران تێیان دا نادوێن تەنها جووڵانەوەو کاری هەندێک لەگیاندارنیان تێدا دەردەبڕێ، کەبەرانبەر بە گیاندارانی دیکە یاخود لەگەڵ ئادەمیزاددا دەیکەن، وەک چیرۆکی ئەو لەقلەقەی کە مێیەکەی خۆی کوشتووە لەسەر ئەو کەتنەی کەدەستی لەگەڵ نێرەیەکی دیکەدا تێکەڵ کردووە.

ب - چیرۆکی ئەو گیاندارانەی کە لە نێوان خۆیان دا لەگەڵ یەکتریدا دەدوێن و، وەکو ئادەمیزاد هەڵس و کەوت دەکەن و ئامۆژگاری یەکتری دەکەن وەکو چیرۆکەکانی (تیتیلەو بیبیلە) و (گورگ و مام ڕێوی) و (تۆبەی چەقەڵ) ڕێویو لەقلەق).... هتد

جـ - چیرۆکی ئەو گیاندارانەی کە تێکەڵاوی ئادەمیزاد دەبن و لەگەڵیدا دەدوێن و یارمەتی دەدەن و ڕابەری دەکەن[13]، وەکو چیرۆکی [شێردا لۆ داپیردا]، [مریشکە قوندە] و [شەرعی مار بە دار].

ئەم جۆرەی سێیەم گرنگترین جۆری چیرۆکی گیاندارانە، چونکە لە بنیاتی چیرۆکەکان دا گیاندار لەگەڵ ئادەمیزاددا هەڵس و کەوت دەکات و یارمەتی زۆرلێکراوان و ئازاری زۆرداران دەدات. ئەم جۆرە چیرۆکانەش ڕەگیان دەچێتەوە سەر ئەفسانەی ئەو جۆرە باوەڕانەی ئادەمیزادی کۆن، کە وایان دەزانی گیانی مردووان پاشی جیابوونەوەی لە لاشە دەبێت بە گیاندارو باڵدار[14] و، دێنەوە سەر دنیاو دەکەونەوە ناو کۆمەڵی ئادەمیزادو یارمەتی هەژارو بێنەوایان دەدەن و تۆڵە لە پیاو خراپان دەسێننەوە.

گیانداری وەکو گورگ و ڕێویو چەقەڵ و باڵداری وەکو کوندەپەپوو قەل و چۆلەکە دەوری خراپ دەبینن و گیاندارو باڵداری وەکو شێر مامز، کۆتر، پەرەسێلکەش بەزۆری دەوری چاکە دەبینن لە

چیرۆکی گیانداران داو، رەگی ئەم بیرو باوەڕانەش دەچێتەوە سەر ئەفسانەی کۆنی هیندیو هەندێ باوەڕی ئایینی.

ئێمە لە جۆری سێیەمی چیرۆکی گیانداران دا چاومان بەو چەشنە چیرۆکانەش دەکەوێ کە لەپاڵ ئادەمیزادو گیاندارانەوەش، شتی دیکەی وەکو ڕووەك و شتی بێگیان بە گەڵ دەکەوێو، بە ڕای من ئەم جۆرە بە هێزترین چیرۆکی ئەفسانەیی گیاندارانە، چونکە هەموو رەگەزێکی سەر ئەم جیهانە بەشداریی لە پێکەوەنانی دەکەن، واتە: [ئادەمیزاد، گیاندار، ڕووەك، بێگیان]و، هیچ شتێکی سەر ئەم زەمینە بە بێکەڵکیو بەبێ جووڵەو ئاخاوتن نامێنێتەوەو، بەم کارەش هێزو ووزەیەکیو گەورە بە بەر چیرۆکەکەدا دەکەن و، لە جیهانی منداڵان دا نرخێکی یەکجار گرنگی هەیەو، گەڕانەوەیەکە بۆ جیهانێکی یەکجار کۆنی ئادەمیزاد، ئەو جیهانەی کە هەموو گیاندارو بێگیانێکی هێزێکی ئەفسانەییو خوداوەندێکی لە دواوە بووەو، ئەمڕۆ‌ش ئەم جۆرە چیرۆکانە گەلێك سوودبەخشن بۆ هۆش و ئەندێشەی منداڵان بەهۆی کرداری سەرسوڕمێنی گیانداران و ڕووەك و شتە بێگیانەکانی ناو چیرۆکەکەوەو، ئەمڕۆ لە فیلمی کارتۆنی منداڵان لە تەلەفزیۆن دا جێگاییکی دیاری داگیرکردووەو سوودێکی زۆری پەروەردەو فێرکردنی هەیە.

**بنیاتی چیرۆکی گیانداران لە ڕووی دروست بوونییەوە :**

ئێمە تاکو ئێستاکە هەر لە ناوەرۆك و مانای گشتیو چۆنێتیی پێکەوەنانی ڕووداوو دەوری کەسەکانی چیرۆکی گیاندارانەوە دواوین و، کەم وابووە لێکۆڵەرەوەی کورد بەلای دروست بوونی بنیاتی هەیکەلی چیرۆکەکەوە چووبێ. بۆیە لێرەدا دەمانەوێ کەمێك بە وردی بە دوای ئەم لایەنەی چیرۆکەکا بکەوین و جۆرەکانی بنیات نانی شیبکەینەوە، تاکو بە چاکی بزانین چەند جۆری هەیەو، هەر جۆرەشی چۆن هەیکەلەکەی دادەمەزرێو چ سوودێکی بۆ فێرکردنی منداڵان هەیە؟

بەر لەوەی لە بنیاتی داڕشتنی چیرۆکی گیاندارانەوە بدوێین، دەمانەوێ ئەوە دوو بارە بکەینەوە کە ئادەمیزاد بەشدارییەکی سەرەکی یان نا سەرەکی لە چیرۆکەکان دا دەکات و، ئەو بەشدارییەیشی بە سێ جۆر دەبێت:ـ

١. یان ئەوەتا ئادەمیزاد تەنیا لەگەڵ گیانداران دا بەشداریی لە بنیاتی چیرۆکەکە دەکات و سوود یان زیان یاخود ئامۆژگارییان لێوەردەگرێ.
٢. یان ئەوەتا لەگەڵ گیاندارو ڕووەك بەشداریی لە چیرۆکەکەدا دەکات و ڕووەکیش وەکو گیانداران و ئادەمیزاد دێتە گفتوگۆو جووڵەو ئامۆژگارییکردنی ئادەمیزاد.
٣. یاخود ئەوەتا لەگەڵ گیاندارو ڕووەك و شتی بێگیان بەشداریی لە بنیات و ڕووداوەکانی چیرۆکەکەدا دەکات و شتی بێگیانی وەکو ئاوو ڕووبارو ڕۆژو مانگ و ئەستێرەو باو باران و بەردو شاخ... هتد دێنە ڕیزی مرۆڤ و ئاژاڵ و زیندەوەرو باڵدارو ڕووەك بۆ دەوربینین و گفتوگۆکردن و جووڵەو هاتوچووکردن.

جاری وەهاش دەبێ، ئادەمیزاد بەشداری لەبنیاتی چیرۆکەکەدا ناکات و تەنیا پەندو ئامۆژگاریی لێوەردەگرێ وەکو چیرۆکی ئەنجامی تەمەعکارییی ناودار بە (دوو پشیلەی جووت و ڕێك)و، هەر لە پەراوێزی چیرۆکی گیاندارانەوەش دەتوانین دەست بۆ ئەو چیرۆکانەش درێژبکەین کە تەنیا ڕووەك لەگەڵ یەکتریدا دەدوین یاخود ڕووەك و شتی بێگیان بەشداریی تێدادەکەن وەکو چیرۆکە کورتیلەکەی [بەفرو هەڵەکۆك] لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیمان دا[15]

ئەمانە جۆرەکانی چیرۆکی فۆلکلۆریی گیانداران بوون لە بارەی جۆری ئەو کەسانەی بەشدارییان لە بنیات نانیدا دەکەن، بەڵام ئەگەر لە بارەی ژمارەو چۆنێتی بە شدارییکردنی کەسەکانی لە نەخشەی بنیاتی چیرۆکەکەوە، ئەوا دەتوانین بەم جۆرەی خوارەوە چیرۆکەکان پۆلین بکەین:

**١. بەشدارییکردنی تەنیا دوو گیاندار لە بنیاتی چیرۆکەکەدا:**

بەم جۆرە چیرۆکانە دەڵێین [چیرۆکی دووانە] چونکە دوو کەس (دوو گیاندار) بەشداریی تێدادەکەن، جا ئەو دووانە هاوتای یەکتری بن وەکو چیرۆکی [بزنۆکەو مەڕۆکە]و (کولەو میروولە)و (ڕێوی گەرمیان و ڕێوی کوێستان[16]) یاخود هاوتای یەکتری نەبن و یەکێکیان بەهێزو ئەوەکەی تریان بێهێز بێت، وەکو چیرۆکی (شێرو مشك) یان (گورگ و مەڕ) لە هەردوو باران دا نەخشەی بنیاتی چیرۆکەکان بەم جۆرە دەکێشرێ:ـ




(١) نەخشەی بنیاتی چیرۆکی (مەڕۆکە و بزنۆکە)

**٢. چیرۆکی کۆمەڵەی بازنەیی :**

ئەم جۆرەش ئەو چیرۆکانە دەگرێتەوە کە پتر لە دوو گیاندار بەشداریی تێدا دەکەن و بەیەکەوە لە بنیاتی چیرۆکەکەدا پەیدادەبن و دەوردەبینن، وەکو چیرۆکی [هەرەوەزیو ئەنجامی تەماع کاری[17]] کە، کەلەشێرو گوێدرێژو قازو مراوییەك دەبنە هاوڕێو سەر بەیەکەوە دەنێن و هەر ڕۆژە یەکێکیان لە کاتی گەسك لێدانی ماڵەکەیان پوولێك دەدۆزێتەوەو ئەو چوارپوولە دەدەن بە گەنم و دەیچێنن و هەموویان بەنۆرە باسیدەکەن، بەڵام کە گەنمەکە باش دەڕوێ کەرەکە تەماع دەیگرێو هەر ڕۆژە هەندێك لە گەنمەکە دەخوات و کە ئەوانی تر پێ دەزانن دەڵێن با لەو زێیە بپەڕینەوە، کێ خنکا دیارە ئەو خواردوویەتی، کاتێك کە دەگەنە ناوەندی زێیەکە کەرە تەماعکارەکە دەخنکێو هەر

ئەمەشە ئەنجامی تەماعکاریی و نانەمینی ئەمەش نەخشەی چیرۆکەکەیە.

[(٣) نەخشەی چیرۆکی هەرەوەزیی و ئەنجامی تەماعکاریی]

### ٣. چیرۆکی کۆمەڵەی تەریبی :

بەو جۆرە چیرۆکانە دەگوترێ کە پتر لە دوو گیاندار بەشداریی تێدا دەکەن و بنیاتەکەی پێکەوە دەنێن و بە یەکەوە دێنە ناو چیرۆکەکەوە، بەڵام کەسەکانی دوو جۆرن، جۆرێ بە دەستەڵات و جۆری بێ دەستەلات و بێ زیـان و، وەکو دوو هێڵی تەریبی بەرانبەر بە یەك دەوەستن، وەکو چیرۆکی [شـێرو پڵنـگ و ڕێـوی] کە سێ گیانداری بێ دەسەڵاتی وەکو [گاکێوی و مامز و کەروێشك] ڕاودەکەن و شێر داوا لە گورگ دەکات ئەو سێ نێچیرەیان بە ..ەوە دابەش بکات گورگیش دەڵێ شاهم خۆشبێ تۆ گەورەیی و گاکێـویـەکـەش گەورەیـەو با بۆ تۆ بێتو مامزەکەش ناوەنجی یەو منیش ناوەنجینم با بۆ من بێت و، کەروێشکەکەش بچووکەو مام ڕێویش بچووکە با بۆ ئەو بێت. شێرەکە بەمە قایل نابێت و چنگێکی لەتەپڵی سەری دەدات و لەو گورزە بێهۆشی دەخات و ئینجا ڕوو لە مام ڕێوی دەکات و پێی دەڵێ: تا بزانم تۆ چۆنیان دابەش دەکەی؟ ڕێوش لە مەبەستی شێرەکە دەگات و دەڵێ: گەورەم گاکێـویـیەکە بۆ ژەمی بەیانیت و مامزەکە بۆ نیوەڕۆت و کەروێشکـەکـەش لە نێـوانی نیـوەڕۆو ئێوارەدا بخۆو نۆشی گیانت بێ. شێرەکـە پێی دەڵێ: ئافەرین، ئەم دادپەروەرییە لەکێ فێربووی؟ مام ڕێـویش دەڵێ: گەورەم لەو چنگـەی دات لە تەپـڵی سەری مام گورگ!! ئەمەش نەخشەکانی چیرۆکەکەیە لە هەردوو باردا.

١. بەپێی دابەش کردنەکەی گورگ :




نەخشەی ژمارە (٣)

٢. چیرۆکەکە بەپێی دابەش کردنەکەی مام ڕێوی :




نەخشەی ژمارە (٤)

### ٤. چیرۆکی کۆمەڵەی زنجیرەیی :

بەو جۆرە چیرۆکانە دەگوترێ کە وەکو زنجیرەیەك بنیات دەنرێن و ئاڵقـەکەیشی کەسەکانی (گیاندارەکانی) ناوچیرۆکەنەو هەر جارە یەکێك وەکو ئاڵقەیەکی نوێی زنجیرەکە پێوەی دەلکێنرێ وەکو چیرۆکی [گەشتێك بەرەو کوێستان]ی تۆمارکردنی کاك عومەر ئیبراهیم عەزیز کە لەسەرەتادا پیرە کەرێك بەرەو کوێستان دەڕوات و لە ڕێگادا بەزنجیرە تووشی دوو بەران و لە دواییدا کەڵەشێرێك دێتە سەر ڕێگایان و داوای لێدەکەن لەگەڵ خۆی بیان بات بۆ کوێستان، بە مەرجێك هەموویان پەیمان ببەستن ئەگەر گورگ هێرشی بۆ کەرەکـە هێنـا ئەوان پارێـزگـاریی لێبکەن و لەئـەنجامیش دا بەڵێنەکەیان دەهێننەدی.




نەخشەی (٥)




(٦) «نەخشەی چیرۆکی کۆسە مرد کفنی نەبوو»

یاخود چیرۆکی [مام چەقەڵ دەچێت بۆ حەج[18]] کە لە کوردی بە ناوی تۆبەی چەقەڵ] یان [تۆبەی ڕێوی] بەسەر زارانەوەیەوە، لەو چیرۆکەدا چەقەڵ بە درۆ تۆبەدەکات و ڕووە حەج دەکەوێتەڕێو تووشی کەڵەشێرو لە دوایی‌دا مریشکێك و لە دوا جاریش دا قەلێك دەبێ‌و پێ‌ی باوەڕدەکەن و تاکو دەگاتە ئەشکەوتێك و هەر یەکەیان بەفێڵێك دەخوات، تەنیا قەلەکە نەبێت بە فێڵ خۆی لە دەمی چەقەڵ ڕزگار دەکات و، نەخشەی بنیاتی چیرۆکەکەش بەم جۆرەیە:

**٥. چیرۆکی کۆمەڵەی پەیژەیی :**

بەو جۆرە چیرۆکانە دەگوترێت کە وەکو نموونەی چیرۆکی زنجیرەیی بێ، بەڵام هەر جارە کەسێکی نوێ بێتەپاڵ کەسە کۆنەکەو بۆ جاری دووەمیش نوێیەکە دەبێت بە کۆن و یەکێکی نوێتری لەگەڵ دادەنرێو بە شێوەی پەیژەو پێ بە پێ دێتەخوارەوە، وەکو چیرۆکی [کۆسە مرد کفنی نەبوو[19]]. کە کۆسەیان خستە سەر کەڵەك، کەڵەك ڕووخا! وتیان کەڵەك بۆ ڕووخایت؟ وتی: ئەی بۆچی گیا لە بنم سەوز ئەبێ! وتیان: گیا بۆ لەبنی سەوز نەبیت؟

وتی: ئەی بۆچی بزن سەر قرتم ئەکات وتیان: بزن بۆ سەرقرتی ئەکەیت؟ وتی: ئەی بۆچی گورگ چاوم لێ زەق ئەکاتەوە؟ وتیان: گورگ بۆ چاوی لێ زەق ئەکەیتەوە؟ وتی: ئەی بۆچی شوان حەلەلەم لێ ئەکات؟ وتیان: شوان بۆ حەلەلەی لێئەکەیت؟ وتی: ئەی بۆچی دایەرە نایەڵێ شیر بدۆشم؟ وتیان: دایەرە بۆ نایەڵی شیر بدۆشێ؟ وتی: ئەی بۆچی مشك سەردۆڵم[20] ئەخوات؟ وتیان: مشك بۆ سەردۆڵی ئەخۆیت؟ وتی: ئەی بۆچی پشیلە چاوم لێ زەق ئەکاتەوە، وتیان پشیلە بۆ چاوی لێ زەق ئەکەیتەوە؟ وتی:

کومکەی ئەلە بە ڕیشم    ئەگەر لێرە دانیشم،
ئەچمە شاری تاران    جگەرە قوت قوت ئەکێشم

زۆر جار حیکایەت خوان ئەم چیرۆکە پەیژەیی‌یە دەکەن بە پێشەکی چیرۆکی دیکەو، هەست دەکەین بە کۆسەوە ٩ کەس لە ئادەمیزادو گیانداروو ڕووەك و بێ‌گیان بەشداریی لە بنیاتی چیرۆکەکە دەکەن و بەپێ‌ی ئەم نەخشەیە دەور لە بنیاتی‌دا دەبینن.

**٦. چیرۆکی کۆمەڵەی هەرەمی :**

ئەو جۆرە چیرۆکەی گیانداران دەگرێتەوە، کە وەکو هەرەمێك بنیات بنرێو لە کاتی دروست بوونی لووتکەی هەرەمەکە لەژێرەوەیەو بنکەکەی دەکەوێتە سەرەوە، لەتاکە کەسێکەوە دەست پێ‌دەکات و دەبێتە تۆقەڵە[21] و لەدوایی‌دا دەبن بە دووان و ئەنجا ئەم دووانەش دووبارە دەبنەوە کەسی سێیەمیان دەکەوێتە پاڵ و ئەنجا هەر سێکیان دووبارە دەبنەوە کەسی چوارەمیان دێتەسەرو بەم جۆرە تاکو دەبن بە (٥، ٦، ٧، ٨، ٩) لە نۆیەمیان دا ڕادەوەستێ‌و بنکەی هەرەمەکە دروست دەبێ‌وئەم جۆرە چیرۆکە هەرەمی‌یەش دوو لقی لێ دەبێتەوە:-

١. یان ئەوەتا چیرۆکەکە هەرەمی دروست دەبێت و هەڵوەشانەوەی بۆ نی‌یەو لە دواترین کەسەوە دەوەستێ‌و سەری بەربەرەڵڵایە وەکو چیرۆکەکەی (مریشکە قوندە[22]) کە دەچێت بۆ شاری شووکردنێ، یاخود چیرۆکەکەی [کێزا تەرەجان[23]]ی شێوەی کرمانجی ژووروو.

چیرۆکەکەی (مریشکە قوندە) بەم جۆرە دروست دەبێت[24]: مریشکێك دەچێتە شاری شووکردن و، لە ڕێگادا شوانێك تووشی دەبێت و پێ‌ی دەڵێ: بۆ کوێ؟ ئەویش پێ‌ی‌دەڵێ:- دەچم بۆ شاری شووکردن، شوانەکە پێ‌ی دەڵێ: «نایەی شوو بە من بکەی؟» مریشکە قوندە دەڵێ: «بەچیم بەخێودەکەی؟» شوانە دەڵێ: «بە نانی شوانی!!» مریشکە قوندە نایکات و دەڕوات و لە ڕێگادا تووشی گاوانێك دەبێ‌و شوو بە ئەمیش ناکات و، دەڕوات تاکو تووشی مشکێك دەبێ‌و مشکەکە پێ‌ی‌دەڵێ وەرە شوو بە من بکەو بە برنجی سەدریت بەخێودەکەم. مریشکەکە ڕازی دەبێ‌و شووی پێ‌دەکات.

ڕۆژێکیان کە مریشکەکە دەچێتە دەرەوە تا دەگەڕێتەوە، مشکەکە دەکەوێتە دیزەی چێشت لێنان و دەمرێ. مریشکەکە زۆر پەرۆشی دەبێ‌و لە خەمان پەڕی خۆی دەبرێو دەچێتە سەر گوفەك و ئەمیش لێ‌ی دەپرسێ: مریشکە قوندە بۆ وات لێهاتووە؟ مریشکەکەش دەڵێ: «لە نازێ پەرچ برایێ، ئەی نەتزانیوە گوندیل[25] کەتە دیزێ!!»

گوفەکیش هەستا لایەکی خۆی سووتاندو پاش کەمێك قەلەڕەشێك هاتە سەری‌و لێ‌ی‌پرسی بۆ لایەکت سووتاوە؟

گوفەك گوتی :

لە گوفەکی لا سووتایێ
لە نازێ پەرچ برایێ
ئەی نەتزانی‌یە گوندیل کەتە دیزێ؟!

قەلەکەش هەستا باڵێکی خۆی شکاندو چووە سەر دارێکی قەراخ ڕووبارێك و، دارە لێ‌ی‌پرسی ئەوە بۆ لا باڵێکت شکاوە؟

قەلەکە گوتی :

لەقەلێ بار شکایێ
لە گوفەکی لا سووتایێ
لەنازێ پرچ برایێ
ئەدی نەتزانیە گوندیل کەتە دیزێ؟!

دارەکە هەمـوو پەلکی خۆی هەڵوەرانـدە ناو ڕووبـارو، ڕووبـارەکەش پێیگوت: بۆ وا پەلکت وەریوە؟

دارەکەش گوتی:

لەدارێ پەلك وەرایێ
لە قەلێ بار شکایێ
لە گوفەکی لا سووتایێ
لە نازێ پرچ برایێ
ئەدی نەتزانیە گوندیل کەتە دیزێ؟!

ڕووبـارەش هەستـا ئاوەکـەی خۆی لێڵ و وێڵ کردو بە بەستێدا بۆی شۆڕبووەوە، بەستەکەش پێیگوت: ئاوە ئەو بۆ خۆت لێڵ و وێڵ کردوە؟
ئاوەکەش گوتی :

لە ئاوێ لێڵ و وێلێ
لە دارێ پەلك وەرایێ
لە قەلێ بار شاکایێ
لە گوفەکی لا سووتایێ
لە نازێ پرچ برایێ
ئەدی نەتزانیە، گوندیل کەتە دیزێ؟!

بەستـەکەش دەست بەجێ کردیە شەقە شەق و پەمۆ گوێیان لێبوو، لێیان پرسی: ئەوە بۆ شەقە شەقتە؟
بەستەکەش لە وەڵامدا گوتی:

[لە بەستێ شەقە شەقێ
لە ئاوێ لێڵ و ویلێ
لە دارێ پەلك وەرایێ
لە قەلێ بار شکایێ
لە گوفەکێ لاسووتایێ
لە نازێ پرچ برایێ
ئەدی نەتزانیە گوندیل کەتە دیزێ؟!

پەمۆش هەموو خۆیان سەراوبن کردو بەیانی پەمۆچین هات و تەماشای کردن و پێیگوتن: ئەوە بۆ واتان لە خۆکردووە؟
ئەوانیش گوتیان :

لە پەمۆی سەراو قوونێ
لە بەستێ شەقە شەقێ
لە ئاوێ لێڵ و ویلێ
لە دارێ پەلك وەرایێ
لە قەلێ بار شکایێ
لە گوفەکی لا سووتایێ
لە نازێ پرچ برایێ
ئەدی نەتزانیە گوندیل کەتە دیزێ؟

کابرای پەمۆچێنیش هەستا بێڵێکی لە خۆی ڕاکردو کاتی نیوەڕۆ کیژەکەی کە نان و ماستی بۆ هێناو باوکی بەم جۆرە دیت لێیپرسی باوکە بۆچی وات بەسەرهاتووە؟
باوکی گوتی :

لە باوەی بێر بە قوونێ
لە پەمۆی سەراو قوونێ
لە بەستێ شەقە شەقێ
لە ئاوێ لێڵ و وێلێ
لە دارێ پەلك وەرایێ
لە قەلێ بار شکایێ
لە گوفەکی لا سووتایێ
لە نازێ پرچ برایێ
ئەدی نەتزانیە گوندیل کەتە دیزێ؟

کیژەش جامە ماستەکەی بەسەر سەری خۆیدا کردو گەڕایەوە ماڵەوەو کە دایکی بەم شێوەیەی بینی، گوتی: کیژم ئەوە بۆ وات بەسەرهاتووە؟ کیژەکە گوتی: هێ هێ دایە:

لە کیژەی سەر بە ماستێ
لە باوەی بێر بە قوونێ
لە پەمۆی سەراو قوونێ! لە بەستێ شەقە شەقێ!
لە ئاوێ لێڵ و وێلێ !! لە دارەی پەلك وەرایێ
لە قەلێ بار شکایێ لە گوفەکێ لا سووتایێ
لە نازێ پرچ برایێ ئەدی نەتزانیە، گوندیل کەتە دیزێ؟!

دایکەش کە ئەمەی زانی، هەستا لایەکی لە خۆی کردەوە!!

بەم جۆرە چیرۆکـە هەرەمی‌یـەکە دروست بوو، بەڵام لووتکەی لە ژێـرەوەو بنکـەی لە سەرەوەو بینیمـان ١٣ کەس بەشدارییان لە بنیات نانی‌دا کردو لێرەدا نەخشەکەی بە جۆرێکی ئاسایی‌و دوای تەواوبوونی هەرەمـەکـە بنکەکەی دەخەینە ژێرەوەو لووتکەیشی لە سەرەوە وەکو ئەم نەخشەیەی خوارەوە:




«٧» نەخشەی چیرۆکی هەرەمی «مریشکە قوندە»

١

وەك سەرنج دەدەینە نەخشەی چیرۆکەکە دەبینین بنکەی هەرەمەکەی دەگاتە ١١ کەس و لە مریشکە قوندەوە دەست پێدەکات تاکو دەگاتە دایك و لەویشەوە بەر بەرەڵلایەو کەسی تری لەدوا نایەت، کاتێکیش لە ژمارەی سەرجەمی کەسەکان ورد دەبینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە ١٢ کەس بەشداریی لە بنیاتی هەرەمی چیرۆکەکە دەکەن و (٥) یان ئادەمیزادن و (٣) یان گیاندارن و (٢) یان ڕووەکن و (٢) شیان بێگیانن. لەسەرەتاوە، واتە لە مریشکە قوندەوە تاکو شوان و گاوانەکە لەسەر دەستووری چیرۆکی کۆمەڵەی زنجیرەیی دەڕوات، بەڵام لە مشکەکەوە دەبێتە جۆری کۆمەڵەی هەرەمیو هەر جارە ووتەی کەسەکان دووبارە دەبێتەوەو ناویشیان تا زووتر دێت پتر دووبارە دەبێتەوە واتە: ژمارەی زنجیرەیان لەگەڵ ژمارەی دووبارە بوونەوەیان پەیوەندییەکی پێچەوانەیی هەیەو، بەم پێیەش، مریشکەکە ١١ جار لە هەرەمەکەدا دەوردەبینێو مشك (١٠) جارو گوفەك ٩ جار، قەل ٨ جار، دار ٧ جار ئاوی رووبار ٦ جار، بەست ٥ جار، پەمۆ ٤ جار، پەمۆچێن (باوك) ٣، کیژ ٢، دایك (١) جار ناویان دێت.

ئەم چیرۆکە بۆ منداڵان سوودێکی زۆری هەیە، چونکە گەنجینەیەکی لە ووشەو زاراوەی زمانەکەیان دەخاتە بەردەم و فێریان دەکات، بۆ ئەوەی لە خاسیەت و شێوەو ڕەنگ و ڕووی گەلێك لە گیاندارانی وەکو (مریشك)، (مشك)، (قەل) بگەن و، لە شوان و گاوان و پەمۆچێن و پیشەو بەرهەمیان بگەن و بزانن ڕووەکی وەکو دارو درەخت گەڵای هەیەو گەڵاوەرێنەو پەمۆش ڕووەکە دەچێنرێو رووبار ئاوی پێدا دەڕوات و

ئەم دەقەی لێمان کوڵیەوە بە خەست کردنەوەیەکی کەمەوە لە

کتێبەکەی (ڕێوی گەرمیان و کوێستان)ی کاک عومەر ئیبراهیم عەزیزمان وەرگرتووەو کەمێك جیاوازیی لەگەڵ دەقی کتێبی (هەبوو.. نەبوو)دا هەیە کە لەو سەرچاوەیەش دا ئەم چیرۆکە هەیەو بە ناوی [کێزا تەرەجان[26]] هاتووەو کەسەکانی بریتین لە [کێز: قالۆچە]، [شڤان: شوان]و [مشك]، [سییار: سوار]، [مێرك: پیاو]و [ئاڤ: ئاو]، [گارس: هەرزن]و [دار]، [قەل]، [کچ]، [باب]و ژمارەیان ١١ کەسەو لە لای کاک عومەریش لە هەرەمەکە ١١ کەسەو وەکو ئەویش ٥ ئادەمیزاد بەشدارییان لە چیرۆکەکەدا کردووە لە گەڵ ٣گیاندارو ٢ ڕووەك، بەڵام لە ژمارەی شتی بێگیان جیاوازن و لای یەکەمیان (٣)و لای دووەمیان تەنیا یەك شتی بێگیان بەشداریکردووە.

٢. یان وا دەبێ چیرۆکی کۆمەڵەی هەرەمی کە بە تەواوی دروست بوو، کەسی دوایی گرێیەکانی چیرۆکەکە دەکاتەوە وەکو ئەو چیرۆکەی [کێزا تەرەجان] کە باسمان کردو هەنگاو بە هەنگاو بەرەو دواوە دەگەڕێتەوەو هەرەمەکە هەڵدەوەشێنێتەوە تاکو دەگاتەوە یەکەمین کەس و ئەم چیرۆکانەش دەبنە دوو جۆری سەرەکی:

٣. یان ئەوەتا کەسەکانی چیرۆکەکە تەنها خۆیان دەوردەبینن نەك ئەندام و بەرهەمیان بەشداری لە ڕووداوەکانیدا بکەن، بەم جۆرە دەڵێین [چیرۆکی هەرەمی هەڵوەشاوەی سادە]و ئەمەش نموونەیەکییەتی:-

[بەرخەکە لەڕووبارەکە ناپەڕێتەوە][27]

پوختەی چیرۆکەکە ئەمەیە : شوانێك ڕانە مەڕێکی لە ڕووبارێك دەپەڕێنێتەوە، هەموو ڕانەکە لە ئاوەکە دەدەن تەنیا بەرخێکیان نەبێ مان دەگرێت و لە ئاو نادات.

شوانەکە پێی دەڵێ : ئەگەر نەپەریەوە دەچم بانگی قەساب دەکەم بێت سەرت ببڕێ بەرخەکە دەڵێ : بڕۆ.. بڕۆ. شوانەکە دەچێتە لای قەساب و پێیدەڵێ وەرە بەرخەکە سەربڕە، چونکە لەئاونادات! قەسابەکە دەڵێ خەریکی گۆشت فرۆشتنم و ماوەم نییەو ناتوانم بێم! شوانەش پێیدەڵێ: ئەگەر نەیەیت دەچم ئاسنگەرت بۆ بانگ دەکەم تاکو کێردەکەت بشکێنێ! قەسابەکە دەڵێ: بڕۆ بڕۆ! شوانە دەچێتە لای ئاسنگەرو پێیدەڵێ: وەرە کێردی قەساب بشکێنە چونکە نایەوی بەرخەکە سەربڕێو بەرخەکەش نایەوی لە ئاوەکە بدات! ئاسنگەریش دەڵێ: کارم زۆرەو ناتوانم بێم! شوانەکە دەڵێ:-

«ئەگەر نەیەی دەچم بانگی جۆگا دەکەم تاکو بێت و کوورەکەت بکوژێنێتەوە» ئاسنگەریش دەڵێ: «بڕۆ.. بڕۆ!!».

شوانەکە دەچێتە لای جۆگاو پێیدەڵێ: «وەرە کوورەی ئاسنگەر بکوژێنەوە چونکە ئاسنگەر نایەوی کێردی قەساب بشکێنێو قەسابیش نایەوێ بەرخەکە سەربڕێو بەرخەکەش لەئاو نادات!». جۆگاکە دەڵێ: «من خەریکی شینایی ئاودانم و ناتوانم بێم!»و، شوانەکەش پێیدەڵێ: «ئەگەر نەیەیت دەچم مانگا بانگ دەکەم بێو بتخواتەوە» جۆگاکەش دەڵێ: «بڕۆ! بڕۆ!!»

شوانەکە دەچێتەو لای مانگاو پێیدەڵێ: «مانگاکە وەرە جۆگاکە بخۆوە، چونکە نایەوێ کوورەی ئاسنگەر بکوژێنێتەوەو ئاسنگەریش نایەوی کێردی قەساب بشکێنێو، قەسابیش نایەوێ بەرخەکە سەربڕێو بەرخەکەش لە ئاو نادات!!» مانگاکە پێیدەڵێ: «من گوێلکەکەم شیردەدەم و ماوەم نییە بێم» شوانەکە پێیدەڵێ: «ئەگەر نەیەیت دەچم پەتت بۆ بانگ دەکەم تاکو بێو بتخنکێنێ»، مانگاکەش پێیدەڵێ: «بڕۆ.. بڕۆ»

ئینجا شوانەکە دەچێتە لای پەت و پێی دەڵێ: «وەرە مانگاکە بخنکێنە چونکە نایەوێ ئاوی جۆگاکە بخواتەوەو جۆگاکەش نایەوێ کوورەی ئاسنگەر بکوژێنێتەوەو ئاسنگەریش نایەوێ کێردی قەساب بشکێنێو قەسابیش نایەوێ بەرخەکە سەربڕێو بەرخەکەش لە ئاو نادات!» پەتەکەش دەڵێ: «ناتوانم بێم» شوانەکە پێیدەڵێ: «ئەگەر نەیەیت دەچم مشکت بۆ بانگ دەکەم تاکو بێو بتقرتێنێ»، پەتەکە دەڵێ: «بڕۆ.. بڕۆ!»

شوانەکە دەچێتە لای مشك و پێیدەڵێ: «وەرە پەتەکە بقرتێنە چونکە نایەوێ مانگاکە بخنکێنێو مانگاکەش نایەوێ ئاوی جۆگاکە بخواتەوە، جۆگاکەش نایەوێ کوورەی ئاسنگەر بکوژێنێتەوەو ئاسنگەر نایەوێ کێردی قەساب بشکێنێو قەسابیش نایەوێ بەرخەکە سەربڕێو بەرخەکەش لە ئاو نادات!» مشکەکە دەڵێ: «ناتوانم بێم»، شوانەکە پێی دەڵێ: «ئەگەر نەیەیت دەچم پشیلەت بۆ بانگ دەکەم تاکو بێت و بتخوات!» مشکەکە دەڵێ: «بڕۆ.. بڕۆ»

شوانەکە دەچێتە لای پشیلەو پێیدەڵێ: «وەرە مشکەکە بخۆ، چونکە مشکەکە نایەوێ پەتەکە بقرتێنێو پەتەکەش نایەوێ مانگاکە بخنکێنێو مانگاکەش نایەوێ ئاوی جۆگاکە بخواتەوەو جۆگاکەش نایەوێ کوورەی ئاسنگەر بکوژێنێتەوە، ئاسنگەریش نایەوێ کێردی قەساب بشکێنێو قەسابیش نایەوێ بەرخەکە سەربڕێو بەرخەکەش لە ئاو نادات!» پشیلەکە دەڵێ: «من ئامادەم مشکەکە بخۆم و بۆی دەچێو، مشکەکە دەڵێ: «نا نا مەمخۆ دەچم پەتەکە دەقرتێنم»و پەتەکەش دەڵێ:- «نا نا مەمقرتێنە دەچم مانگاکە دەخنکێنم» مانگاکەش دەڵێ: «نا نا مەمخنکێنە دەچم ئاوی جۆگاکە دەخۆمەوە!» جۆگاکەش دەڵێ: «نا نا مەمخۆوە دەچم کوورەی ئاسنگەر دەکوژێنمەوە» ئاسنگەریش دەڵێ: «نا نا کوورەکەم مەکوژێنەوە دەچم کێردی قەساب دەشکێنم» قەسابیش دەڵێ: نا نا کێردەکەم مەشکێنە دەچم بەرخەکە سەردەبڕم» بەرخەکەش دەڵێ «نا نا سەرم مەبڕەو بەگوێی شوانەکەم دەکەم و لە ئاوەکە دەدەم و لە

ڕووبارەکە دەپەڕەوە!!»

بەم جۆرە چیرۆکە هەرەمی‌یەکە کۆتایی دێت و بۆیە ناومان نا (هەرەمی‌ی سادە)، چونکە زۆربەی کەسەکانی بە تەنیا دەور لە بنیاتی چیرۆکەکەدا دەبینن و تەنیا چەند کەسێکیان ئامێر یا شتێکی پەیوەندیی‌داریان لەگەڵ دا بەرکاردێت، وەکو: (قساب وکێرد)و (ئاسنگەرو کوورەکەی)و (جۆگاو ئاوەکەی).

کاتێك لە بنیاتی چیرۆکەکە وردەبینەوە هەست دەکەین، بە مرۆڤ و گیاندارو بێ‌گیانەوە ٩ کەس بەشدارییان تێداکردووە، لەوانە (٣) یان ئادەمیزادن واتا: [شوان، قەساب، ئاسنگەر]و (٤) یان گیاندارن [بەرخ، مانگا، مشك، پشیلە]و دووانیشیان بێ‌گیانن [جۆگا، پەت].

کەسەکان بەپێی زنجیرەی بەشداریکردنیان، هەرەمێکی سەرەوبن پێکەوە دەنێن و، ئەگەر شوانەکە لووتکە بێ ئەوا (شوان، بەرخ، قەساب، ئاسنگەر، جۆگا، مانگا، پەت، مشك، پشیلە) دانەن لە بنکەی هەرەمەکەو دەتوانین دوای دروست بوونی هەرەمەکە هەڵگێڕینەوەو بەم جۆرە نەخشەی بکێشین.

بروانە نەخشەی ژمارە (٨).



نەخشەی ژمارە (٨)

## چیرۆکی کۆمەڵەی هەرەمی‌ی سادە
## (بەرخەکە لە ڕووبارەکە)
## ناپەڕێتەوە

کە بە وردی سەرنج دەدەینە ئەم نەخشەیە، دەبینین ژمارەی جاری دەور بینینی کەسەکانی لەگەڵ ژمارەی زنجیرەی ناوهاتنیان پەیوەندیی‌یەکی پێچەوانەیی‌یان هەیە، واتە شوانەکە یەکەم جار ناوی دێت بۆیە ٩ جار بەشداریی لە بنیاتی هەرەمەکەدا دەکات و بەم پێیەش بەرخەکە ٨ جارو قەساب ٧ جار، ئاسنگەر ٦ جارو جۆگا ٥ جارو مانگا ٤ جارو پەت ٣ جارو مشك ٢ جارو پشیلە (١) جار بەشداریی دەکەن بەم پێیەش هەر یەکێك لە بەشداربووەکان سەرەنجامی کۆکردنەوەی ژمارەی زنجیرەیەو ژمارەی جارەکانی بەشداریکردنی لە بنیاتی هەرەمەکەدا دەکاتە (١٠) واتە: شوانەکە ژمارەی زنجیرەی (١)ەو ژمارەی جارەکانی بەشدارییکردنی لە نەخشەی هەرەمەکە (٩)یەو کرداری کۆکردنەوەکەش بەم جۆرەیە: [١+٩=١٠] بۆ کەسەکانی تریش هەر بەم پێیە دەگوترێ:-

| کەس | ژمارەی زنجیرەیی | ژمارەی جاری بەشداربوونی | ئەنجام |
|---|---|---|---|
| بەرخ | +٢ | =٨ | ١٠ |
| قەساب | +٣ | =٧ | ١٠ |
| ئاسنگەر | +٤ | =٦ | ١٠ |
| جۆگا | +٥ | =٥ | ١٠ |
| مانگا | +٦ | =٤ | ١٠ |
| پەت | +٧ | =٣ | ١٠ |
| مشك | +٨ | =٢ | ١٠ |
| پشیلە | +٩ | =١ | ١٠ |

بۆ مەسەلەی پەروەردەو فێرکردنی منداڵانیش ئەم چیرۆکە دەورێکی باشی هەیەو منداڵان فێری زۆر شت دەکات بەتایبەتی لە ڕێگەی دووبارەو سێبارە کردنەوەی ناوی کەسەکان و کردارەکانیان، فێری ئەوە دەبن کە شوان بەرخ و مەڕو بزن دەلەوەڕێنێ‌و ئاگاداریان دەکات و قەساب مەڕ

سەردەبڕێو گۆشتەکەی بە کێردی زل و چەقۆ پارچە دەکات و ئاسنگەر کوورەی ئاگری هەیەو ئاسنی پێ نەرم دەکات و چەقۆو کەل و پەلی ئاسن دروست دەکـات. جۆگا شینایی ئاودەدات و دەشتوانی ئاگری کوورەی ئاسنگەر هەموو ئاگرێك بکوژێنێتەوەو مانگا شیری هەیەو دەزێو گۆلکی دەبێ بە شیری خۆی بەخێـویدەکـات و پەت مانگـا دەخنکێنێو پێشی دەبەسترێتەوەو مشك دەتوانێ بە ددانە تیژەکانی پەت بقرتێنێو لە هەمان کاتیش دا لە پشیلە دەترسێ چونکە پشیلە دوژمنە گەورەی مشکانەو دەیان خوات و لەدواییش دا منـدالّ بەوە دلّ خۆش دەبێ کە کەسی کۆتـایی (پشیلە) گرێیـەکانی چیرۆکەکە دەکاتەوەو یەکە یەکە هەلّدەوەشێنەوەو، وەك بلّێی دارێکی سیحـری بەدەستـەوە بێت و مانگـرتنی هەمـوویان بشکێنێو بەرخـەکـە لەئـاو بهەرێنێتەوە ئەوبەر رووبارەکەو شوانەکەش دەوری تێکۆشەرێکی ورە بەرز دەبینێو، وازناهێنێ تاکو گرێی مانگرتنی بەرخەکە لەپەرینەوە لە رووبارەکە دەکاتەوەو دەگاتە مەبەستی خۆی.

ئێمـە کاتێـك لەم چیرۆکـە هەرەمـییە کوردییە ورددەبینەوە، کە بەپێی دەقێکی کۆنی تۆمارکراوی لای نووسەری ئەم باسە خراوەتەروو، ئاورێکیش لە دەقێکی عەرەبی دەدەینەوە کە لە کتێبی الحكاية الشعبية العراقية، دراسة ونصوص[٢٨]دا تۆمارکراوە، دەبینین هەردوو دەقەکە لە زۆر لایەنەوە لەیەك دەچن، چ لە ژمارەی کەسەکانیو چ لە جۆری کەسە بەشـداربـووەکـانی، بەلاّم ئەوەنـدە هەیـە هەردووکیان بەپێی دەوروبەرەکـەیـان زۆر بەجـوانیو بە واقیعی، کەسـەکـان و ئاوەهـەوای چیرۆکەکەیان دەربڕیوەو، جیاوازییەکەیان لەم خالاّنەی خوارەوەدا دەردەکەون:

١. لە دەقـە. کوردییـەکـەدا شوان و بەرخـێـکـە، کەچی لە دەقـە عەرەبییەکەدا پیرەژن و بزنێکە.

٢. لە کوردییەکەدا بەرخەکە لە رووبار ناپەڕێتەوە بەلاّم لەعەرەبییەکەدا بزنەکە نایەوێ بچێتە ناو بیری مالّی پیرەژنەکەوە.

٣. لە کوردییەکەدا جۆگا هاتووە، کەچی لە عەرەبییەکەدا ناوی (الشط) هاتووە، چونکە عەرەب پتر شەتی لەبەر چاوەو کوردیش جۆگاو رووبار.

٤. لە دەقە کوردییەکەدا ناوی مانگا هاتووە، کەچی لە عەرەبییەکەدا ناوی حوشتر هاتووە، چونکە عەرەب حوشتری هەیەو کورد نییەتی.

ئەم بەراوردییـەی کە کردمـان بۆ ئەوەیە، تاکو خوێنەری بەرێز بزانێ چیرۆکی فۆلکلۆری لە نێوان میللەتان هاتوچوودەکەن و لەلای هەر یەکەیان مۆرکی دەوروبەرەکەی وەردەگرێ، جا ئەوە گرنگ نییە بلّێن ئەم چیرۆکە لە نەتەوەی دیکەی بۆمان هاتووە، یان لە ئێمەوە چووەتە ناو ئەوان، چونکە بابەتی کەلەپوور بە تایبەتی کەلەپووری رۆشنبیریی ئەمڕۆ بە هۆی ئیستگەو تەلەفزیۆن و رۆژنامەو گۆڤارو کتێب بە ئاسانی لە نەتەوەیەکەوە دەپەڕێتەوە بۆ نەتەوەیەکی تر بەلاّم دوای گونجاندنی لەگەلّ دەوروبەرو دابونەریتی نەتەوە وەرگرەکە.

## (ب). چیرۆکی هەرەمەی هەلّوەشاوەی ئاوێتە :-

کەسەکانی ئەم جۆرە چیرۆکە بە تەنیا دەور لە خولّقاندنی نابینن، بەلّکـو لەگـەلّ خۆیـان دا ئەنـدامێکیان یاخود بەرهەمێکیان یان کەل و پەلێکیانیش دەوردەبینن، وەکو ئەم نموونەیەی خوارەوە:

« چیرۆکی بزن شیردا لۆ داپیردا »

ڕێوییەك بە پیرەژنێك فێردەبێ، هەرچەند جاری پیرەژن بزنەکەی دەدۆشیو هەوێنی دەکرد تاکو ببێت بە ماست، دەچوو شیرەکەی دەخواردو داپـیرەی بە بێ ماسـت دەهـێشتـەوە، پیرەژن گەیشتـە ئێسکـانیو شەونخـوونی لەرشـیرەکەی گرت، تاکو شەو لەناوێك ڕێوییەکە دێت و خەریـکی شیر فردکـردن دەبێت، لە پڕ داپـیرە تەورداسێـك لە کلکی ڕێوییەکە دەدات و دەیقرتێنێو، مام ڕێوی بە بێ کلك دەمێنێتەوەو، کە دەچێتەوە ناو کۆمەلّی ڕێوییان هەموویان گالّتەی پێدەکەن و پێدەلّێن:-
مام ڕیویلەی قرتۆ قرتۆ - واوە مەیە شەرمان بە تۆ!!
مام ڕێوی گەلێك شەرمەزارو غەمبار دەبێو ناچار خۆی لە ڕێوییەکان دەشارێتەوەو دەچێتەوە لای پیرەژنەکەو پێی دەلّێ:

داپیرە کلکە قورێم وێدە !

داپـیرەش پێی دەلّێ: «بـڕۆ شیرەکـەم بۆبێنـەوە تاکـو من کلکە قولّێت بدەمـەوە»، ئینجـا مام ڕێـوی دەچێتـە لای بزنەکەی پیرێژن و لەبەری دەپاڕێتەوەو دەلّێ:-

بزن شیردا لۆ داپیردا

داپیر کلکە قورێم وێدا!!

بزنەکەش پێیدەلّێ: «من برسیمە بڕۆ گەلاّی دارم بۆ بێنە تاکو بیخۆم و گوانەکانم پڕ شیربێن، ئەو کاتە شیرت پێدەدەم»، مام ڕێوی دەچێتە لای دار تووێکی گەورەو پێی دەلّێ:

دار گەرادا لۆ بزن دا

بزن شیردا لۆ داپیردا

داپیر کلکە قورێم وێدا!!!

دار توومەکەش پێیدەلّێ: «وا دەم بینی لەبەر بێ ئاوی گەلاّکانم وەریوە، بڕۆ لای کانیو پێیبـلّێ ئاوم بدا ئەو کاتـە منیش گەلاّکـانم دێنـەوەو دەتدەمێ»، مام ڕێویش چووە سەر کانییەکی وشك بووو پێیگوت:-

کانی ئاودا لۆ داردا

دار گەرادا لۆ بزن دا

بزن شیردا لۆ داپیردا

داپیر کلکە قورێم وێدا!

کانی‌یەکەش پێی‌دەڵێ: «وا دەمبینی ئاوم تێدانەماوەو ووشك بووم، برۆ لای کچ و کاڵان و بانگیان بکە تاکو بێنە سەرم و تاوە شایی‌یەکم لەسەربکەن تاکو ئاو بزانی بەهارەو بژێیتەوە. مام ڕێویش دەچێتە لای کیژو کاڵان و پێیان دەڵێ:ـ

کیژ شایی‌کا لە کانی‌کا
کانی ئاودا لۆ داردا
دار گەرادا لۆ بزنْ دا
بزن شیردا لۆ داپیردا
داپیر کلکە قورێم وێدا

کیژەکانیش پێی‌دەڵێن (سۆل) مان نی‌یە، تاکو شایی پێبکەین، برۆ لای سۆڵدروو با سۆلی نوێمان بۆ دروست بکات ئەو وەختە دەچینە سەر کانی‌و تێرو پڕ شاییت بۆ دەکەین. مام ڕێوی دەچێتە لای وەستای سۆڵدرووو دەڵێ:ـ

وەستا سۆل کا لۆ کیژکا
کیژ شایی‌کا لە کانی‌کا
کانی ئاودا لۆ داردا
دار گەرادا لۆ بزن دا
بزن شیردا لۆ داپیردا
داپیر کلکە قورێم وێدا

وەستای سۆڵدرووش پێی‌دەڵێ: «من برسیمەو برۆ لە جیاتی حەق دەست هێلکەم بۆ بێنە تاکو سۆل بۆ کیژو کاڵان بدرووم» ئینجا مام ڕێوی هەڵدەستێ‌ دەچێتە لای مریشکان و پێیان دەڵێ:ـ

مامر هێلکەکا لۆ وەستاکا
وەستا سۆل کا لۆ کیژکا
کیژ شایی‌کا لە کانی‌کا
کانی ئاودا لۆ داردا
دار گەرادا لۆ بزن دا
بزن شیردا لۆ داپیردا
داپیر کلکە قورێم وێدا!!

مریشکەکانیش دەڵێن: «ئێمە برسیمانە، برۆ لای سەپانی خەرمانێك و هەندێك گەنممان بۆ بێنە تاکو بیخوێن و هێلکەت بۆبکەین». مام ڕێویش دەچێتە سەر خەرمانێك و لەبەر سەپانەکەی دەپاڕێتەوەو دەڵێ:

سەپان دان دا لۆ مامردا
مامر هێلکەکا لۆ وەستاکا
وەستا سۆل کا لۆ کیژکا
کیژ شایی‌کا لە کانی‌کا
کانی ئاودا لۆ داردا
دار گەرادا لۆ بزن دا
بزن شیردا لۆ داپیردا
داپیر کلکە قورێم وێدا!!

سەپان گوتی جارێ خەرمانەکەم سوور نەبووەو برۆ بە با بڵێ هەڵبکات و کاو دان لە یەکتری جودا بکاتەوە ئەو وەختە هەندێکت گەنم دەدەمێ، ڕێوی لەبەر با پاڕایەوە (با)ش هەڵیکردو خەرمانەکەی سوورکردو سەپانەکەش هەندێك گەنمی‌دا بە مام ڕێوی‌و ئەمیش بردی بۆ مریشکەکان و ئەوانیش دانەکەیان خواردو کەوتنە هێلکەکردن و ڕێوی هێلکەکانی برد بۆ وەستاو وەستاش سۆلی بۆ کیژو کاڵان درووی‌و مام ڕێوی بۆ کیژەکانی بردو ئەوانیش بە سۆلی تازەوە تاوە شایی‌یەکیان لە سەر کانی‌یەکە کردو، کانی لە خۆشیان ئاوەکەی ژیایەوەو چووە بن دارتووە گەڵاوەریوەکەو تێر ئاوبووو گەڵای نوێی دەرکردەوە، هەندێکی دا بە مام ڕوێوی‌و ئەویش بردی بۆ بزنەکەو بزنەکەش خواردی تاکو تێربوو، گوانەکانی پڕ شیر بوون و هەندێکی بۆ مام ڕیوی هەڵچوڕاندو ئەمیش شیرەکەی برد بۆ داپیرە تاکو شیرەکە بکات بەماست و داپیرەش کلکەکەی پێدایەوە، هەستا لە پاداشتی هێنانەوەی شیرەکە، زەنگوڵەیەکی بچووکی دەنگ خۆشی بە سەری کلکی‌یەوە کردو مام ڕێویش بە زرنگ و هۆڕ چووەوە ناو ئەوڕێوی‌یانەی کە گاڵتەیان پێکردبوو. ئەوانیش کە چاویان بە مام ڕێوی‌و کلك و زەنگوڵەکەی کەوت بە سەر سوڕماوی‌یەوە لێیان پرسی:
«ها مام ڕێوی ئەم زەنگوڵە دەنگ خۆشەت لە کوێ پەیداکردووە»
مام ڕێویش لە وەڵام دا گوتی: لەناو بیرێکی ئەو خوارەم دەرهێناوە مەبەستی ئەوە بوو تۆڵەی خۆی لەو ناحەزانە بکاتەوە کە گاڵتەیان پێکردبووو بەخنکانیان بدات. ڕێوی‌یەکانیش گوتیان: «ئادەی پیشانمان بدە تاکو ئێمەش ئەو زەنگوڵە بە کلکی خۆمانەوە بکەین».
مام ڕێوی بردنیە سەر بیرێکی قووڵ و پێی‌گوتن: «با جارێ یەکێکتان خۆی فرێبداتە ناوی‌و ئەگەر چەند بڵقێکی لە دووادا کەوتە سەر ئاوەکەوە، ئەوە مانای وایە پڕی بنێ زەنگوڵەیەو ئەو وەختە هەمووتان خۆتان فرێبدەنە ناو بیرەکەوە!
هەر کە یەکێکیان خۆی هاویشتە ناو بیرەکەوە، یەکسەر کەوتە پنی‌و لە چەند بڵقێکی گەورە بەو لاوە چی لێ بەدیار نەکەوت، ئەمەش مانای ئەوەیە خنکا، کەچی لە ڕێوی‌یەکان وابێ بانگیان دەکات تاکو بچنە لای‌و زەنگوڵە زۆرو زەوەندە!
ئینجا هەموویان بە یەك جار خۆیان فرێدایە ناو بیرەکەوە و تێی‌دا خنکان و، بەم جۆرە مام ڕێوی تۆڵەی یەك و هەزار لەو ڕێویانەی کردەوە کە گاڵتەیان پێ دەکرد.

خوێنەری بەڕێز ئەم چیرۆکە بنیاتەکەی دوو نهۆمە یەکەمیان هەرەمێکەو دووەمیشیان پاشکۆیەکی بەلاوەیەو مەسەلەی خنکانی ڕێوی‌یەکانەو کە بە هیچ جۆرێك بە بەر هەرەمەکە ناکەوێ. دەبێ ئەو ڕاستی‌یەش بڵێم کە ئەم چیرۆکە گەلێك دەقی جیاوازی کوردی هەیە، بەڵام من تەنیا پشتم بەو دەقە بەست کە لە سەردەمی منداڵیمەوە لە شاری کۆیە گوێم لێبووەو لەبەرم کردووە.

کاتێك لە بنیاتی چیرۆکەکە وردەبینەوە هەست دەکەین چیرۆکێکی هەرەمی‌ی ئاوێتەیەو لەدوا کەس کە [سەپان و گەنمەکەیە] گرێ‌یەکانی چیرۆکەکە دەست بە هەڵوەشانەوە دەکەن تاکو دەگاتەوە سەر پیرەژن و کلکەکەی مام ڕێوی بە ئادەمیزادو گیاندارو بێ‌گیانەوە ٩ کەس بەشداری‌یان تێداکردووە بە مەرجێ (با)یەکە حیساب نەکەین و لە وانە ٤ یان واتە: [داپیرە، کیژ، وەستا، سەپان] ئادەمیزادن و (٣) شیان گیاندارن [ڕێوی، بزن، مامر= مریشك]و (١) شیان ڕووەکەو تاکێکیشیان بێ‌گیانە. بەپێی زنجیرەی ناوهاتنیان لە دروست بوونی هەرەمی بنیاتەکەی هەست دەکەین یەکەمیان ٩ جار، دووەمیان (٨) جارو سێ‌یەمیان (٧)و چوارەمیان (٦)، پێنجەمیان (٥)، شەشەمیان (٤)، حەوتەمیان (٣)، هەشتەمیان (٢)و نۆیەمیان (١) جار بەشداری‌دەکەن.

هەرەمی بنیاتی چیرۆکەکە سەرەوبن دروست دەبێت واتە: لووتکەی لە ژێرەوەو بنکەی لە سەرەوە، بەڵام دوای تەوابوونی هەڵی دەگێڕینەوە، بە شێوەیەکی ئاسایی نەخشەکەی دەکەین هەروەك لەم نموونەیەدا دەردەکەوێ:



نەخشەی ژمارە (٩)

«چیرۆکی هەرەمی‌ی [بزن شیردا لۆ داپیرا]»

کاتێك پتر لەنەخشەی ئەم چیرۆکە هەرەمی‌یە هەڵوەشاوەیە ورد دەبینەوە، هەست دەکەین لەگەڵ هەر کەسێکیان دا ناوی ئەندامێك یان شتێکی پەیوەندیداریان دێت و بەم جۆرەی خوارەوە هەر جووتەشیان ژمارەی زنجیرەو بەشداربوونیان بەم چەشنەیە:-

| کەس و ئەندام وکەل و پەلی | ژمارەی زنجیرەیی | جاری بەشداربوون | سەرەنجام |
|---|---|---|---|
| ١. ڕێوی‌و کلکەکەی | + ١ | = ٩ | ١٠ |
| ٢. پیرەژن | + ٢ | = ٨ | ١٠ |
| ٣. بزن و شیرەکەی | + ٣ | = ٧ | ١٠ |
| ٤. دار : گەڵا | + ٤ | = ٦ | ١٠ |
| ٥. کانی : ئاو | + ٥ | = ٥ | ١٠ |
| ٦. کیژ : شایی | + ٦ | = ٤ | ١٠ |
| ٧. وەستا : سۆل | + ٧ | = ٣ | ١٠ |
| ٨. مامر : مریشك | + ٨ | = ٢ | ١٠ |
| ٩. سەپان : گەنم | + ٩ | = ١ | ١٠ |

هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ئەم جۆرەمان ناونا چیرۆکی هەرەمی‌ی ئاوێتەو هەر بەو پێ‌یەش نەخشەکەیمان بۆ کێشا.

ئێمە ئەگەر لە بارەی دەوری پەروەردەو فێرکردنی منداڵانیشەوە لێی بکۆڵینەوە، دەبینین ئەم هەموو دووبارەکردنەوەو پێداهاتنەوەیە سوودێکی زۆریان هەیە بۆ فێرکردنی منداڵان و، گەلێ زانیاریی گرنگ و بە کەڵك پێشکەش منداڵی تەمەن نێوانی چوار ساڵ و حەوت ساڵ و بگرە پتریش دەکات، چونکە ئەو منداڵەی گوێی لەم چیرۆکە دەبێت فێری ئەوە دەبێ کە ڕێوی زیان بەخشەو بە دزی دێتە ماڵی هەندێ کەس بەتایبەتی لە گوندان و خۆراکی خەڵکەکە دەخوات و کلکیشی هەیەو ئەگەر ئەو کلکەی برا عەیبدار دەبێ‌و هەروەها منداڵ فێری ئەوە دەبێ کە بزن شیردەرەو شیرەکەی دەکرێ بەماست و دار گەڵای هەیەو گەڵاوەرێنەو بزن

گیاو گوڵ و گەڵا دەخوات و کانی ئاوی لێ هەڵدەقوڵێو هەندێ جاریش ووشك دەبێو، کیژ شایی لە سەر کانیو کانیاوان دەکەن و سوڵ لەپێدەکەن وبەپێ خاوسی شایی ناکەن و سوڵیش وەستای خۆی هەیە بیدروێو بەبێ هەق دەست کارناکات و مریشك هیلکەدەکات بەڵام پێویستی بەدان هەیە تاکو هێلکە بکات و سەپانیش گەنم دەکوتیو بە بەر بای دەدات تاکو کاو دانەکەی لەیەکتری جودابینەوە.

ئەم چیرۆکــە لە بارەی ناوەرۆکــەوە گەلێــك سادەیــەو دەگــەرێتــەوە بۆ سەردەمێکی زووی ژیانی نەتەوەی کورد کە مەرداریو کشتوکاڵی زانیوەو جارێ پشــەســازییەکی وای نەبووە، مەگەر سوڵدرووەتی بە پیشەسازیی سەرەتایی دابنێـین کەچی لە نمــوونــەی (أ)دا پتــر پیشــەسازیی پێوەدیارە چونکە ناوی ئاسنگەرو کوورەکەیو کێردی تێداهاتووە.

،خوێنەری بەرێز، ئەمەبوو لێکۆڵینەوەیەکی خێرا لەسەر چیرۆکی گیانداران لە ئەدەبی فۆلکلۆریی کوردیو بنیـاتەکانیو ئێمە تاکو ئێستاکە گەلێك جار لە سەرچــاوەی هەمــە جۆری زانستی فۆلکلۆردا چاومــان بە ناونیشــانی باسێکی کورتیلەی ئەم جۆرە چیرۆکانە کەوتووە، بەڵام تاکو ئەمرۆ کەسێکمان لە نووسەرانی کورد نەبینیوە، شتێکی وای لەسەر ئەم دیاردەیەی دروست بوونی بنیاتی چیرۆکی گیانداران نووسی بێ، بەتایبەتی چیرۆکی هەرەمیو پەیژەییو زنجیرەییو تەریبی، بۆیــە من لێرەدا ئەم تاقیکــردنــەوەیــەم کردو دەشــزانم تەنیــا هەوڵدانێکــە بۆ لێکۆڵینەوەی فراوانترو بە پێزتر لە بواری ئەدەبی فۆلکلۆریی کوردیدا.

**پەراوێزو سەرچاوە :**

١. کاظم سعــد الدین ـ الحکــایة الشعبیة العراقیة ـ دراسة ونصوص ـ بغداد ١٩٧٩، ص ٤٧

٢. یوری سوکــولوف ـ الفــولکلۆر قضــایــاه وتأریخه ـ ترجمة حلمی شعراوي وعبد الحمید حواش ص ٢٧

٣. هەمان سەرچاوە، ل ٢٧ ، [القاهره ١٩٧١]

٤. الفولکلور ـ دراسة في الانثربولوجیة الثقافیة ـ ط ١ القاهرة ١٩٧٥، ص ٥٢٤

٥. د. عبد الحمید یونس ـ الحکایة الشعبیة ـ بغداد، ص ١٠

٦. هەمان سەرچاوە ، ل: ١١

٧. کاظم سعد الدین ـ الحکایة الشعبیة، دراسة ونصوص ـ بغداد ١٩٧٩، ص ٩

٨. عبد الحمید یونس ـ الحکایة الشعبیة ـ بغداد ص ١٥

٩. غازی العنتیل ـ الفولکلور ماهو ـ القاهرة ١٩٦٤، ص ١٧٦

١٠. د. عیزەدین مستەفا رەسووڵ ـ لیکۆڵینەوە لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی چ ٢ سلێمانی ١٩٧٩، ل: ٢٦

١١. الکزاندر هجرتی کراب ـ علم الفولکلور ـ القاهرة ١٩٦٧، ص ١١٥، ترجمة: رشدي صالح.

١٢. د. عیزەدین مستەفا رەسوول ـ لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی چ ٢، ل ٢٦،٢٥

١٣. کاظم سعد الدین ـ الحکایة الشعبیة، دراسةو نصوص، ص ٢٩

١٤. هەمان سەرچاوە، ل: ٣٣

١٥. بڕوانە ـ سەرنجێك لە دەروازەی فۆلکلۆری کوردی ـ نەقابەی مامۆستایان ـ لقی هەولێر، ل: ١٧

١٦. بڕوانە ـ عومەر ئیبراهیم عەزیز ـ ڕێوی گەرمیان و کویستان ـ بەغدا ١٩٨٤، ل ٤٥ ـ ٥٢

١٧. بڕوانە ـ تیتیلەوە ـ بیبیلە ـ عومەر ئیبراهیم عەزیز ـ بەغدا، ١٩٨٠، ل: ٣٤ ـ ٣٧

١٨. بڕوانە ـ جارێکیان ـ دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی ـ بەغدا، ل ١٢ ـ ١٥

١٩. بڕوانە ـ سەرنجێك لە دەروازەی فۆلکلۆری کوردی ـ ل: ٨

٢٠. سەردۆڵ : کەوڵی نان کردن

٢١. بڕوانە ـ احمد أبو زید وآخرون ـ دراسات في الفولکلۆر ـ القاهرة ط ١

٢٢. بڕوانە ـ عومەر ئیبراهیم عەزیز ـ ڕێوی گەرمیان و کوێستان ـ بەغدا ١٩٨٤، ل ١١ ـ ١٢

٢٣. بڕوانە ـ عبد الرحمن نەقشبەندی ـ هەبوو... نەبوو ـ بەغدا ١٩٨٠، ل ٢١ ـ ٣٦

٢٤. بڕوانە ـ عومەر ئیبراهیم عەزیز ـ ڕێوی گەرمیان و کوێستان، ل ٩ ـ ٢١

٢٥. مەبەستی لە گوندیل : مشکەکەیە، لەبەر بچووکیو خۆشەویستی مریشکەکە وای پێگوتووە.

٢٦. بڕوانــە ـ کۆمەڵە چیرۆکی فۆلکلۆری کوردی [هەبوو... نەبوو] عبد الرحمن نەقشبەندی (ل ٢٥ ـ ٣٦)

٢٧. ئەم دەقــەم لە چلەکــانــەوە لە کتێبی خوێندنەوەی کوردی ـ پۆلی دووەمی سەرەتایی بەرچاو کەوتووە، کەچی لە جیاتی مانگا ئەو کاتە ووشتر بەکارهاتبوو. بەڵام ئەمرۆ لەناو خەڵکەکەدا لە کاتی گێرانەوەدا لە جیاتی ووشتر بووە بە مانگا. ئەمەش لەبەر کەوتنە بەر کاریگەریی دەوروبەرە، چونکە کورد بە زۆریی مانگای هەیەو ووشتری نییە

٢٨. بڕوانە ـ کاظم سعد الدین ـ الحکایات الشعبیة العراقیة، دراسةو نصوص ـ بغداد ١٩٧٩، ص ٩٨

٢٩. من لەتــەمەنی منداڵیمەوە، واتە: لەناوەراستی سییەکانەوە بەم جۆرە دەقە گوێم لە بەندە دووبارەبووەکانی چیرۆکەکە بووەو لەبەرم کردووەو لەشاری کۆیە بەم جۆرە دەگێردرێتەوە.





# دێو ئەفسانەو سەربردەی مرۆڤ (١)

• خالد جوتیار •

## - ئەفسانە -

تا ڕۆژی ئەمڕۆمان لەگۆڤارو ڕۆژنامەو کتێبی چاپکراوو کۆڕەکان گوێمان لە زاراوەی - ئەفسانە - دەبێت بە زۆریش لەجێی خۆی بەکاری ناهێنن، یان لەگەڵ زاراوەکانیتردا تێکەڵیدەکەن، چونکە تائێستا ئێمە لەمەودای زاراوەکانمان نەکۆڵیوەتەوەو ڕاوێژمان لێ نەکردوون. هەر بابەتێکی فۆلکلۆری لەتوانای ئەندازەیی مرۆڤ بەدەرو هەر کارێك یان بەرهەمێك پڕ بە پێستی واقیع نەبێ - ئەفسانەی پێ دەڵێن. زانایانی ئەنترۆپۆلۆژی خوازو ئەفسانە ناس ماوەیەکە مەودای ئەو زاراوەیان دەست نیشان کردووە ئەگەرچی بە پێی هەندێ بۆچوونیشیان تەماوی ترین بەشی زانینە .

ئەفسانە ئەگەرچی لێرەو لەوێ تارمایی کەوتۆتە بابەتی خەرافی بەلام سنووری پتەوو هێمای مەودابینی بە قەوارەی خۆی ناباتە بوارێکیتر بابەتێکە گەر تێکەڵاوی بوارەکانی تریش بوو بەشێوە خۆی دەگونجێنێو ڕەمزو بۆ چوونەکانی هەر دەپارێزێ.

ئەو ڕووداوە لەمێژینانەی دەکەوێتە ئەستی مرۆڤ یان ئەوانەی لەڕێی گێرانەوەو بینین شوێنی کارەساتێکیتر هەڵدەگرن و پێداویستەکانی ژیان لەوەختی لێناگەرێ چەکەرە بکات و ببێتە هەلوێستێك بەدرێژایی تەمەن و بۆ ئەولاش دادەکرێو لەبونەو شوێنی خۆی لەرامان و بەخۆداچوونەوەو بینایی‌یەکی خودیانە بێ یان دیاردەیەکی دەرەوە دەبوژێتەوەو ئێستای دواڕۆژ دەکاتە شێوازێکی بەرپێچراو هی ئەوەیە بە جۆرەها چەشنیش زەمینی بدرێتیو لەگەڵ پێداویستە مادیو ڕوحیەکانی سەردەمانێ بیگونجێنێ، گونجاندنەکەش دوا لێکدانەوە نی‌یە.

بابەتی ئەفسانە لای هەندێ لە واقیعەوە چەکەرە دەکا، زەمانێ رووی داوە بەلام لەهێنانەوە پێشی بێزەمانی پێشان دەدا ئەو بزرکردنەی مەودای مێژوو، وای لێکردووە ببێتە بابەتی سەردەمەکان.

ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن ئەفسانە دێرزەمانێ ڕوداوێکی ڕاستەقینە بووە، یان نزیکە هەستی مرۆڤ بووە. بەدرێژایی ڕۆژگاران بوەتە بەرهەمێکی میتۆلۆژیایی بیری خەلك، تەنانەت پالەوانە هەڵس وکەوت خەرافیەکانیش لە مێژووی بیری ئەو نەتەوەیە ئاکارێکی تریان بووە بۆیە ئارکیۆلۆژناسەکان لەڕێی مەودای زانستی خۆیانەوە دانیان بەو ڕاستی‌یە ناوەو پەیکەری گەلێ خواوەندیش دۆزراوەتەوە.

لە ئەفسانادا زەمانێکی تایبەتی و زەمانێکی گشتی هەیە توانای



دووبـاره بوونـەوەو نەبـوونـەوەی لەگـەڵ ئێستـاو تایبەتیەکانی فۆرمە گشتی‌یەکەی دەمێنێتەوە ـ ئەفسانە بەزمان پێك دێت بەلام ئەو زمانەش رۆژگار لەگەڵ گۆرانەکانی خۆی دەیکێشیتە سەر دەم تەنیا ناوەرۆکەکەی پێ دەپارێزرێ. ئەفسانە وەك پێشتریش زەینمان دایێ لەبنەرەتدا شوێن و زەمان بەرەو گەیشتنە مەبەستێکی نوێ دەبا لەنهێنی‌یەکانی گەردوون دەگەرێ بە سروشت و مرۆڤەوە.

مادام خەون و حەزەکانی مرۆڤیش وەك پێویست ناهێتە دی، ئەو بەرهەمە بەمیرات بەجێماوانەی لەگەڵ رۆژگاری خۆی دەباتە ئایندەیەکی هێشتـان نەهـاتـوو، چارەنووسی نادیاری خۆیەتی لەگەڵ هێزی ناوەوەو دەرەوە، بەپێی ئەو بیروڕایانە ئەفسانە بەندی دونیای خواوەندو خولقان و لێکدانەوەی نهێنی‌یەکانی گەردوونە.

ئەفسـانـە نەمـرەکـانی کوردیش ئەگـەر بەردەستمـان کەونـەوە سەرچەلەی بیری لەمێژینەی بینایی لە دنیا گەیشتنی ئەو مرۆڤە داهاتی سامانی نەتەوایەتیمان مەزن تر دەکات.

دەوروبـەریش مرۆڤ قاڵتر دەکەن و تایبەتیەکانی بیری خەستر دەکـەنـەوە، لێیـان ورد دەبێتـەوە، قەپێلکی ناوچە بەندی ژیان و بیرە دەپـەرلێنیتـەوە ئاسـۆیـەکی گەشتـر: داهێنـانیش هەر هی لایـەنێکی دیاری‌کراوی ژیان نی‌یە، بە پێی رۆژگارو قۆناغەکانی بەرایی ئادەمیزاد دەبینرێ یان هەستی پێ دەکرێ.

ئەفسـانـە جۆرێکـە لەخۆیی کردنی هێماکانی دونیا، ئاشنایەتی پەیداکردنە لەگەڵ هێزەکانی ئەولای سروشت و ئەوانەی بە پێی بۆچوونی ئەفسانە مایەی رێکخستن و ئاژاوە بەرپاکردنی دنیایین و زانایانی وەك «مـارونیکتین و مینوروسکی‌و لاسکۆ هەر وەها نووسەری گەورەی کورد عەرەبی شەمـۆ ئەفسـانەیان کردووە بە کەرەسەیەك بۆ ساغ کردنەوەی

هەندێ بیرو باوەری ئاینی کۆن و تازەی کوردو ئۆبرەزەکانیش دێوو درنج و پەریو رۆژو مانگ.... هتد...».

پێشینـان باوەریـان وابـوو خواوەنـدێتی حاڵەتێکی سروشتـە، سروشتیش لەگـەڵ هزری کەسانی کۆمەڵگایەك تواوەن، خۆگونجاندن و دژایەتیکردنی سروشتیش بنەمای لێکدانەوەو دونیابینی مرۆڤ دەباتەوە ئەولای کاری سادەییو سەرچیغ ڕوانینە ژیان و پەیوەندیە شاراوەکانیو خۆی لەگـەڵ بیری مرۆڤ بونێکی تواوەیە. سامی رووکەشی سروشت بە دیاردەکانیەوە ترسێکی پەنگ خواردوی لەخۆی مەزنتری لەگەڵە، توخمی بنچینـەکـانی دروست بونی بەرایی تووشی هەروەستـەی دەکـەن. ئەو نهێنییە گیانیەی بەینی ئەوو سروشت بوەتە ئەو گرێیەی بیر گەردانی گەیشتنە مرازو ویستەکانی بێ.

دیارە ئەگەر توانیمان ئەفسانەو حەکایەتی خەرافو بەشەکانیتر لێـك هاوێـرین دەتـوانـین زانستیـانەتر بەرهەمە سەرزارەکیەکانمان هەڵسـەنگێنـین و بەراوردیـان بکەین، بە تێکەڵاو کردنیان لایەنەکانیتر دەدۆزینـین و ناتـوانـین سەرەتای میتولوژیای کوردیش دەست نیشان بکەین. بۆیە چەند بە وردی زەمین بدەینە سامانی نەتەوایەتیمان ئەوەندە لەریشەو پنجە بەراییەکانی بیرکردنەوەی پێشینانمان نزیکتر دەبینەوەو خزمەتێکی بەهادارتری ئەو کەلەپوورە لەبن نەهاتووەش دەکەین.

### دێو لە مۆتیفەی ئەفسانان

لەوەتی مرۆڤ خۆی لەسەر ئەو زەویە بینیوەو چەنگە پڕی خودو سروشت و دیاردەکانیتر بوتەوە مەیلی سەربردەی ئەو گەڕان و کاروانە بەهادارەی لێ بوەتە ئەو مێژووەی خۆی بە خاوەنی دەزانیت و ئازاریشی دەدا.

چ لەسەر بردەی دروست بوون و خولقانی هەوەڵین جاری سروشت و ئاسمان و مرۆڤ سەیرترو تەماویتر نیە. وای دەنا کەسێك بیدیبا ئەو گەردوونـە چۆن دروست بوو، ئەو زەویە لەکوێوە هات تا ئەوها لەنگەر بگرێو خۆی بخێوینیتە ئەو قەرارەی ئەمڕۆ دەبینین، بۆیە ناهەقیش نییە ئەوەندە لەنهێنی ئەو گەردوونە بترسێو شەیدای گەیشتنە مەبەستەکانیشی بێ هەر لە عارد لەرزین و بورکان و لافاوو بروسك ڕابیگرە هەتا دەگاتە شەمـاڵی فێنك و نمەی باران و پێك نەچوونی بنیادەم و سەین و بەینی دەروونیو مەرگ و ژیانیش.

پیرە منداڵی یەکەمین چۆن پەروەردەکراو قۆناغەکانی تەمەنی بە چ گەیـانـدە ئەو رۆژەی ئەو هاوسـەرەی لە ئامێـز بگـرێو رەگ و تۆوی مرۆڤایەتی ئەوها زەمین بەند بکاو دەشبێ وەك ئەفسانە دەیگێڕیتەوە لە

تۆپە قوڕی دەستی کیهان خواوەند سازا بێو ئەوگیانەی پێرەوادیترابێ - مرۆڤ مەبەستی چۆنیەتی خولقانی خۆی نییە تۆوی بەرایی بنیادەمی لێبوەتە ئەو کەسەرەی هەر بەتاسەوەیە بزانێ چۆن و کەی پەیدابوو، بۆیە سەرلەبەری نەتەوەکانی ئەو دونیایە ئەفسانەی جۆراو جۆریان لەم بارەوە تەخشاندوەو هەوڵیان داوە بە پێی تێگەیشتن و بیرو بۆچوونی بەراییان لەو نهێنە ئەمرە بگەن. ئەفسانەی کوردیش ئەگەرچی لەگەڵ بلاو بونەوەی ئاینی ئیسلام تارماییەك دونیاو رەمزەکانی داگرت بەڵام ئەگەر هەندێ بە وردیو خوستی زەمینیان بدەینێو لەگەڵ بیرو بۆچوونی ئەو ئاینە بەراوردی بکـەینـەوە هەست بە بزوتنـەوەی نەمـەیـوی لێکـدانـەوەو هەڵوێستی سەردەمێکی خۆمـان دەکـەین، کە لەگەڵ هەڵکەوتنی باری دەروونیماندا دەگـونجێو هی ئەوەیـە سەرەتایەکی مەیلەو واقعیانەی لێ هەڵکرێنین و بیکەینە ڕکەو پاڵپشتی بناغەی ئەفسانەی کوردی، کە بەراستیش بابەتی وا پێویستی بە دەق و بەڵگەی راستەو خۆ هەیەو یەکێکە لە کارە نەمرەکانی دونیای بیری سەردەمایەکی کوردی.

دیارە هەر پێرەوێك یان بیردۆزێکی نوێش گەرانە بە دوای گەیشتنە ئەنجام و پەردە هەڵدانـەوەی بابـەتی شاراوەیەو هەر لەم ڕێگەشەوە بابەتە بەر باسـەکە ڕوونترو گەش تر دێتەوە دونیای لێکدانەوەو مل ملانێی ژیان بەجۆرێك لە جۆرەکانیش بەشداری کاروانی ژیاری مرۆڤایەتی دەبێ.

هەر جولانەوەیەکی دیار یان ئەوانەی بە بیری مرۆڤ دادێن پێشبەرەی هۆکـاریکە دەشبێ کۆ هۆیەکی زۆر بەڕوون و بزریەوە مایەی خولقانی بابـەتێك بێ جا ئەو بابەتە شتێکی دیارو بەردەستەیە یان هەڵوێستێکی دەروونی. هەر بەرهەمێکیش ئەگەر راستەو ڕاست ناوەرۆك نەداتە دەست و نەبێتە شتێکی ڕەمەکیانە نابێ بە بەرهەمی هورێنەویست و بەرەوازی دابنێین و لە دونیای هەستی مرۆڤایەتی توریدی بکەین.

دونیای بیرو یادو کێشەکانی ژیان لە مرۆڤەوە دەست پێ دەکاو بە مرۆڤیش کۆتا دەبێ.

ئێمە ئەفسانە بە مولکی بیریو ژیری نەتەوە دادنێین و لەڕووی بوونیەوە بە بەشێکی میراتی بەردەوامی هزری باس دەکەین، لەوێشەوەرێچکەی لێـژو ڕکی گۆڕانـەکـانی لێ دەبنـین، بێسنووری بیرکردنەوە لەوەیە لە ناوانێکی هێـڵ بەنـد نامەییو هۆکارە دەرەکیو ناوەکیەکان بەردەوام لە کۆڕی ژیان و حەزەکانی مرۆڤ دەسازێن.

تا ئێستـاش زۆربـەی دەقە ئەفسانەییەکانمان ئەوانەی وەختی خۆی کارێـکـی ڕووداوی ڕاستـەقینـە بووینـە بەگـێڕانـەوەی سەرزاران گەیاندویانەتە پلەی پیرۆزیو لەگەڵ زەینی ئەفسانەیی تێکەڵ بووە ئەوەی بەو پلەیەشی شادکردووە خۆشەویستیو یادی بێپایانی مرۆڤە دەرهەق بەو کارەساتەیان کەسێکی پاڵەوان، دەشبینین گەلێ ڕوداوی مێژوویی یان کەسانی پاڵەوان و نزیکە گیانی خەلك ئەوانەی کاری پیرۆز یان چەپەڵیان

لەرادەبەدەرن مۆرکی ئەفسانە هەڵدەگرن و تێکەڵی بیری میتولوژیایی ئەو نەتەوەیە دەبن.

کەچی هەندە جاریش لە دونیای ئەفسانە دەترازێو ئەرکی بەرایی خۆیو دونیای کارەسات و رەمزەکان رادەکێشتە بەرباس و خواسێکی ناتەبا لەگەڵ هزری ئەفسانان.

دەشبێ ئەفسانە هەر ئەو خووە پیرەی هەبێو لە قەرارێکی قەوارەبەند نەوەستێو لەگەڵ پێداویستە مادیو گیانیيەکانی مرۆڤ پەرە بسێنێو خۆی بگونجێنێ...

پەیوەندی مرۆڤ بە سروشت و دیاردەکانی جۆرە ژیانێکی ئاکار تایبەتیشی لێ سازاندووەو خولیای مرۆڤی بەرەوڕامان و بینایی‌یەکی مەزن بەرزکردۆتەوەو ئەگەر بەوردی زەینی بدەینێ هەست بە ڕووداوی بەرەو ڕوودان یان هەوڵی بەقووڵی تێکەیشتنی پەیوەندی‌یەکانی سروشت دەکەین.

لەبەر هەندێ ئەو ئەفسانانەی ڕێچکەی دینداریو خواوەندەکان و دیاردە تەماویەکانی گەردوون دەگرن هونەریانەتر دێنە ڕوو لەوەی بەرهەمێك بۆ شەو بەسەربردن و ڕەچاوکردنی هەلویستێکی کاتی بێ.

ئەو زەمانەی لەئەفسانان توانای دووبارەبوونەوەیان هەبێ ئایندەی ئەوکاتانەیە لەکاتی خۆی پێش بینی بۆ کراوەو هەوڵی تێکەیشتنی پەیوەندیەکانی دراوە، ئەو زەمانە گیانی بەردەوامی بە ئەفسانە بەخشیووە مۆرك و ناوانی بەڕووداوی جارێ ناڕوداو پەیژە کردووە.

کاتی ئەفسانە لە گێرانەوەشی کەمترە، دەتوانین پێی بڵێین کاتی ناکات یان کاتەکان. مێژوو بزرکردنیش جۆرە هونەرێکە گیانی مەودا فراوانی ئەفسانەی نەمرتر کردووە.

ڕووداویش وەك خۆی ناگێرێتەوە یان گێرانەوەی کارێکی زەینیە پێویستی بەوە نی‌یە کارەساتێکی جولەدار یان مەیوو بکاتەوە بابەتێکی گۆتەیی‌و ڕوحە درامیەکەی بکوژێ.

یان پاڵەوانەکان بەندی دونیای سستی‌بکاو بە مۆمیاکراوی بێتە بەرچاوان، بۆیە پەنا دەباتە بەر کاری لە دەروون وەشاوەی بەرایی، حەزی ئەفسانە خوان نزیکە هەستی خەڵکیشە، ئەو بیروبۆچوون و ویستانەیە مرۆڤی ئاسایی ناتوانێ بیانکاتە بابەتێکی هونەریو دەقێکی ئەفسانەیی لێ پێك بهێنێ.

دێوو هەموو شتە غەیبی‌یەکانی‌تر دەسکردو ئیفرازی عەقڵی بنیادەم خۆیەتی، هۆکارێك یان چەندان کردویانەتە شتێکی نزیکە ژیان و لێکدانەوەی مرۆڤ بۆ هەر مەبەستێکی دیارو بزربێ.

ئەو دێوەی ئەفسانەخوانێك بۆ مەبەستی لەخۆ گەیشتن و لەزەت و بەرزکردنەوەی پلەی بەهای مرۆڤ دەیهێنێتە گۆڕێ، هەندە جاریش بە شتێکی بێ‌دەسەلات و نابووت دەچێ لەهەمان کاتیش مرۆڤ لەو پایە خودیەی دەترازێنێ کە دەبوا لە شێوەی هێزێکی بەرگەگرتووی دژواری لامل دابێت کە لەلای ئەفسانە خوان دڵگیرترین و سامناکترین چرکەی ئەو ئەفسانەیەش ئەو وەختەیە ڕووبەڕووی ئەو هێزە سەرەکیە بۆتەوە، لەوێ ترس و مەرگ و هیواکانی مرۆڤ دەگەنە خالیکی تێك پەڕیوو تەنها سەرەنجام دەتوانێ پەیوەندیە بەرایی‌یەکانی ڕوونتر بکاتەوە.

دێو یان /دەیڤە/ی daiva ـ ئاڤێستایی زۆرجارانیش بە واتای ـ ئەهریمەن ـ دوزەخ ـ خراپەو شەڕیش هاتووە، کە لە ئەفسانەی کوردیش دا هێشتان بەو مانایە بەکاردێن و لەڕووی بزوتنەوەی بیری ئەفسانەش هەندەجار وایە هەر هەموو مانا لێك نزیکەکان دەگرێتەوە، ئەووەختە دێوو شوێن و زەمان دەبنە کارێکی تەواوەی وا هەستی شلەژاوی پاڵەوانەکە لە بەهای جوانی بروتێنیتەوە یان بەرەو ئەو جوانی‌یە بچی.

لەڕووی واتاشەوە خەلکی عادەتی بە یەکێك دەڵێن دێو هەندەك نەفرەجاو لامل و دەست نەپارێزو شێوە عەنتیکە بێو بە خەڵکی بنەبان ویست و پلان دانەری لەبنەوەش دەڵێن داکەدێو، ئەو پەیوەندیە لای مرۆڤی کورد تاراپۆش نی‌یە، دڵنیایە ئەو پلان و ڕێچکە هەڵگرتنەی دەرهەق ژیانی ئادەمیان کەسێکی ڕاوێژکارو لە تاقی‌کردنەوان جاقی دەسڕازی گرتووەو ناراستەیان دەکات، نابینی ئەفسانەخوانی کورد کە باسی ئەشکەوتی دێوان دەکا دەڵێ:ـ

«ئەحمەد تەمەشای کردێ دەبینی وا دێوەك دانیشتیە لامەکی چۆپەی بەلای ڕاستی دادایە، هی لای ڕاستەی بەلای چۆپەی دادایە لەبەر قوناگرێ خۆی گەرم دەکاتەوە».

ئەم شێوە بنیادەمیانەی دێو لەمیتولوژیای کوردی بەخواوەندە کۆنینەکانی لاپەڕان دەچێ کەمرۆڤ سەردەمانێك بۆ بەختەوەریو هێنانەدی ئاواتێکی بەرەزامەندی خۆی کڕنۆشی بۆ دەبردو قوربانی بۆ دەدا ـ کارە لایی‌دەیەکانی نەستی مرۆڤ لە دەقێکی واو لەسازاندنی دونیایەکی پڕ گرێو مەترسی‌و بنەڕەتە لابەلاکانی هزر دەبێتەوە ئەو ڕۆژگارانەی هورینەکانی لێ دۆڕاو بەنارەزامەندی خۆی خزایە تەونێکی ترو هێشتانیش بەرێکی تێیان ناگات و سەری لەهەموو نهێنی‌یەکانی دەرناچێت.

هەر مرۆڤیش کە لە خواوەندێکی خۆی هەڵدەگەڕێتەوە، هەستە نهێنی‌یەکانی بەینی خۆیو ئەو لە ئاکارێکی غەیبی بیران دوور دێتەوە یاد. ئەوەی ئەفسانە بۆ دێوی دادەنێو ئەو دەورە سامناکەی بەخشیوەتێ ترسێکی دەروونی بەسالان کەوتووە، نەك شێوەو هەڵکەوتنی

فەسلەجیانەی، لەزۆر هەلس و کەوت و شێوازی ژیانیشدا هەر بەتەواوەتی باسی دونیای ئەولا دەکاو وێنەی دۆزەخی دونیای هەستی مرۆڤە، ترسی ئایندەی نادیارو پڕ گێژەنە، مرۆڤی سەراولێژ هەلواسراو، ژووری یەك لەناو یەکی کلیل وون، ئاوێ سوورو سپی‌و ڕەش، دڕندەو جانەوەرو سفرەی ڕازاوە، .

دەنگی غەیبیش زۆر جاران ئاقیدەی مرۆڤی لە ڕوویەکەوە گۆڕیوەتە باریکی‌تر لە مێژیشە مرۆڤ ئەم خولیایەی کەوتۆتە سەرو دەیەوێ تێ‌ی بگا، ئایا دەنگی تواوە لەم گەردوونە هەیە یان هۆکارە نهێنێ‌یەکانی دونیا لەحزەیەکی پەنگ خواردووی لەم ڕووەی دەبەخشیتێ.

ئەو دەنگە غەیبی‌یانەش هەندە جاران هاودەمی هەستی غەریبانەی مرۆڤە ترس و تەنیایی‌و نیگەرانی لە هزری بە خەیاڵ چووی مرۆڤی نزیك دەکەنەوەو ئەو حاڵەتە لەناو یەکانە تووشی هەر وەستەی دەکەن و لەناخیدا گێژەنێ دەیگرێ‌و خۆشی ون دەکا.

دیارە ئەفسانەخوان دەیەوێ لەڕێ‌ی بیرو بزووتنەوەی پاڵەوانەکانی لەلایەنە جۆراو جۆرەکانی نزیك بێتەوە بۆیە دەوری جیاجیاش هەڵدەبژێرێ‌و هەموویشیان بەرەو مەبەستێکی سەرەکی دەچن وئەو لای روکارە دیتراوەکانی دێنێتە بەر خەیاڵی خۆی.

دێویش لەو سەین و بەینەی مرۆڤ گەرانی لابەلای مرۆڤە، دەیەوێ لەو ڕێگەوە بگاتە هەقیقەتی بوون و پەیوەندیە بزرەکانی، بۆیە لە سروشتەوە دەست پێ‌دەکا کە لای ئەو تەماوی‌ترین دیاردەی گەردوونە، ئەو هەست بەتەنیایی کردنەی مرۆڤ بۆ سەردەمانیکی دوور کارێکی ئاسانیش نەبوو.

لەڕووی شوێن و چۆنیەتی ژیانیش ئەفسانە خوان دەیەوێ لە دوو مەبەست نزیك بێتەوە ئەوەشیان مەبەستی دوورو نزیکە یان مەبەستەکانە کە لەدوایی‌دا دەیکاتەوە سیفەتێکی تایبەتی بۆ هەر دیاردەیەکی خوایی یان غەیبی.

ئێستاشی لەگەڵدابێ هەر ئەشکەوتێك دەبینی یەکسەر دێوت دێتەوە یاد، کچی ڕفێنراوی ڕۆژگاران، خەیاڵت بەرەو چەندان نهێنێ دەرواو ئەوشوێنە لاچاپانەت لادەبێتە پەرستگایەکی لەبەر دەستان دوورو ڕازگری نهێنی‌یەکانی مرۆڤ.

دیارە ئەوەی ئەو کێشەیەی ژیاری مرۆڤایەتی گەیاندە پایەی ئەمرۆی حەزی گەلێکیشی خستە مەترسی‌و زۆرانیشی لە پەراوێزان بەجێ هێشت. مرۆڤ کاتێ بەلای کەلاوەیەك دا ڕەت دەبێ لە خەیاڵی خۆی بە ئاوەدانی دەبینی (بۆیە ترسی لێ‌پەیدا دەبێ) هەست بە بوونی ژیان دەکات، دیاردەیەك لە دیاردەکانیش لە هەموویان زیاتر سەرنجی ڕادەکێشێ‌و زەینی دەخرۆشێنن.

ئەشکەوت سامی لەوەش گرانترو پڕ گرێ‌ترە، پەناگای دەستی ڕۆژگاری پڕ کێشەیە، ژیانی لاپەڕو گۆشەگیرو سروشت ئامێز خەیاڵ بەندیشە،

مرۆڤ لە تەنیایی‌و بیرکردنەوەو کێشەی هوشیاری‌و نەست ئازارێکی زۆر دەچێژێ‌و هێشتان هۆکارێکی فیزیکیش نەدۆزراوەتەوە خەیاڵ بکاتەوە چەند دیمەنێکی تێك شکاوی بەرچاوان و لەگەڵ دیاردەو کارە بزرەکانی سروشت بیسازێنی.

ئەشکەوتیش هەر لە دێر زەمانەوە بێشکەی مرۆڤ و ژ یانی مەلۆتکەیی‌و خواپەرستی‌و بێزاری‌و ترسی لێ بەسەر بردووەو لە ڕۆژگارێکیشدا لە دەستی چووەو ناشزانێ چی‌لێ بەجێ‌هێشت وچی لێ‌بوو، تارمایی‌یەکی نهێن سازو کەی ئاشناشی دەبێتەوە.

نزیك بوونەوە لە دونیای دێوان و ئەشکەوت و مرۆڤ و تاریکی‌و ترس لە گەلێ هەلۆێستی ئاقیدەیی سەردەمانیکی مرۆڤمان نزیك دەکاتەوە، لە هەندێ مۆتیفەی ئەفسانانیش نهێنی ژیان و بەختەوەری‌و گەیشتنە ئاوات لەگەڵ نهێنی‌یەکانی دێو تێکەڵ و نزیکن، بۆ نموونە «هەبوو نەبوو پاشایەك هەبوو کوڕەکی هەبوو ژنی نەدەهینا، هەر دەیگۆ بابە ئەمن هێلکەی نامێم دەوێ، پاشا دەیگۆ کوڕم لەچیای ڕەشە بەمەنایێ زۆر جێگای دوورە لەکن دێوێ ڕەشیشە»

ئەوەی ئەفسانەشی لەحەکایەتی تر جیا کردۆتەوە، ئەفسانە ناوەرۆك و بۆ چۆنێکی ئاقیدەبەندی هەیەو مرۆڤ لەبەرامبەریان هەلوەستەی خۆدواندن و پێك چوون و ڕێچکەی باوەڕو دینداری دەگرێ، مرۆڤیشی لێ دەبێتە ڕێ پیشان دەرو ڕوون کەرەوەی مەبەستە پیرۆزەکانی.

زۆر جاریش بیر لەوە دەکەمەوە ئەو نەتەوەی ئێمە بۆ ئەوەندە متووی دونیای ئەو گیانداری ناگیاندارەیەو دێویشی پێ دەڵێ، دەیەوێ چ بیرو ڕایەکی بینایی‌یانەی خۆی پێ دەربڕێ، ناخی خۆیەتی یان ڕۆژگارێك بنەمای ویستە نەمرەکانی بووە.

هەر چەندە زۆر جارانیش دەبێتە هاودەم و پشتی مرۆی زۆر لێکراو بەلام هەقایەت خوان قەت وەك هێزێکی چاکە خوازو خۆشەویستی یەکاویەك باسی ناکا، ئێمە ئەو لایەنە تەنیا لە کەوە هونەریەکەی دەربڕین دەبینینەوەو هەستی پێ دەکەین.

نهێنی مانەوەی ئەفسانەش لەوەیە هزری هاوچەرخانە هەڵدەگرێ‌و فریای زەوقی مرۆڤی سەردەم دەکەوێ با تووشی ناتەباییشی بکا.

دێوەی بە حیسابی ئەفسانەی کوردی دوورە ژی‌و لاتەرێك و هەست سوارو ئاوەدان بەسەرکەرەوەیە، هەر وەك مرۆڤ باسی دەکرێ، قاچ و دەست و چاوو ئەندامی زاوزێ‌و بیرکردنەوەش بەلام لە دەسەلاتی ئەو هێزاتر مرۆڤە پاڵەوانەکەیە، بنکەی گۆڕاندنی دەسەلاتیشە بۆ کەسانی هێمن ترو هەر لە شێوە شەرانیەکەی نامینێ تەرازووی دادپەروەرانەش لە ڕۆژگاری ناهەمواردا هەڵدەنێ، بەلام ئەمەیان کە مۆکردنی هێزە بەرەو چاکەو لە هەقیقەتدا مرۆڤ خۆیەتی.

هەر بۆ نموونە «ئەحمەد هەستا کەژاوەی هەربەستا، هەرپێنجیان سواری

کەژاوەی بوون، دێویش لە پێشیان دەڕۆیشت هەتا گەیشتنە ئەو شارەی بابێ ئەحمەدی لێ ئاشەوان بوو سبەینێ خەلك هاتنە تەمەشایان پاشا گوتی ئەوشۆ ئەو زەلامەی دەكوژین و ژنەكانیش لۆخۆمان دەبەین، هێوارە داهات دێوە كاریتەكی گەورەی هینا كنەخۆی، شەوێ خورامێ پاشای هاتنە سەریان دێوە زۆری لێكوشتن، سبەینێ دێوە بەناو شاری كەت پاشای كوشت و بابێ ئەحمەدی بوە قازیو دێوەشی بەرەڵلاكردو گەراوە جێی خۆی».

ئەفسانە خوان مرۆڤێك یان چەند پاڵەوانێك بەباری دژایەتیانەوە هەڵدەبژێرێ، تا بتوانێ لە مەبەستە سەرەكیەكانی خۆی نزیك بێتەوەو شتێكی ئەوتۆ بلێ لەو گەردوونە دیارو روون بێو بنەچە دەروونی‌یەكانی مرۆڤ تاوتو بكات.

دێویش هەنجەتی ئازارەكانی دەروونە، مرۆڤی پشت گوێ خراوی كۆمەڵ دەیهێنێتە ئەو بارەی سەنجی زۆربە ڕاكێشن و تێیان بگەیەنن ئەوان هەر مرۆڤی زەمتەو زێدەنین و ئەگەر توانرا هێزە ناوكیەكانی مرۆ روژێن و بێنە كاخی كێشەكانی ژیان بەم جۆرە ڕووی بیركردنەوەی لیكدانەوەی كۆمەڵ دەگۆڕێن یان لە تواناد‌ا هەیە بنەمای بیركردنەوەی شەڕخوازی بەرەو چاكە ببردرێت و لەرەگەوە بگۆڕدرێت كە لە كۆتایی هەر هەقایەتێك دەیگری عەقڵی مرۆڤ بەسەر دیاردەو لیكدانەوەكانی تردا زاڵ دەبێ. دیارە ئێمە لەو نووسینەماندا مامەڵە لەگەڵ روانینی ئەفسانە دەكەین نەك بابەتێكی زانستی‌یانە ئەگەرچی دەشمانەوێ. وشیارانە زەینی بدەینێو لە پەیوەندیە نزیكەكانی ژیانی مرۆڤی بدۆزینەوە. لەو وەختە دەبێ بپرسین لە كاتێكدا دەسكەوتەكانی زانست گەلێ شتی تا دوێنێ بزرو تەماوی روون كردۆتەوە ئایا پێویستمان بەو روانینە ئەفسانەیی‌یانە هەیە !! یان مرۆڤی ئەمرۆ بەتەمای چی ئەفسانەیە.؟

هەندێ زانا دەڵێن ئەفسانە زانستی بەرایی‌یە ، مرۆڤ لەو بۆ چوونەوە ویستوێتی شتێك لەو دونیایە بزانێت و جۆری دروست بوونی لێ شارەزابێت، هەموو كەرەسەو بابەتەكانیشی. رامان و بیرو لە دونیا زانینی خۆی بوو ، بەزۆریش دیاردەكانی لە هەگەرە غەیبی‌یەكان دەبینی‌و نەیدەتوانی هۆی راستەو راست باس بكاو خەڵكیش تارادەیەك بەو هەگەرە غەیبیانەی ئەفسانە خوان رازیبوون و باوەڕیشیان پێی دەكرد، چونكە ئەو بە نیسبەت خەلكی تر مرۆڤێكی وشیارو دنیادیدەو چاوكراوەبوو، بە تایبەتیش ئەو توانا هونەریەی وای كردبوو دونیایەكی سەیر بۆ خۆی بسازێنێو هەر لەم ڕێگەشەوە بتوانێ باسی نهێنی‌یەكانی ژیانیان بكات، كە خۆیان ئەگەرچی هەستیان پێی دەكرد بەلام توانای دەربڕینیان نەبوو، هەر لەرێی ئەفسانە شەوە دونیایەكی نزیكە هەستی وای سازاندبوو مرۆڤ سەودای چارەنووسی ژیانی خۆیانی لێ ببینن و بەو

پەیوەندیە سحراویانەی رازی‌بن چونكە نزیكە خەیاڵیان بوو، تا خەیال و سۆزیش مابێ كە كۆتاییشی نایێ بیری ئەفسانەیی وەك پێویستی‌یەكی گیانی‌ی مرۆڤ لە ئارا دەبێو پەنای بۆ دەبرێت، ئەو روحە شیعری‌یەی ئەفسانان باری نیگەرانی مرۆڤە لەو گەردوونە تەماویەی هێشتان خۆی لێ بە غەریب دەزانێ، زانست ناتوانێ خەیاڵی پاراوی مرۆڤ و خەونەكانی بكوژێ، لەو پەری پێشكەوتنی زانست و دەسكەوتەكانی تەكنولوژیا مرۆڤ هۆگری گەرانەوەو غوربەت و سەردەمی منداڵی دەبێتەوە ئەو جارە.بە گیانیكی تر دێوو سەربردەی چەرخ و فەلەك و ئەسپی‌با... هتد دەبیتەوە، خۆ مرۆڤ جارێكی كە نایەوێ خواوەندێك بتاشێتەوەو وەك جاری جاران كڕنۆشی بۆ بباو قوربانی بداتێ، یان تازە بەتازە بگەرێتەوە رۆژانێ هەموو تەلی كارەبا بپچڕێنێو لەبەر چراو قۆدیلكەی پێشان دانیشێتەوە، ئەگەر كارێكی لەم بارەش بكا تەنیا هەوەس بازیو یادگارە.

خۆ دوورخستنەوەو لاچەپ گیری هەیە، بێزاری مرۆڤ ناچار دەكا لە كێشە قورسەكانی ژیان لاونیوّ بێ ، باری ژیاوی مرۆڤایەتی ئەوەندە ئاسان نی‌یە لە چاوقوچانێكدا ویستەكانت بێتە دی وەك ئەوەی مۆتیفەیەكی ئەفسانە لێی دەدوێ، ئەفسانە خوانیش خەلك فێرە تەمبەڵی ناكا ئەوە حەزی مرۆڤەو هێشتان نەیگەیشتووتێ.

مرۆڤی سەردەمیش خۆ دەبێ بە هوشیاری بێتەوە دونیای ئەفسانەو حەكایەتان، هەموو حەكایەت خوانەكان راست بنەوە ناتوانن وەك جاری جاران خەلكی لە دنیای حەكایەتان رابێننەوە دیوەخانان گەرم كەنەوە، هەر بەشێوەی جارانیشی گوێگر لەگەڵیان ناجوولێو ناكەوێتە باری خورپەو سۆزو شوون هەلگرتنەوەی.

بۆیە ئەگەر پێشان حەكایەت بۆ خەلك بووبێ ئەمڕۆ هی دەستەیەو سیفەتە میللی‌یەكەی لەخەمی كەسان دەبینرێتەوە.

ئەمرۆش نەبی پاشەرۆژ لێیان دەكۆڵدرێتەوەو پەیوەندیەكانی لەگەڵ باری هزری نەتەوە باس دەكرێن، نەك وەخت بەسەربردن بۆیە بە هەموو حەكایەت خوانەكانمان لەو چەندان ساڵە توانیان چەند شتێك بكەنە ئاكاری تایبەتی دونیای ئەفسانەو حەكایەت.

لەبەشی هەرە زۆری مۆتیفەی ئەفسانەكان پاڵەوانی رفێنراو كچە، دێوە بەرەو شوێنێكی نادیاری دەبا، لەوانەشە ئەو كچە مرازێكی نەهاتبێتە دی، یان لەژیان هەراسان بووبێ، كچە بچووكی كەسێك بێ (كە ئەم حاڵەتە لای زانایانی فۆلكلۆرناس تایبەتیەكی حەكایەتی خەرافی)یە، تا لە ئەنجامی حەكایەتەكە بەختەوەر بێ یان سەرتاپای گوزەرانی بكەوێتە باریكی رێك و بەختیارانە بژیت و خەلكی كۆمەڵەكەی تێبگەیەنێ مرۆڤی غەدرلێكراو هێزە خوایی‌یەكان لەگەڵین و لە گرفتەكانی بەهانای دێن.

كەواتە دێو ئەگەر چی هێزێكی شەڕخوازە بەلام لەو هەلوێستانەی ژیان پاڵپشتی پاڵەوانەكەیەو خۆی ویستەكانی دێنێتە دی.

حەکایەت خوان کچە ئاوات نەهاتوە دیەکەی دادەست هێزێکی نادیارو بەورەنگەش گوێگرو خوێنەر زیاتر پێی نیگەران دەبن و متووی شوون هەلگرتن و چارەنووسی دەبن، ئەو هەڵبژاردنەی کچە لەو بارە دەروونیەوە بەئاگاهێنانەوەی هەستی نیوەمری کەسانی ترە.

بۆ نموونە «هەبوو نەبوو کابرایەك هەبوو سێ‌کچی هەبوو ڕۆژەکێ دەچێتە شاری، پێیان دەڵێ کیژم هەریەکتان داخوازی خۆتان بڵێن، کچە گەورەو ناوەنجی‌و بچووك. دەڕوا... داخوازی گەورەو ناوەنجیەکە جێ‌بەجێ دەکات، هەر هی کچە بچووك نەبێ. کیژەش زۆر پێی نارەحەت دەبێ، بەعاجزی دادەنشێ بۆ شەوێ یەکێك لە دەرگا دەدابە کچە بچووك دەڵێن... دەبرۆ بزانە کێ‌یە چوو، لەپڕ دێوەك ڕفاندی‌و بردی، کیژە دەستی بەگریان و هاواریْ کرد.».

ئەو ئاوڕ لە مراز دانەوەیە سەرەتا بە تۆڵە دەچێ بەلام مۆتیفە دەیەوێ ئەو ئلواتانە لەدەرەوەی دەسەڵاتی خێزان بهێنێتە دی.

«کیـژەی بردە ناو ئەشکەوتێ گۆتی ئەوە مارێ تووە هەرچشتەکی لەو دنیایەی برۆی هەیە.».

بەلام کچەی کە لە سەرەتا باوکی مرازێکی نەهێنایە دی لەوژیانە دوور بنیادەمیە بێزار دەبێ و حەزە کەسیەکانی خۆی لێ دەبێتە مرازی گەرانەوە، ئەگەر چی هەقایەت خوان دەیەوێ لەو ڕێگەوە بەهای ڕەوشت بگەیەنێتە پلەی باڵاو گرینگی بداتە مرۆڤی شوون بزر لەو ترسەی عەقیدەی ئەو بینادەمە کارێکی بەرەواژ نەهێنێتەوە گۆڕێ.

لە پێشتریْ گوتمان حەکایەت خوانی کورد هەموو نهێنیەکانی ژیان و ئەوانەی خۆی سەری لێیان دەرناچێ‌و ناتوانێ وەلامێکی ڕەوانیان بداتەوە لەو دێوەی دەبینێ‌و دەیەوێ ئەگەر لەوگەیشت بگاتە گەڵێ نهێنی تریش.

بۆیە دوای خوێندنەوەو تێرامانی چەندەها هەقایەتی کوردەواری‌و وەزیفەی دێوان لەو دونیا بەربلاوەی ئەفسانە دەتوانرێ دێو بە دوو خاوەندی خێرو شەر دابنرێ‌و ئەو دابەش کردنەش لە ناوەرۆکی هەر مۆتیفەیەك دەبینرێ.

ئەو نموونانەی دەیانهێنینەوە بۆ ئەو مەبەستانەیە، دێوی شەڕو دێوی خێر دوو هەبووی سەربەخۆن و لەمۆتیفەی ئەفسانە هەست بەو کردارانەیان دەکەین و بایی چەند لای مرازی پاکی مرۆڤدا سوڕان بەو ڕەنگەی باسیان دەکەین.

## دێوو سەربردەی مرۆڤ

خولقان و پەیدابوونی بەرایی تۆوی بنیادەم کارێکە ئێستاشی لەگەڵدابێ هەریەکەو بەجۆرێ باسی دەکاو ڕێچکە فەلسەفیەکانیش هەر لەڕوانگەی باوەڕی هزری خۆیان شی‌دەکەنەوەو زەمینی دەدەنێ.

ئەفسانەو هەقایەتی کوردیش بەزۆر بارەوە متوی ئەم سەرجەلەی بەرایی‌یە بووینەو ویستوویانە دوورو نزیك باسی ئەم ڕەگە پەل وپۆ هاوێژە بکەن، بەلام چونکە مرۆڤی حەقایەت خوانی کوردیش کەسێکی ئیسلام و خواپەرست بووە، بە زۆری هەر لە ڕوانگەی ئاینی ئیسلامەوە زەمین دەداتە ئەم خولقانە یا هەندەجاران باری سەرنجی دنیا دیدەیی خۆشی تێکەڵ بکا.

کەچی لە هەندێ شوێن بەتەواوەتی لیکدانەوەی خۆی‌و ئەقڵی ئەفسانەییش دەخاتە کارو لە حەزو ویستەکانی دەدوێ. بەلام هەر لێکدانەوەیەو ناشتوانێ لە دەربرینە هونەریەکەی زیاد پێدابگرێ، ئەویش لەبەر ئەوەیە خۆی دەکەوێتەوە بن باری دژایەتی لەگەڵ خودی خۆیداو گوێگرەکانیشی ڕازی نابن بە ئاشکرایی لەو پێرەوە لابدا.

لیکدانەوەی میتولوژیایی لە دوو بنەمای سەرەکی سەرهەڵدەداو چەکەرە دەکات

١ـ کەم زانیاری دەربارەی ئەو بابەتەی باسی‌دەکا، دیارە مێشك و لیکدانەوەی ئەفسانە خوانیك سەرباری تاقی‌کردنەوەو دنیا دیدەیی خۆی خەیال تەڕی‌و سۆزی غەریبانەی مرۆڤیشە لەدونیاو حەزیش دەکا هەمیشە سەربردەی دروست بوونی خۆی لەگەڵ هۆکارە بزرەکانی گەردوون ببینێ‌و وەك چۆن ڕێکەوتێکی سەیرو لەناکاو ژیانی دەگۆڕێ ئاوهاش لەبوونی خۆی دەدوێ.

٢ـ لای هەقایەت خوان تەنانەت کارە زانستی‌یەکانیش دەستی هێزی غەیبی لەگەڵە، یان باوەڕ ناکا ئەو پەیوەندیانەی زانست باسیان دەکات لەو توانایە دابن ئەنجامێکی‌وا بێننە کایەوە.

خۆشی وەك مرۆڤ بە دونیای حەکایەت و ئەفسانە باس دەکاو دەبێ تا خەلکی بە بەرهەمەکەی ڕابێنێ لە ئەقڵی ئەوانیش نزیك بێتەوەو شتێکی وابلێ ئەوان مێشکیان بکەوێتە سۆراغ و حاڵەتی باوەڕو ناباوەڕیان بۆ بسازێنێ، ئەگەر تا ئەوە چەندان ساڵە مەسەلەیەکی وەکو باران بارین دەگوترێ لە هەڵمی ئاوی ئەو دەریاو ڕووبارانە دێتەوەو گەلێ تاقی‌کردنەوەی سادەی ڕۆژانەشمان هەیە ئەو ڕاستیە بسەلمێنێ کەچی زۆربەی زۆر نەك باوەڕی پێناکەن بەڵکو بەجۆرە کفرێکیشیی دادەنێن. چونکە لای ئەوانە ئەو بارانە ڕەحمەتێکی خوایی‌یەو ئەگەر ئەو باوەرە زانستی‌یەی لاجێگیر بوو کەواتە دەسەلاتی ئەو هێزەی لەبەرچاوان کەمتر دەبێتەوە بۆیە ئەم جۆرە مرۆڤانە ئەگەر بیانبەیتە دوور موختەبەرێکی زانستیش و لەبەرچاوی ئەم کارە ئەنجام دەی دەتباتەوە سەر عیلمی شەیتان و شتی‌تر، جائەوە بۆ باران ئەی مرۆڤ خولقان دەبێ چ سەین و بەینێکی تر بنێتەوە.

ئەمانە لەترسی مردنێ ناوێرن باوەڕ بە زانیستیش بکەن، بەلام جارجارە هەقایەت خوانیك لەبن لێوانەوە بە پەنا دزە خۆی لەقەرەی بابەتێکی وەك خولقان دەداو ئیدی بە بیروڕای لابەلاش دای دەپۆشێتەوە

بۆ نموونە لەم مۆتیفەیە، حەکایەت خوان ترسێك لەخۆی دەردەکاو لەپەنای دێوان زەینەکی دەداتە سەربردەی خۆیو دەڵێ «کورە بە دێوەی گۆ ئەمن دەبمە کوڕێ تو.. دێوە گۆتی ئاخر خیانەتم لێنەکەی.... هەموو کلیلەکانی دایێ، هەر کلیـلی هۆدەی هێلکـان نەبی، ئەو هێلکەیەش هەر لەکن ئەو دێوەی بەدەست دەکەوی.

ڕۆژەکێ سێ هێلکـەی خستە کونێ دەلاقەی، کوڕ دەیزانی دەست کاتە هێلکـان دێوە لێی بەخەبەر دێ دێوە چووە چیای کوڕە هەستا هەر سێ هێلکەکەی لەبەرکی ناو ڕاپەڕی... کوڕە لەرێیێ خۆی پێ نەگیرا هێلکەکی شکـانـد، کچـەکی لێهاتە دەرێ نەبکەی نەبخۆی تەمەشایکەی هەتا دەست هەراوێ کەڵەکەت گوتی ئەحمەد ئاو ئاو نەبوو، ئەحمەد نان نان نەبوو کچە لەبرسان مرد، ڕۆیی برەکی دی پێچوو دووەمی شکاند، گوتی بزانم ئەوە چیتێدایە ئەویش عەین کچەکی لێهاتە دەرێو گۆتی ئاو نەبوو نەبوو... نان نەبوو ئەویش لەبرسان مرد ئەوە دوو.»

لێرە ئەگەر بەوردی زەین بدەینە ئەو پارچە مەقایەتەی تۆمارمان کرد دەبێ بزانـین هێلکـەی ناو ئەشکـەوت و دێـوو کچەی ئاکار شیرین چ پەیوەندیەکی بە دەورووبەرو مەرگ و ژینەوە هەیە، بۆیە دەبێ لەبۆچوونی جیا جیاشەوە زەینی بدەینێو هەوڵ دەین بزانین چ ئاقیدەیەکی کۆن ئەو داوەی بەینی هێلکەو دێوی سازاندووە کچەی کەلەو هێلکەوە دێتە دەرەوە بۆ دەبێ ئەوەندە جوان و ڕێك و نورانی بێو داخوازیەکانی چ نهێنییەکی سیحری بەینی دەرچوون و ژیان دەترازێنێ.

گەڕان و ویستی شەیدایانەی مرۆڤ حەزە خەفەکراوەکان ژیانی ڕۆژانەیەتیو هەقایەت خوان دەیەوێ مرۆڤ شاد بکاو وای لێنەکا بەجارێ بروخێو نەتەی بەردا.

ئەو دیمەنە سریالیەی کچەو هێلکەی دێوە گەلێ دیمەن و ئامرازی پەیـوەنـدی پەرانـدووە کە لای هەقـایـەت خوانەکە خەست کردنەوەی دەربرینە ئەو هێلکەیە وەك ڕوحی دێوە وایەو لە هیچ شێوەیەکی تەواو قەرار ناگرێ بەلام هەقایەت خوان نهێنییەکەشی خستۆتە بەینی دێوو ئەشکەوت تا ئەو سێ هێلکـەیەش نەکەوتە دەست پاڵەوان هیچ گرینگیەکی ئەوتۆی نەبوو، لێرەش وەك کارێکی تاقیو قاڵ کردن مەرجی سێیینەی ئەمر دێتەوە گۆڕێو لەسێیەمین کەرەت پاڵەوان دەگاتە مەبەستەکانی، کچی خەون و خەیاڵی تەڕو پاراوی مرۆڤی لاپەڕان، بەلام ئەمجارە لە هێلکەوە بۆ کچ و دوایی کۆترو.. دار لانك، کۆلکەدار... واتە لە شتێکی پڕ گیانی جوان و زەریف بەرەو دیاردەی لە ڕەنگ دابراوو دوا تەمەنی پیرێو پەك کەوتەیی لێرەش دەورووبەر کارێکی زۆر بە هێزی لە مێشك و خەیاڵی بنیادەم هەیە، بینینی لەو چواچێوە تەنراوە ڕەت ناکاو هەرئەوانەش لە ژیانی ڕۆژانەیدا دەوریان هەیەو تێکەڵی هەندێ لایەنی لێکدانەوەی دەبن وەك.. دار. لانك، کۆلکەدار.. کانی... بەلام هەریەکەو لە وەزیفەی خۆیدا.

کەس و شوێن و ڕەمز بۆ مەبەستی دیاریکراوی خۆیان و لەشوێنی شیاودا دێنە ناو دونیای حەکایەت و هەرکە دەورەکەشیان تەواوبوو تەنیا ئاکارێکی هەستەکی جێدێڵن و شێوە هونەریەکەی دەربڕین دەسازێنن.

هەرچی پاڵەوانە سەرەکیەکانە بەدێویشەوە، داوێکە لەسەرەتاوە تا دواییـیەکـەی تەونی حەکایەتەکە بە گوێری زیرەکیو ژیری حەکایەت خوان تاوتو دەکەن، دێینە سەر نهێنی هێلکەی سێیەم و بەردەوامی مانەوەو گەیشتنە ئاواتی پاڵەوان و هێزە شەرانیەکانی دەرەوە حەکایەت خوان دەڵێ «ئێ سێیـەی کوڕە سەبـری گرت گۆتی وەڵامی ئەوەی ناشکێنم هەتا گەیشتە هۆبە ڕەشمارەکی گۆتی برسیمە ڕێبوارم هەندەك نان وئاوم دەنێ. هەستان هەندەك نان و ئاویان دایێ ڕۆیشت هەتا گەیشتە جێیەکی کە ئەوها ئەوپایی بی کەسی لێدیارنەبی، هێلکەی شکاند گۆتی ئەحمەدنان-- نانی دایێ... ئەحمـەد ئاو.. ئاوی دایێ کچـە ژیـا.. هێنـایەوە، بریە سەرکانیەکی، دارەکی برندی لێبوو بردیە سەر دارێو گۆتی ئەتو لێرەبە هەتا دەچم دەستە شمەکەکت بۆ دێنم».

ئەو سەبر گرتنەی جارێ سێیەمین هۆش هێنانەوە بەرو گەیشتنە پلەی بەردەوامی ژمارە سێیە کە لە ئاکامی دوانەیەکی بەرایی پەیدا دەبێو هەل و مەرجی ڕەخساندنیشی پەیداکردنی بنەرەت و پێداویستەکان ئەو هێلکـە سیحـریـەی دێـوە بەپێی ئەو حەکـایـەتـە ئەگـەرچی هۆکارە بەردەستـەکـانی سیحر لە شێوەیەکەوە دەیکەنە شێوەیەکی تر بەلام لە کۆتاییدا (کە ئەوەشیان لای من گرینگە) سیفەتی بەردەوامی دەداتێو نابیتـەوە هەڵی سەر ئاوان و لەپـڕێکـدا گوم بێ، وەك ئەوەی لەکۆتایی حەکایەتی «هێلکەی نامێو سوێرێ چاوشین» دیارە بەلام هەر کچە ڕووت و قوتی ناو هێلکـەی دێـوە بەپێی بیری حەکـایـەت خوان دێتـە سەر کانیاوێکی دامەن شێدارو ئاکاری خەیالیکی دوورمان لێ دەخرۆشێنێو ئەو ڕەمـزو هێمـا دەروونیـانە ناچارمان دەکا باوەڕ بە ژیریو وردبینی حەکـایەت خوانەکانمان بکەین لەگەڵ ڕێبازی قوتابخانەی شیکردنەوەی دەروونی نزیکتـریـان بکەینەوە. لەبەر هەندێ کەتەمەشای ئەو تابلۆیە دەکەی مرۆڤ و سێکس و ژیارت لادەبێتە بنەمای لیکدانەوەو بینایی بەرەو نهێنی گەردوون. لە هەندێ حەکایەتی تریش پاڵەوان و دێوی مێینە ئەم سەرجەلەیەمان بۆ ڕوونتر دەکەنەوە، بەتایبەتیش دیتنی ئەندامی مێینەی دێوەو. ساردبوونەوەی پاڵەوان و سڕبوونی ئەم بینینە مرۆڤ لە تەوژمێکی هەڵچوونی شەرانیەوە دێنیێتەوە دونیای خرۆشان و لەزەتی سێکسی بەلام ئەوە لەزەتی حەکـایـەت خوانی کوردە دەڵێ «ئـەحمـەد ڕۆژەك پەری هاژواچـووە ئاقـاری هەتا پێش نیوڕانێ هیچ نەبوو، بووە نیوڕان گرمە گرمەك لە عاسمانێ لەسەر سەرێ ویپەیدابوو هەرەهات دەنگەکە نزیك

بوموه که هات دێوەك بوو له پێشەوەی نیشت لەگەڵ ئەحمەدی بوە شەڕیان گەلەكیان یەكدی هیناو برد تا شەكەت بوون، دیسان دەستیان پێكردەوە، ئەحمەد یەك دووجار بایدا له عاردیدا، یەخەی دێوەی بڕوە مەمكی بەدیاركەتن دێوەمێیە بوو، ئەحمەدیش خۆی بە هەردوو مەمكی توندكرد دێوە گوتی بەس مەمكوڕە شەڕتت لەگەڵ دەكەم... نەیكوشت».

له زۆربەی حەكایەتەكانی تریش كه كچە خەیالیك بۆ پاڵەوان دەسازێ بەم جۆرە باسی ناكرێت، رەنگە ئەوەش بۆ ئەوەبێ دوایی باسی دەوری سیحری لێبكرێت، مەكە له زۆربەی كارە سیحریە كۆنەكاندا تیلمە پەڕۆیەكی كراسی یەكێ بۆ ئەوەی دیان كار له سیحربەندەكە دەكاتەوە گۆیا ئەمە بەشێكی زیندووه له گیانی ئەوی تریان و بە دەست لێدان و لەبەركردنی شێوەیەك دەگۆڕێتە شێوەیەكی ترو كەسایەتیەكەی جارانی دەشێوێنێ، بۆ نموونە «لەو دەمی سۆرەی چاوشین چووە سەر كانییێ دیتی شەوقەك لەناو كانییێ دەداتن دەرێی ئەینوكە، وەهای ئاوڕ داوە دیتی كیژەك لەسەر دارێیە چووە سەر دارێ گوتی ئەتو لەچ دەگەڕێی؟ گوتی ئەمن دەسگیرانی ئەحمەدیمە چووە جلكم لۆبینی، گوتی دەمادام وەی گوتیە ئەمنیش خوشكێ ئەحمەدیمە هانەو كراسەی من لەبەركە... كچە كراسی بەسەر خۆیدا هێنا، سۆرەی چاوەشین لەسەر دارێرا پارەكی پێوەنا... كچە بوە كۆترەكی شین فڕیو ڕۆیشت.) لێرە ئەو لایەنە سیحریە له شێوەی كراسی سۆری چاوشین هاتە پێشێو نهێنی سیحرەكە له هۆكارێكی حەسودیەوە پەیدابوو.

ئاكامی دواینیەش ئەوەیە كچەی ناو هێلكەی دێوە دەمێنێو دەبێتە هاوسەری تا هەتایەی پاڵەوان و سۆرێ چاوشین دەمرێ، ئەو سۆری چاوشینە مامۆستا طارق جامباز دەڵێ «بۆ سۆرێ چاوشین ئەمە سێیەم دەقە هەرخۆم بلاوی دەكەمەوە دەقیتریش بلاوكراوەتەوە تۆ بڵێی له جەنگی جیهانی یەكەمدا كه عەروسەكان پێش شۆڕشی ئەكتۆبەرو هەروەها ئینگلیزەكان بە ناخێری گیانیان كه هاتنە كوردستان دەستیان بە تێكدان و كاول كردن و ئاگرتێبەردان و تالان كردن كرد رەنگ و سیمای سەركردەی هەردوو لەشكرەكە چاوشین و سۆرەفلەبوون ـ تۆ بڵێی ـ ناوی سۆرەی چاوەشین لەمەوە نەهاتبێ.

ئێمە ناتوانین ئەو مەزەندەیەی كاك تاریق یەكاو یەك قەبووڵ بكەین و مێژووی دەست پێكردنی شەری جیهانی یەكەم بكەینەوە هەگەری پەیدابوونی ئەو پاڵەوان و بۆرە پاڵەوانانەی ناوی سۆرەی چاوشینیان لێیە، ئەگەر وابوو دیارە تەمەنی هیچ حەكایەتێكی وا «۸۰» ساڵ نابێت جامادام كاك تاریق سۆرێچاوشینی له ئاكارو رەنگ و رووی هەندێ لەسەركردەكانی سوپای عەروس و ئینگلیز هەڵگرتووە خۆ دەبوا شتێكی زۆر ئاسان و تارادەیەك گونجاوتر بێنیتەوە خەیاڵمان ئەویش ئەو هەموو حەیەكایەت و گوتەو قسەی لێرەو لەوێو مەولود نامە كوردیانەی كه دەڵێن «دوو پیاوی فەرەنگی مووزەردی چاوشینی لەعین» هاتبوون بەدزیەوە ژێر زەمینكیان لێدابوو تەرمی پێغەمبەر (د.خ) دەرێنن و سووڕ بزری‌بكەن. بەم رەنگەی مێژووی پەیدابوونی سۆرێچاوشین هەزارساڵ زیاتر دەباتەوە ئەولای ئەمە ئەگەر بەو حیسابە بێ، دەنا دەشتوانین لەلایەنی‌ترەوە زەمینی بدەینێ كه جارێ مەبەستمان نی‌یە.

## دێوو كێشەكانی ژیان

ژیان بەكارەسات و مل ملانێی مانەوەو مەرگ و زیندەگی مولكی ئەو مرۆڤەیە لێی دەژێو لێشی ئاوادەبێ، مرۆڤیش بیزانیبا چ ڕۆژێك دەمرێو ماڵئاوایی لەو دونیایە دەكا له قوژبنێكدا هەراسانی لێ هەڵدەگیراو لەترسان زەندەقی دەچوو، یان لەترسی ڕۆژی مردنێ هەموو ژیانی خۆی دەكردە خۆشیو لەگەڵ مێرولەیەكیش خۆی لاونیو نەدەكرد یان هەر نەیدەتوانی باسی ئەو لەحزەیە بكات، مرۆڤیش بەوەوە جوانە چارەنووسێكی وونی هەیەو دەیەوێ تەبایی‌و ناتەبایی خۆیو كێشە دەرەكیەكان لەگەڵ تەمەنی نادیاری خۆی بسازێنێ، بۆیە دەبینی لەگەڵ ئەو هێزە لابەلایانەش ژیرانەو جارجاریش شێتانە نزیك دەبیتەوە، یان لەترسی ڕوداوی كت وپڕ لیكدانەوەو لەدنیا زانینی بەرەو هزری لابەلا دەچێو خۆی بە ئومێدان دەخافڵێنێو وەك كەسێكی وریاو كاس دێتە بەرچاوان بەلام خۆشی بە مرۆڤێكی وریا دەزانێو نایەوێ خۆی وادەرخا كەسێكی سەرەوڕوو بیركاڵیشە*ئەو تەسلیم بوونە بۆ هێزی غەیبی لەبارترە نەك مرۆڤ.

ژیان كێشە لاوەكیەكانیشی لێلادە هەزاران داوە دولكەو گرێكوێرەی پڕ مەترسیو نهێنی ئەو سروشتەشی تێدایە، ئەوەی مرۆڤ دەیكا نیازی دابین كردنی پێداویستە دەروونی‌یەكانی دەرە دەسەلات تووشی كارەساتی غەیبی دەكەن و پەیوەندییە نهێنی‌یەكانی سروشتی دژ وایان لێكردووە هەوڵی دەستگیركردن و لەخۆ نزیك كردنەوەی توخمی ئەو بابەتانە بدات و لێیان وردبێتەوە.

ئەو خۆیی‌كردنەی هێزەكان و ئەولای هێزی عادەتی هەرترس لەخۆدەركردن نی‌یە، بەڵكو هەوڵی گەیشتنە نهێنی ئەو كارە نادیارانەیە ناوكی ئەو گەردوونەی خستۆتە ئەو بارەو ئەو ژیانە سەر دونیایی‌یەی وەها پڕ مەترسی كردووە.

لەو بۆچوونەوە مرۆڤی ئەفسانە سەودای بەدیهێنانی ئەمری‌بوەو مێژووی مرۆڤایەتیش سەرجەلەی گەلێ بەرهەمی ئەمری ئەخشاندووە. ژیانی ئاسایی مرۆڤ چەند ساتێكی بێبوونە ئەگەر نەتوانێ كارێكی دیار یان بەرهەمێكی زیندوو دوای خۆی جێبهێڵێو خەلكی تووشی هەروەستەو

رامان بکات.

مرۆڤ بۆ خۆخافلاندنیش هەندێ سەربردەی هەیە دەیەوێ بای پێ‌و بیرو روحی خۆی بداو لەدەست ژیانی لەئاون دراو خۆی راتەکێنێ‌و لەو گەردوونە خۆی هەراسان بکا.

هەندە جاریش لەبەرکەم بینی هزرو لیکدانەوەی وادەزانێ ئەگەر لەکۆمەل و دەوروبەرەکەی خۆی زیاتر رۆیی ئیدی ئاوەدانی‌و هەستی م..ڤایەتی نامینێ‌و تووشی کۆمەڵگای گیانداران و درندەو دەعباو دێوو ، له مرۆڤان نەچوو، یان نیوەمرۆڤی نیوەگیاندار دەبێ‌و لەوێش خۆی ب سێکی ئاقڵدا ـ دەبینێ‌و هەر هەندە کارێکیان بەدڵ نەبوو، لەپرشتی‌وا بە خۆی دەسپێرێ ئەگەر لەبەرخاتری ئەوە نەبێ مرۆڤە هەر سەیرمان پێ‌ی دێ.

ئەفسانەخوان بەپێ‌ی بیرو بۆچوونی خۆی بۆ مرۆڤ دەدوێ لەزۆر هەلوێستیش لەچەمکی ئەخلاقی‌و ئامۆژگاریدا دەخولێتەوە، جاری‌واش هەیە رێ‌ی بینایی‌و رامان دەگرێ‌و لەبۆچوونی فەلسەفیانە نزیك دەبێتەوە، بە تایبەتی ئەو ئەفسانانەی باسی چۆنیەتی دروست بوونی گەردوون و مرۆڤ و رووداني لاڤاو دەکەن، بیروڕام وایە ئەم جۆرە ئەفسانانەمان بە تەواوەتی کەوتوونەتە ژێر باری روانینی ئاینی ئیسلام و ناوەرۆکی بەرایی خۆیان دۆڕاندووە.

بۆیە تائێستاش ناوەرۆکی ئەفسانەی کوردی لەو باوەرەیە کە هەوەڵین نێرینەو مێینەی بنیادەم حەواو ئادەمن، لاڤاویش غەزەبە خوا ناردویەتیە سەرنەرزو بەدکاران و لەخوانەترسان و داوێن پیسی لەسەر رووی زەوی پاك بکاتەوە.

خۆ تێکەڵ کردنە لەگەڵ پەیوەندیە بنەیی‌یەکانی ئەولایەنە. ژیانیش هەرتەنیا کێشە سەرەکیەکان نی‌یە، زۆرجاران کارێکی لابەلا، هۆکارێکی رەمەکیانە سەرتاپای ژیان دەگۆڕێ‌و لەوێوە مرۆڤ تووشی قوڵایی کارەسات و روداوە نادیارەکانیش دەبێ‌و چەنگە پڕی چارەنووسی خۆی دێتەوە.

رێکەوتیش یەکێکە لەو هەگەرانەی یان ژیانی پاڵەوان بەرەو خۆشی‌و بەختەوەری دەباو ئایندەی ژیانی دەرازێنیتەوە یان ئەوەتانێ تووشی نەهامەتی وای‌دەکا رێ‌و رەچەڵەکی دەداتەبەر گەردەلوولەی زەمانەو تارمایيشی لەبەرچاوان نامینێ. بەلام جارێ ناشزانین چ گەردیلەیەکی تواوەی ئەو گەردوونە رێوپیکی ئەم رێکەوتە لەگەڵ باری دەروونی مرۆڤ دەسازێنێ‌و چۆن هەڵدەکەوێ. مرۆڤ توانای ئەوەی نی‌یە رێکەوت بۆ خۆی رایەڵ بکاو وەك پێویستی‌یەکی خودیانەو ئاکام خێر بیهێنیتە بەر ژیان و مرازەکانی. چاوەرێ‌ی دەکاو هەمیشە بە پەرۆشەوەیە بۆی باوێ‌و دەردە سەرانگرێکانی بخاتەوە قەوارەی خۆی بەلام ناشزانێ کەی‌و چۆن ئەو رێکەوتەی تووش دێ، کەم تێ‌روانینی واهەیە باسی کەسان و پاڵەوانی رامان بۆ بکا هەربەو تەمایە دانیشێ‌و یان سەفەرێکی بەونیازەی دابێتە بەرخۆ، ئەوەی لەحەکایەتان دەبینین پەیداکردنی چەند مۆیەکە بەرێکەوتیشەوە، پاڵەوان و خێرخوازانی حەکایەت لەدەستی نەهامەتی رۆژگار بپارێزێ‌و بلێ ئەو هێزە غەیبی‌یانە بە زۆری بەهانای مرۆڤی زۆر لیکراو دێن بەو رەنگەش ئومێدی چاکە پیرۆزتر دەکا چونکە ئەفسانەش وەك چمکێکی ئەو ژیانە بەرێبیری مرۆڤەو بەهەر شێوەیەکیش زەمینی دەدەمێ هەر دەربڕی لایەنە جیا جیاکانی خەمی خۆیەتی بۆیە دەڵێ «جیهانگیر رۆیی هەتا گەیشتە سەرکانیەکی گوتی بائیسرحاتەکی بکەم. ئەستورکە جۆیەکی پێ‌بوو فرێ‌یدا ناو کانی‌یێ گوتی هەتا سەرخەوەکی دەکەم ئەستوورکەکە نەرم دەبێتەوە لەخەوێ هەستا ئەستووکەکەی لەسەر رانی دانا پارەوەکی حازرکرد، بیخوا شتێکی بۆرکۆکەی دی‌هات، ریوی‌بوو، پارەوەکی لەئەستووکە جۆیەکەی لەدەوی ریوی نا لەپاشدا هەستا بڕوا، مام ریوی گوتی جیهانگیر کێوە دەچی؟ گۆتی مادام بزانی ناوم چی‌یە دەشزانی کێوە دەچم؟ ریوی گوتی خوات بەقوربانی ئەولوقمە جۆیەکاداتە من ئەمن دێوم خۆم کردیتە ریوی.»

ئەوە تارمایی ئەو رێکەوتەیە لێرەوە حەکایەت خوان دەیەوێ پێ‌ی بە هانای پاڵەوانەکە بێ بە تاقی‌کردنەوانی دابیا هەتا دەیگەیەنیتە مرازی خۆی دیارە ئەو چاکەی جیهانگیر لەگەڵ رێوی‌کرد کەدوایی زانیمان دێوە

هەر ئەوەبوو رێرەوی ژیانی پاڵەوانی بەرەو تروسکایی ئاوات برد ئەم خۆگۆڕینەی دێو بۆ رێوی فێڵێك بوو حەکایەت خوان سازی کرد لەکەم حەکایەتی تر دەبینرێ، چونکە دێو هەمیشە بەهێزو لاملە بە هەلوەشاندنەوەی گرفتە پڕ گرێ‌یەکان دەناسرێ‌و کەم وایە پەنا بۆ فێڵ بەرێ، فێڵی ئەو زەبری هێزە، بەلام لێرە حەکایەت خوان بۆیە وای پیشان دا تا دێوە لە جاری یەکەم بەگیانداروکەك بێنێتە پێش و بزانێ جیهانگیر ئەو چاکەیەی لەترسان لەگەڵ نەکردووە بەلکو ئەو دەمی خۆی بە پاڵەوان و جەربەزەتر بینیوەو سیفەتی پاڵەوانانیش وایە.

لەبەینی پاڵەوان و دێوان، رێچکەیەکی تریش هەیە ئەویش تەبابوونی مرۆڤ و هێزی غەیبی‌یە کە لەشێوەی دێو دەبینرێ بەهەردوکیان بەرەو ئاواتی پاڵەوان دەرۆن، کەچی ئەوبەیەك گەیشتنەی دێوو پاڵەوان هەموو جار هەر بەشێوەی ئاشتی نایەتە دی، زۆرجارانیش دوای مل ملانێ‌و بەرنگاربوونەوە بەرپا دەبێ‌و ئەوکاتە دێوە داوای پەیمانی دۆستایەتی‌و خۆشەویستی لەگەڵ پاڵەوان دەبەستێ‌و تانەشی گەیەنیتە مرازەکانی بەجێ‌ی ناهێڵێ، تەنانەت خویندەواری ژیریش هەست دەکا پاڵەوان هەرئەوەندە نی‌یە بەدێوە بلێ: تۆ نەبی من هی ئەو گرفتانەنیم، بۆیە لە شوێنی خۆیتی بلێن لەو حاڵەتانە دێو گیانی تەواوکەری

پاڵەوانە، هێزە جۆشاوەکانی ناوەوەیە لە شوێنی پێویست دەبینرێ.

ئەم جۆرە لێکدانەوەیە دەمانباتەوە سەر داستانی گلگامش و بەرینگاریەکەی ئەوو ئەنکیدۆ کە دوایی هەستی غەریبیو نامۆیی پاڵەوانێکی وەک گلگامێشی گەیاندە پلەی نەمریو سەودایی.

بۆ نموونە «ئەحمەد هەستا رۆیشت دەبینی وا دوو ژن مەنجەڵەکی دەکوڵێنن و یەکەکیان دەگرییو ئەوی دی پێدەکەنێ، ئەحمەد گوتی ئەرێ ئەوە لۆ یەکتان دەگریو یەکتان پێدەکەنی، گۆتیان ئەو مەنجەڵەی دەبینی ئەوە ژنەکی وەکی مەبوو، ئەحمەد هەروەی کردێ مەنجەڵی فرێ داو گۆتی ئەدیکا دیوێ کەرگەر، گۆتیان والەو کەروەیە، رۆیشت دەبینی دێوەك واپاری ذایتەوە گێیەکی رایەخستیەو گێیەکی بە خۆی دادایە، لە هەسپێ هاتە خوارێ گۆتی کافر هەستە، دێوە گۆتی برۆ جوانکەی ناتخۆم، ئەمەو گۆتی هەستە کافر... دێوە راست بۆوە لێیان بووە زۆرانی کەس کەسی لە عاردی نەدا، هەریەکدیان دەهیناو دەبرد بەینەك وازیان لێك هینا دیسان دەستیان پێکردەوە، هەتا وەیلێهات ئەحمەد دێوەی لە عاردیدا، دێوە گۆتی کورە مەمکوژە، دەبمە ئارقە لە گوێی توو.».

جارێ ئەو ئالقە لەگوێکردنە موڵکاندنی کەسێ یان شتیکە بۆ کەسێکی تر ئەویش وەختی خۆی بە مرۆڤی جەربەزە دەهاتە دی. دیارە لەبەردەم مرۆڤی نەترس گەلێ بۆرە هۆش هەر لەخۆیانەوە دەرەونەوە، کەچی ترس کۆمەڵێ زەینی تەماوی گەلالە دەکات و خۆدی ئەو کەسە ژێر نەبێ نغرۆی دونیایەکی سەیر دێ، رێکەوتی ئەو دووژنە نەبووا هەر لە سەرەتاوە تەونی حەکایەتەکە بە شێوەیەکی تر دەکەوتەوەو دەبوا رووداوو ئەنجام بە شێوەیەکی تر بونایە.

ئێمە جارێ نازانین کارە ئاییندەیی‌یەکانی چارەنووس پاڵەوان دەبەنە چ مەودایەکی ترو چۆن تەمی گومان پەیدا دەکات، لێرەوە خاڵی داوەدولکێو لەزەتی بیستن و شوون پێی پاڵەوان ناسکتر دەبێو ئەو گرێیە تازەیە بەرەو خولیای ترمان دەبا، بۆیە دوای ئەم رووداوە پاڵەوان بە کردەی سەیرتریش دادەچێ.

کوشتنی دێوە لەزۆر حەکایەتان تۆوی بەردەوامی خراپەو شەر جێدێڵێو هەر بەنەمانی هەموو ئاکارو پاشماوەکانی نابڕێتەوەو لە وەختی جیاجیا کارێکی سلبی دەکاتەوە سەر پاڵەوانەکان، ئەمەیان ترسی مانەوەی روحی بەدخوامانەی دێوەیە گۆیا دێو روحی لە ئەشکەوتان و تاریکایی‌یان دەپارێزێ، لەبەرهەندێ حەکایەت خوان دەڵێ «دێوە گۆتی ئەنگو ئەمن هەر دەکوژن بەرێ ئاوێم پێدانەکەن گۆتی... لۆ ئاوێت پێدانەکەین دێوە گۆتی ئەگەر ئاوێم پێداکەن دەبمە پیواز هەر کەسەکی بخوا. دەبێتە بەراز وەڵلا گۆتیان درۆیەکا دێوەیان کوشت و خۆریان وەسەداو، کیژەوەکی کۆریەکردو چشتی‌یە کردو ئێشیەکرد ئاوەکەی تەدوور چاریێیە کرد.

وەختەکێ تەرەپیواز دەریکردە دەرێ، دەچوون لەبنراهەریانە کۆری هەتا بەژنە عیسانەکێ دەیان برێو خۆریان وەسەرە داو شینەبۆوە گۆتیان خوشکم نەکەی دەشێوێی کەی لۆمان نەخۆ دەبینە بەراز، گۆتی وەڵلا رۆژەکێ مەحتەل بوو چ پیواز نەبوو گۆتی قیچۆکەکێی تێیەکەم، هێوارێ خواردیان برایەکانی بوونە بەراز...»

نەك هەر لەم مۆتیفەیە لە زۆربەی حەکایەتەکانی تریش دا ئەو بوونە تەرە پیازە لەدوو شێوە دەبینرێ

١ـ لە حاڵەتی وەکو ئەم حەکایەتە کە گیانی دێوەی بەد دەنێژرێ، دوایی دەبێتە تەرە پیازێکی سەوز، ئەم سەوزایی‌یە نیشانەی بەردەوامی مانەوەی ئەم روحەیەو وادێتە بەرزمین کە گیانی بەدیش رەنگ و ریشاڵێکی توندی لەو گەردوونە هەیە

٢ـ زۆر جاران پاڵەوانی خێر نەدیتویان مرازخوراو کە بەناهەقی دەکوژرێ، لەسەر گۆرەکەی ئەم تەرەپیازە، پەیدا دەبێو گۆیا گیانی ئەو کەسە دەژێو لەگەڵ توخمەکانی تری سروشت تێکەڵ دەبێو خەلکی‌تر نابێ ئازاری بدات و هەوڵ دەن ئەو نیشانەیە بسرنەوە.

کەوابوو گیانی بەدوو خێر هەردوکیان دەبنە ئەم سەوزایی‌یەی مرۆڤ وریای کارەسات و رووداوە پێشینیەکە بکاتەوە، هەر حەکایەتیش دەبێ لە گیانی دێوە مرۆڤی شێوەبەراز پەیدا دەبێ کەبەهۆی روانینی ئاینی ئیسلام بەراز گیاندارێکی پیسی نەفرەت لێکراوە، بەلام حەکایەت خوان مرۆڤە گۆردراوەکان بەسۆزەوە دێنێتە دونیای حەکایەت و لە هەستی مرۆڤانەی بەرایی‌یان رووت ناکاتەوە، لەبەرئەوە چاوەرێیە رۆژێ ببنەوە کەسێکی هەست ناسك و سیرەکەیان بەتاڵ بێتەوە.

لەهەندێ مۆتیفەی تر دێوە بە لێدان کەسێك دەکاتە بەراز، دیارە ئەو دەست وەشاندنە زەبری هێزە غەیبیەکانیشی لەگەڵەو حەکایەت خوانی کورد پەنا دەباتە بەر ئاقیدەی کۆنینە، لەوانە لێدان بەدار بە دەست، یان فرێدان، کەلەبەینی بەکارهێنانی ئامرازێکی وەك دارو جەستەمە دیارکراوەکە بۆشایی‌یەك هەیە

لەگەڵ تووڕەیی هەستی مرۆڤ ڕەنگە چەند بووەکی نەدیتراو تووشی ئازاربین و هەر گیانی ئەوانەشە کار لەمەبەسدارەکە دەکاتەوە، بەلام هەندە جاریش دەست وەشێنەکە خۆی تووشی گۆڕان دێ، وەك ئەوەی تا ئێستا لە کوردە واریدا باوە دەڵێن فلان لەمەچێتر دەستیان لێوەشاندوە یان ئەوەی ئاو بەشەو بڕژێنێ بەگوناحی دەزانن ئەوەکاپەریو فریشتەی خێری بەرکەوێو ئازاریان بدات.

زۆربەی ئەو حەکایەتانەی من دیبم دێو بە هەموو ڕەنگەکانی (سپی، بۆر، ڕەش) خراپەن بە پێچەوانەی هەندێ لەو نووسەرانەی وازەن دەبەن دێوی سپی هەمیشە چاکەویستە، ئێمە هەر ئەوەندە دەبینین دێوێ سپی سێیەم کەرەت دێتە بەرچاوان، نیشانەی سپیاتیەکەی هەر بۆ ئەوەیە دوای کوشتنی ئاسۆی بەرەو مەبەستی پاڵەوان ڕوونتر دەبێو فێنکاییەك دڵ و خەیالاتی ئەو پاڵەوان ڕۆشن دەکاتەوە.

کەوا بوو حەکایەت خوان ئەو شێوەیە سپییەی دێو هەربۆ کوشتن دێنێتە گۆڕی، بەلام دەشبێ حەکایەتی تر هەبن من نەمدیبێ ئەم دێوە سپییە بە جۆرێکی تر ببێتە مایەی خۆش بەختی پاڵەوان.

ئێمە ئەم نموونەیە لە ل[26] و ل[27] کتێبی تێکستی چەند هەقایەتیکی فۆلکلۆری «ماموستا سەعدوڵلا شێخانی بەم جۆرەی وەردەگرین «کاتەك دێوی ڕەش هات و برماندی گوتی حەسەن پاشا با بەخۆی نەنازی کوڕی بەرەڵلای دنیایێ کردیە ئەحمەد گوتی... هاوار مەکە برایەکانم بەخەبەر مەینە، ئەوجا بزانم خوا بەمن دەدا یان بەتو، دێوی ڕەش دێتە خورای دەبێتە لێك دان و شەڕ، ئەحمەد لێی دەداو لووت و لچی دەبڕیو لاشەکەشی دەشاریتەوە. شەوی دووەم دێوێ بۆرە دێ ئەویش دەکوژی، سێیەم شەو دێوێ سپی دێ دەکاتە برمەبرم، دوای شەڕو هینان و بردن ئەویش دەکوژی».

وەك بینیمان چاکەی دێوی سپی هەر ئەوەبوو لەسێیەمین جار هاتە مەیدان کە دەکاتە دواجاری،. بەلام ئێمە جارێ هەر هەندەمان بەسە چونکە ئەوە بەپێی بیروڕای فۆلکلۆرناسان مەرجی حەکایەتی خەرافیە.

کەچی لەهەندێ مۆتیفەیتر ئەویش زۆرکەم دێوی سپی دەبیتە نیشانەی چاکە بەتایبەتیش ئەگەر کێشە بکەویتە دونیای دێوان خۆیان بەلام خوێنەر وابزانێ دێوێ ڕەش هەنیشانەی خراپ و بەدییەو دێوێ سپیش نیشانەی خێروچاکە کارێکە پێویستی بەبەڵگەو لیکۆلینەوەیەکی ترە، ئێمە لێرە هەر هەندەیان باس دەکەین.

ئەشکەوتی دێوەش بەشێکی هەرە غەریبی، دونیای دێوانەو لە مێژیشە مەترسی خستۆتە مزری خەلك ئەوەهاش خولیای کردوون

ماڵی دێوە بە زۆری ئەشکەوتە کەم جاریش هەیە لەدەشتاییان بێ، ئەگەر بوو ئەوا لە شێوەی قەسرێکی خۆشی بەتەنێی چوار دەور باغ و بێستانە، هەرچی ئەشکەوتەکەیە کۆنتر دێتە بەرخەیالان و وەسفی جوانیشی تێدانییە، لەزۆر حاڵەتیش جۆگەیەك باس دەکات ئاوێ سوورو ڕەش و سپی پێدادێو هەریەکیشیان بۆ مەبەستێکە... لەوێ پاڵەوان دەکەویتە بەر بیرتیژیو نهێنی ئاشکرا کردن، وادەزانێ ئەگەر دێوەی کوشت دەبێتە خاوەنی ئەم پێداویستانەی دێوەی گەیاندۆتە ئەو پایەی حەزەکانی بەپێی ئارەزووی خۆی بێنیتە دەست.

ئەو ترس و سەوداییەی حەکایەت خوان لەگەڵ خولیای لە مێژینەی مرۆڤ دەجۆشێ، ئەوە وەختێکە خۆی دەدوێنێو هەروەستەیەك لەبەرگێژەنی زەمانەو خودا دەکا، وەك ئەوەیە مەرگی بەرێ کەوتووی خۆی بەرەو گۆڕستان بینێو لەترسان بێتەوە بەر بارانی جوانیو یادو هورینەکانی.

(١) ئەم لیکۆلینەوەیە بەشێکە لە کتێبکی میتولۆژیایی هەربەم ناونیشانەی سەرەوە.

## سەرچاوەکان


١. الاسطورة والمعنى /ليفى شتراوس ترجمة د. شاكر عبد الحميد
٢. الميثولوجيا اليونانيه /بيار عزيمال /ترجمة هنرى زغيب
٣. دراسة الحكاية الشعبية الفلسطينية ـ عبد الرحمن الساريسى
٤. الاسطورة ـك .ك .راثفين /ترجمة ـ هنرى زغيب
٥. لێکولینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی ـ د. عیزەدین مستەفا
٦. تیکستی چەند ھاقەتیکی فۆلکلۆری کوردی ـ سەعدوڵلا شیخانی
٧. بلاوکراوەی فۆلکلۆر ـ بەشی یەکەم ـ خالد جوتیار
٨. هەمان سەرچاوە ـ بەشی دووەم ـ ئاواز سنجاوی
٩. بلاوکراوەی فۆلکلۆر ـ بەشی دووەم ـ محمد کریم شریف
١٠. کۆمەڵە حەکایەتیکی ـ بلاونەکراوە ـ دەسنووس ـ
١١. فەرهەنگی ئیریەن ـ ڤاج ـ محمد امین هەورامانی




# ئایا.. خانزادی سۆران مێردی کردووە؟!

ئەسعەد عەدۆ

● لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٠وە، خولیای سەربردەی میرانی سۆران بەگشتیو خانزادە خاتوون بەتایبەتی کەوتۆتە سەرم، ئەوەبو لە رۆژی ٧/١١/١٩٨٠ سەردانێکی چیای (بەنی هەریر)م، کردو چەند وێنەیەکی گەلی خانزادو کۆنە دیوارو قوڵغە سوپاییەکانیم کێشا. سەرەرای ئەو شوێنەوارانە کە سەردەمی دروستکردنیان بۆ فەرمانرەوایی ئەو دەگەرێتەوە.

لەبەر ئەوەی ئایشە گوڵی هەکاریو لەشکریش، دوو بەیت یان لە سەربردەی تێك هەڵکێشراوی سەربردەی میر سولەیمان بەگی سۆرانـە. لە رۆژی ٢٨/١١/١٩٨٠ لەزاری عەزیـزی شێخ محەمەدی عەزیزی بەیت بێژ ئەم دوو بەیتەم تۆمارکرد. وەك نامیلکـە لەژێـر ناونیشانی (بەیتی ئایشە گوڵ) لە ساڵی ١٩٨٣ ئەمیندارێتی گشتیی رۆشنبیریو لاوان چاپی کردووە.

وادیـارە ئەو خولیـایـەم ماوە ماوە سەرهەڵدەداو ناخم دەبزوێنێو جڵەوی خۆزگەم بەرەو هەریرو ئەڤینی ئەو شۆخە ناودارەی سۆران دەبا. تا ئێستاش لەنێو کوردەواریدا بە بەژن وبالای خانزادی سۆران هەڵدەگوترێ، ئەگەر بێتو ئافرەتێکی قژ درێـژو جوان لەبـەردەم ئافـرەتێـك یان پیاوێکی بەساڵاچوو تێبپەرێ لەوە زیاتر نالێ: «کەزی دەڵێی کەزی خانزادە خانی سۆرانـە»!. خۆ باسی ئەوە هەرنـاکـرێ لەکـاتی لاواندنەوەی




بووکێـك یان لەتـەمـەنی بووکێـنیدا بێت، ئەوە سەردولکـە بەسـۆزەکەی سەردولکەبێژ ئۆقرە لە پیاو هەڵدەگرێ کە دەڵێ: «وەڵڵا لەچل و چوار کەزی خاتوونە خانزادی سۆرانت دێخمەوە».

ئەگـەر بێتـو سەرنـج بدەینـە لاپەرە حەشاردراوەکانی مێـژووی نەتـەوەکـەمـان گەلێ ئافـرەتی جوان بەڵکو جوانتر لەخـانـزادی سۆران بەکـارەسـاتێکی دڵ تەزێن لەنێوچووە، هەروەهـا سەربـردەی لەنێوچوونی میر سولەیمان بەگی برای خانـزادیش، کەچی نێـوی زۆربـەیان بزرە، بەبۆچوونی خۆم ئەگـەر پیـلانی لەشکـری دژ بە میر سولەیمـان نەبوایە، ئەو پیـاوماقوڵەیش وەکی هەزارانی دیکە نێوی وون دەبوو، بەڵام جۆری لەنێوبردن و بەدفەری لەشکری لەو کارەساتە دڵ تەزێنە بووەتە هۆی ئەوە کە ئەو خەڵکە بەدڵ سووتاوی بەندوباویان پێـدا هەڵگوتوەو تا ئەمرۆیش دانیشتنی بەرئاگردانی شەوانی زستانی پێگەرم دەکرێتەوە.. ئاوایش بۆ خاتو خانزاد، ئەگەر بێتـو ئەو کچە نەشمیلانە شووی بکردابوایەو ماڵێکی گەرمی خێزانی پێك بهێنابوایە بەهیچ جۆرێك نەدەبووە کەسەری ئەم و ئەو. خۆ نەچوە بچێ ئێستاشی لەگەڵدابێ سۆزی پێهەڵدانی ئەو کچە بەسۆزترە کەتازەبووکە یان تازە نەمامەو جوانەمەرگ دەبێ. لەهەموو لایەکەوە گوێت لەوەدەبێ «ئای کوێربم دونیای نەدیت و بەمرازی خۆی نەگەیشت».

خانـزادە خاتوون کچی شاقولی بەگی سولەیمان بەگی

میر سەیدی بەگە. واتە تاکە خوشکی میر سولەیمان بەگی شاقولی بەگی سۆرانە (؟ ـ ١٥٩٠) زاینی. کاتێ لەشکری پیلانی تۆڵەکردنەوەی بۆ دادەنێتەوەو لەنێوی[١] دەبا. ئەوبارە نائەموارەی سۆران دەکەوێتە ئەستۆی خاتو خانزادی خوشکی. هەرچەندە مێژوونووسی کورد خوالێخۆشبو حوزنی موکریانی لەکتێبەکەیدا، باسی ئەوە دەکات کە عەلی کوڕی میر سولەیمان لەشوێنی باوکی دادەنیشێ، کەچی گومانیش هەیە، باشتر وایە بڵێین گومان لە وجاخ کوێری منداڵ هەبوونی میر سولەیمانـدا هەیە[٢]. ئەگەروابێ عەلی کوڕی لە جیگای دانیشتبێ ئەوە .ەوە دڵنیاین کە تەمەنی نەگەیشتۆتە ئەو رادەیە بتوانێ بەبێ پووری، واتە خانزاد.. کاروباری هەریر بەڕێوە ببات. بۆیە کە باسی تۆڵەکردنەوەو کوشتنی لەشکری دێتە مەیدان، جگە لەناوی خانزادەخان چ نێوێکی دیکەی ئەم بنەماڵەیە نایەت[٣]

● لێرەدا دەتوانین سەرەداوی باسەکەمان یان باشتروایە بڵێم ناونیشانی سەرەوەی باسەکەم بپێکێنم. لەوکاتەی لەشکری دەتوانێ میر سولەیمان لەنێو ببات.. لەگەڵ سوپای سۆران بەرەو هەولێر دەگەرێنەوە[٤]، چەند کەسانێك هەواڵی پیلانی لەشکری دژ بەمیر سولەیمان بەخاتو خانزاد دەگەیێنن! ئەویش واتە لەشکری لەگەڵ دارودەستەی تایبەتی خۆی لەترسی خانزادو خەڵکی هەریر بەرەو شنگار سەرهەڵدەگرێو دەڕوا.

بەڵام مەراقی تۆڵەکردنەوە ئۆقرە لە خاتو خانزاد هەڵدەگرێ، بۆیە بەهەرجۆرێك بێ هەوڵی ئەوەی داوە لەشکری بگەرێنێتەوە هەریر تاکو تۆڵەی کوشتنی میر سولەیمانی برای لێبکاتەوە، وادەردەکەوێ لەوکاتەدا خانزاد یان سوپای سۆران توانای هێرش کردنی بۆسەر لەشکریو ئەوناوچەیە نەبوە. بۆیە هەروەکو دەگێرنەوە خانزاد بانگی مەلای هەریر دەکات و نامەیەکی بۆ لەشکری پێدەنووسێو تێیدا دەڵێ: «هەریرو سوپای سۆران بێ‌ی تۆ شپرزەیەو میرایەتی سۆران بەمن ناکرێ، خۆت شیاوی ئەو مەنزڵەی.. بۆیە داوات لێدەکەم بەزووترین کات لەگەڵ گەیشتنی ئەم نامەیەم بەرەو هەریر بەرێبکەوەو خوزگەی رابوردووشت جێبەجێدەکەم، تا ئێستایش لەتۆم شیاوتر نەدۆزیتەوە ببێتە مێردم»!.

کاتێ نامەی مۆرکراو دەگاتە دەست لەشکری، هەرچەندە دارو دەستەکەی ئامۆژگاریان کردووە کە ئەم نامەیە فێڵە، بەڵام وشەی میرایەتی سۆران و مێردکردن گیانی لەشکری هەژاندوە، بۆیە دەست و برد لەگەڵ سەد سوارچاکی خۆی بەرەو هەریرو ئەڤینی خانزاد دەکەوێتە رێ...

کاتێ هەواڵی نزیك بوونەوەی لەشکریو دارودەستەی دەگاتە خانزاد، دەست دەکاتە جێبەجێکردنی پیلانی تۆڵەکردنەوە. خانزاد بەخۆیو سەد پیاوماقوڵ پێشوازی لەشکری دەکات و هەریەك لەو پیاوماقوڵانە جڵەوی سوارێك لەو سوارانەی لەشکری دەگرێو بەرەومالی خۆیان دەبەنەوە. خانزادیش جڵەوی ووڵاخی لەشکری دەگرێو بەدەم پێکەنینەوە بەخێرهاتنێکی گەرمی دەکات و فەرمووی ماڵەوەی لێدەکات.

لەوکاتەی لەشکریو خانزاد بەجووتە دەگەنە دیوەخانە گەورەی هەریر، خانزاد بەدوای مەلادا دەنێرێو بەدەستووری ئاینی ئیسلام خۆی لێمارە دەکات و فەرمان دەدات ژووری تایبەتی بۆ لەشکری برازێندرێتەوە، لەوکاتەی دیوەخان چۆڵ دەبێ لەشکری دەست بۆ خانزاد درێژ دەکات بەمەبەستی چوونە ژووری تایبەتی خۆیان.. خانزاد پێ‌ی دەڵێ: «ئەوە خۆزگەم جێبەجێ کردی، بەڵام لەبەر خەڵکی هەریر شوورەیی‌یە چونکە هەروەکو خۆت دەزانی تا ئێستایش تازیەدارم، هەر ئەمشەوەم رێگا بدە، بەیانی لەگەڵ دەستە خوشکانم دەچمە گەرماوو جلی رەشم فرێ دەدەم، شەوی دادێ دەکەینە جەژن و ئاوری دڵت بکوژێنەوە».

لەگەڵ سپێدە هەروەکو باوبوە، خانزاد جلی سووری غەزەب لەبەردەکاو بەپێ‌ی پیلانەکە لەشکری پەل بەست دەکرێو لەسەرچۆك بەرامبەر بە کورسی‌ی خاتو خانزاد چۆك دەداو هەریەك لەو سەد پیاوماقوڵانە سەری میوانەکانیان لەبەردەم خانزاد دادەنێن! بەمەیان لەشکری بۆی دەچەسپێ کە ئەمرۆ ڕۆژی تۆڵەکردنەوەیەو ڕۆژی سزای بێگانە پەرست و تاوانبارانە.

لەدوای موحاکەمە کردنێکی سەرپێ‌یی لەسەر خاکی هەریرو بەرامبەر بە خەڵکی هەریر لەشکری دەگاتە سزای تاوانی خۆی. هەرچەندە لەشکری لەکۆتاییدا هەست بە گەورەیی تاوانی خۆی دەکات و دواوا لەخانزادو خەڵکی هەریر دەکات کە ماوەی بدەن چەند بەندێك بە میری خۆی واتە میر سولەیمانـدا هەڵ بڵێ! هیچ نەبێ دەروونی خۆی ئاسوودە بکات[٥]!! ئەمەیش بەشێکی بەندەکانە:




**«ئەگەر دەچووەمە مەجرسی سولەیمان بەگی قولی بەگان چەند وەزیر دانیشتبوون هەمووی کەوری قاقۆمی لەسەر ملانەو باسقەنەی پارسەمەن و مۆدنی کارەبایان دەکەوتەوە سەرلێوان، دەیانکردە تەکبیرو مشاوەران و مەهارە»**

● دەربـارەی دووەم پروپـاگەندەی مێرکردنی خانزاد ئەوەیە هەروەکو دەگێڕنەوە.. گوایە دوا بە دوای لەناوبردنی لەشکری ئاساییش دەگەڕێتەوە سۆران و خانزادیش حەوت ساڵ فەرمان دەگـێڕیّو لەوەمـاوەیـەدا ناوچەکە پەرە دەسێنیّو دەبوژێتەوە، چەنـدان قوتـابخـانـەو شوێنی پەناهەندان و قەڵاو مزگەوت دروست دەکریّو لەهەموو لایەك خەڵك بەتایبەتی قوتابی روو لە هەریر دەکەن، خانزادیش وەك دادپەروەرێك سەرپەرشتی ئەو موڵکـە دەکـات و شەوانیش لەگەڵ بڕواپێکراوانی خۆی بەناو خەڵکـەکـەدا دەسـووڕێتـەوە، شەوێکیـان لەوکاتەی خانزاد خاتوون دەگاتە بەردەم دەرگای فەقێیەکان گوێ رادەگرێ ئەوە سێ فەقێ خۆزگە دەخوازن و دەڵێن: «یەکێکیان خۆزگەی یەك هەمبـانـە لیرە دەخـوازێو دووەمیش خۆزگـەی ماینـەکوێت دەخـوازێ، سێیـەمیش کە گوایـە ناوی فەقێ ئەحمەد دەبێ خۆزگە دەخوازێ یەك شەو لە باخەڵی خاتو خانزاد بخەوێ»!

بۆ بەیـانی خانـزاد بەدوای ئەو سێ فەقێیانە دەنێرێو خۆزگەی یەکەم و دووەم جێبەجێ دەکاو دەڕۆن، ئینجا بانگی مەلای هەریـر دەکات و خۆی لەفەقێ ئەحمەد مارە دەکات و شەوێـکـی لەگـەڵا دەنـوێو بۆ بەیـانـی فەقـێ ئەحمـەد شاربـەدەردەکـا. لەدوای نۆ مانگ و نۆ رۆژە کوڕێکی دەبێو فەرمـان دەدا کە ئەو کۆرپـەیـە فڕێبـدەن! یەکـێـك لە خزمەتکارەکانی، کۆرپەکە وەردەگرێو لەگوندێکی لاچەپ لەلای پیرەژنـێـکـی دادەنێو خۆیشی سەرپـەرشتـی دەکـات و لەبەرخوێندنی دادەنێو فێری سوارچاکیو مەشق زانینی دەکات.

لەدوای بیست ساڵێـك دا لەخۆپیشاندانێکی سوپایی، خانـزاد چاوی بەسـوارچـاکێـك و مەشق زانێـك دەکـەوێ ئیللاماشاڵلا، خانزادیش هەناسەیەکی سارد هەڵدەکێشێو روو لەهەمان خزمەتکارەکە دەکات و دەڵێ: «ئەو سوارچاکە شێوەی زۆر لە میر سولەیمـانی برام دەکـات، خۆزگە کوڕەکەی فەقێ ئەحمـەدمـان فڕێ نەدابـوایـە ئێستـا وەك ئەم سوارچاکەی لێدەهات و دڵم پێی شاد دەبوو». خزمەتکارەکەیش بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە دەڵێ: «خاتوون چیت لێبشارمەوە بەگۆڕی میر سولەیمانی، ئەوە کوڕەکەی تۆو فەقێ ئەحمەد[٦]»!

● بەڵگەیەکی دیکەی شوونەکردنی خانزاد کە لەم دوایەدا لە رێگای مامۆستا شێخ جەعفەر شێخ حەسەنی بەرزنجی کە لە دەسنـووسێکی جەنـابی باوکیـدا دۆزراوەتەوە پێم گەیشتوە، سەربڕدەکە دەڵێ: «لەکاتی فەرمانڕەوایی خاتو خانزاددا عەلی عاشقی شاعیرو سەید عەلی نێوێك بەدوو قوڵی حەز لە خانزاد دەکـەن، کاتێ هەواڵی ئەو دوو عاشقـە دەگاتە خانزادەخان، رۆژێکیـان خانزاد دێتە سەرکانیاوی هەریرو بانگی ئەو دووە دەکـات و دەڵێ: «دەمەوێ خۆشەویستیی ئێوە تاقیبکەمەوە، فرمێسکی کامەتان گەیشتە بن ئەو کانییەو بگەڕێتە سەرەوە واتـە فرمێسکەکە تێکەڵ بەئاوی کانییەکە نەبێ عیشقی ئەو راستەو، دەبمە حەڵاڵی ئەو»!

لەدوای ئەو تاقیکـردنـەوەیـە عەلی عاشق سەردەکەوێ چونکە خۆشەویستییەکەی مەجازی بووە، ئینجا خانزاد خۆی لێمـارە دەکـات و لەشـەوی زاوابـوونیـدا عەلی عاشق دێتـە بەردەرگاو هەردوو دەستی لەدەرگاکە گیر دەکاو ئەو شیعرەی

خوارەوەی بۆ دەخوێنێتەوە.. کاتێ عەلی عاشق لە شیعر خوێندنەوە دەبێتەوە، خانزاد بانگی دەکات کەچی ئەو لەشوێنی خۆی ناجوولێتەوە، ئینجا لێی نزیك دەبێتەوەو دەستی بۆ درێژ دەکاو لەگەڵ راکێشانی خانزاد، دەستی عەلی عاشق لەبنەوە دەردێ! بەم شێوەیە بە عەشقی پاك و مەجازی عەلی عاشق دەسووتێو ئەپرووکێ»!!

**بەخێرهاتی پەریزادە، بەسەرچاوی دەمن شالان**
**بەچیم زانی کەتۆ هاتی، بەدەنگی تەوق و خرخالان**
**بەرەنگی بازن و بەندان، نەت هێشت عەقلی عەقل مەندان**
**چەندی دەڵێم هەزار هەندان، تۆم چاتری لە هەوالان**
**تۆم چاتری لە لەیلایێ، شیرین تری لە زلێخایێ**
**مەم و زین هەردوو یەکتایێ، بەوان زولفان دەمکەن تالان**
**سیاە زولفی تۆ ناترسی، لەمەو ئەحوالمان ناپرسی**
**موبارەك بۆ توو ئەو کورسی، روونیش گوێ بدێرە عەبدالان**
**روونیش گوێ بدێرە وێ بەیتێ، دووج هەش مەشعەلا زەیتێ**
**دەسووتێن مەجلیسی مەی تێ، وەکو پووشی لە کەندالان**
**ئەگەر قەقنەس نەپەروابم، ببرن سەرم جوادانابم**
**وەز خەزێمم قەت تێر نابم، لەدیداری خەت و خالان**
**لەدیدارت ئەز تو ژینکەم، ئەگەر مردم روحم تینکەم**
**بەحەسرەت جارەکێت بۆنکەم، خودانی چیتو دەسمالان**
**خودانی چیتو جەبهەت بی، خەراجی ئەرزت قیمەت بێ**
**دیداری تۆم بە قیسمەت بێ، لەعیدو جەژنی سەر سالان**
**ئەوان عیدو ئەوانی من، عەزیزو نێوچەوانی من**
**دوری قیمەت گرانی من، سەرو ماڵم چوون بە تالان**

● هەروەها لەبەیتی لاس و خەزاڵی ئۆسکارماندا بەهەڵە نووسراوە کەلاس کوری ئەحمەد ئاغایەو ئامۆزای خانزادە خاتوونە، لەم دەقە خانزاد کچی مەحموود ئاغا نێویکە، کەچی لەراستی بەدەرەو بەڵگەی مێژوویی هەیە کە خانزاد کچی شاقولی بەگەو خوشکی میر سولەیمانە»[٧]

ئۆسکارمان دەڵێ: «لاس و خانزاد هەر لەمنداڵیەوە لێك مارەکراون، بەڵام کە لاس چاوی بە خەزاڵە شۆری مەلا نەبی‌یان دەکەوێ بۆی شێت دەبێ» لەئەنجامدا بۆ یەکتر نابن و خانزادیش بەدڵ شکستی دەگەرێتەوە ناو عێلی خۆی هەروەکو لەم بەیتە بۆمان دەردەکەوێ خانزاد دەڵێ:

**«مەلایان بانگ بکەن، بخوێنن یاسینێ**
**کورە کورەی باڵەکیان بانگ بکەن، بکەنەوە گەرمەشینێ،**

یان دەڵێ:

**«ئەوجار بەجارێکی لاس دەمری‌و رادەبری**
**خانزادو خەزاڵ قورێ لەخۆی دەگری**
**لاسیان هەڵگرت و بردیان لەبۆ قەبری**
**خانزادەخان بەدڵشکستی بۆ نێو عێلی باڵەکیان گەراوە،**

● لەئەنجامی ئەم سێ چوار رایانە دەربارەی شووکردن و نەکردنی خاتوو خانزاد، دەمەوێ کەمێك ئەو رایانە بەبۆچوونی خۆم و چەند بەڵگەیەك هەڵگێرو وەرگێر بکەم و تا رادەیەك خوێندەوار بگاتە ئەنجامێك. دەربارەی مێردکردنی خانزاد بە لەشکری بکوژی میر سولەیمان. هەرچەندە سەربردەکە خۆی لەخۆیدا ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کە لەشکری نەچۆتە پاڵ خانزادو لێی بەزاوا نەبوە، ئەو کارەی خانزادیش واتە نامە ناردن و گفت پێدانی بە لەشکری بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی خۆزگەی دوور زەمانەیی‌و لەئەنجامدا مێرد پێ‌کردنی هەمووی هەوڵ و تەقەلای بێ‌وچانی خانزاد بووە بۆ گەرانەوەی لەشکری‌و لەدوایشدا تۆڵەکردنەوە، هەرچەندە ئەوجۆرە فێڵ و پیلانانەیش کاری میرێکی راستگۆو دادپەروەرو خاوەن دیوەخان نەبووە، چونکە ئەوجۆرە رەوشتانە لە عورفی کوردەواریدا بەدەرە.

بەڵام لاوازبوونی فەرمانرەوایی ئەودەمی سۆران و هەژانەوەی بارودۆخی ناوچەکە بەهۆی لەنێوچوونی میر سولەیمان بووەتە هۆی نەتوانینی زاڵ بوون و تۆڵەوەرگرتنەوەی خانزاد لە لەشکری‌و دارودەستەکەی، دووریش نیە خانزاد بیری لەوەکردبێتەوە کە تۆڵەی میر سولەیمانی برای بەهەمان شێوە بکاتەوە کە لەشکری میر سولەیمانی پێ لەناو بردووە واتە: (زوڵم و غەدرکردنەکە)، هەروەهایش خانزاد لەو تۆڵەکردنەوەیەدا پەیرەوی ئامۆژگاریی ئاینی ئیسلامی کردووە کە دەڵێ: «العین بالعین والسن بالسن». لەئەنجامی ئەم




سەربردەیە بۆمان روون دەبێتەوە کە خانزاد خۆی لە لەشکری مارە کردووە بێ ئەوەی سەرجێی یەکتر بکەن و ئەمەیش هەروەکو لەسەرەوە باسمان کرد بۆ دڵنیابوونی (کاتی) لەشکری بووەو ئەنجامی سەربردەکەیش بۆ خوێندەوار روون و ئاشکرایە.

لەرای دووەمدا واتە شووکردنی خانزاد بەفەقێ ئەحمەد بۆ شەوێك لە خەیاڵ بەدەرە، چونکە ئەقڵ ئەوە پەسند ناکات میرێك وەك خاتو خانزاد یان هەرنەبێ کچە میرێك بەم شێوەیە شوو بکات. بەڵام موبالەغەکردنی خەڵکی کوردەواری بەدادپەروەری خاتو خانزادی میر، یان سەرپەرشتیاری ناوچەیەك ئەو رووداوەی بەم جۆرە بۆ ئەوەی نوێ رازاندۆتەوە، ئەگەر وایش بێ لەهیچ دەورو زەمانێك نەبوە ئافرەتێك بەپێی شەریعەتی ئاینی خۆیو لەبەردەم خەڵکی ووڵات مێرد بکات و لەدواییدا منداڵی ببێو لەخووت و خۆراییدا فڕێی بدات، بەهیچ جۆرێك داب ونەریتی کوردەواری پەسندی ناکات، جگە لەوجۆرە کارە ناپەسند.انە کە ماوە ماوە لە سووچێکی ووڵاتدا بەناشەرعانە روو دەدات، کە ئەمڕۆ دوێنێ پێی دەوترێ بیژی (زۆڵ)، بۆ بەچێژکردنی ئەم ناشەرعیەیش ئەم دوو دێرە شیعرەی نەزار قەببانی دەکەمە نموونە کە دەڵێ:

**«شکراً ساسقط ذلك الحملا**

**انا لا أرید له أبا نذلا»**

بەڵام خۆشەویستی خەڵك بۆ خانزادی سۆران و دادپەروەری ئەویش لەگەڵ خەڵکەکەدا، رووداوەکە ئەم شێوەی بەخۆگرتووە، هەروەها گەورەبوونی منداڵەکەو بوونی بەسوارچاکێك و مەشق زانێك، لەدواییدا سەرسوورمانی خانزاد بەو سوارچاکە هیچ نەبێ هەروەکو لەسەربردەکەدا دەڵێ ماوەی بیست ساڵێك.. ئەمەیان لەئەقڵ بەدەرە چونکە فەرمانڕەوایی خانزادو هەموو سەربردەیەکی سەر زارەکی ئەوە دەسەلمێنێ کە خانزاد لەدوای میر سولەیمان بە حەوت ساڵ مردووە، بەمە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم شووکردنەیشی ناتەواوە بە واتایەکی دیکە هەر نەیکردووە.

دەربارەی رای سێیەم و سەربردەی عەلی عاشق تا رادەیەك بەراستی دەزانم چونکە کۆتایی سەربردەکە ئەوە دەسەلمێنێ کە نەچۆتە لایو دەستیشی پێنەکەوتووە، بەڵام لایەنە ئەفسانەییەکەی نێو سەربردەکە وەك (فرمێسك تێکەڵ بە ئاوی کانیەکە ببێ) هەروەها (سووتان و توانەوەی عەلی عاشقی لەکۆتایی شیعر خوێندنەوەکەدا) ئەمانە هەمووی شێوەی دارشتنی سەربردەکەمان بەرەو ئەفسانە دەبات، چونکە شارەزاییم لەسەرووبردەی عەلی عاشقی شاعیر نیەو بەدووری نازانم ئەم شیعرە ئەگەر هی عەلی عاشق بێ بە یەکێکی دیکەی هەڵکوتبێو ئێستایش بووەتە پێهەڵدانی خانزاد. ئەگەر بێتو سەرنجێك بدەینەوە ناوەرۆکی شیعرەکە چاومان بەوشەی (قەقنەس) دەکەوێ، هەروەکو دەگێڕنەوە گوایە قەقنەس جۆرە باڵندەیەکەو سێسەدو شەست کون لەدەنووکی هەیەو هەر کونەی جۆرە ئاوازێکی لێدێتەدەر، لەئەنجامدا لە عیشق و خۆبەخت کردنی خۆیدا هەڵدەبزروکێ. دوور نیە ئەو سووتانە ئەفسانەییەی قەقنەس بوبیێتە هەوێنی سەربردەکەو ڕێز لێنانی چیرۆك گێراوەکە بۆ خۆشەویستییە مەجازیەکەی عەلی عاشق بەرامبەر بەخونچە گوڵی خۆی. هەروەکو لەسەرەتادا سەربردەکە خۆی لەخۆیدا دەچەسپێنێ کە ئەو مێردکردنە سەری نەگرتوە بۆیە پێویست بەرای ئێمە ناکات.

بەڵام دەربارەی مارەکردنی لاس و خانزاد، خۆی لە خۆیدا بە بەڵگەی مێژووییەوە هەروەکو لەسەرەوە باسمان کردووە هەڵەیەو سەرەرای ئەوەیش لەبەیتەکەدا بۆمان دەردەکەوێ کە لاس و خانزاد بۆ یەکتر نەبوون. بەڵام

سەربردەکە بەگشتی تەواونیە.

**لەکۆتاییدا بە یەقینەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە خاتوو خانزادی سۆران بەهیچ جۆرێک شووی نەکردووەو بەبێ مرازی بەژن و بالآی نەونەمامی سەری ناوەتەوە ژێر گڵ. بۆیە تا ئەمڕۆش کەسەری ئەو بابان وێرانە تێکەڵ بەکەسەری کل وکلچووک لەپاش بەجێماو دەبێ! خانزادیش مێردی نەکردووەو ئیتر تازەیش نایکات.**

### پەراوێزەکان

١ـ لەفەرمانڕەوایی میر سولەیماندا، هێرشێکی دڕندانە کراوەتە سەر گوندەکانی کوردە ئێزدیەکان و تالآنیان کردوون و گەلێ ئافرەت و پیاوو منداڵیان بەدیل هێناوەو زەرەرێکی یەکجار زۆریان لەو کوردانە داوە، گوایە لەشکریش یەکێکە لەو هەزارەها دیلانە، لەجوانیداو هەروەها دەڵێن لە وەجاخ کوێری خۆیدا میر سولەیمان وەک کوڕی خۆی پەروەردەی دەکات تا دەبێتە سەرکردەی سوپای سۆران، کاتێ لەشکری گەورە دەبێ‌و فام دەکاو قینی تۆڵەکردنەوە لەدڵی دەچەسپێ بۆیە لەسەفەرێکیدا لەگەڵ میر سولەیمان بۆ بەغدا، پیلانی بۆ دادەنێتەوە لەئەنجامدا بەفنجانێک ژەهری مار لەنێو دەچێ. دوا بەندی لەشکری لەم بارەیەوە دەڵێ:

**«ئەمان سەد حەیف و دوازدە موخابنێ دونیایێ**
**دەمینێ لۆ یەکەکی وەکی سولەیمان بەگی میری**
**لەشاری کاولە بەغدایێ بە فنجانەکە ژەهری**
**مارێیان کرد شرارە»**

٢ـ لەپەراوێزی یەکەمدا ئەو رایە هەیە کە میر سولەیمان وجاخ کوێر بووە بۆیە لەشکریی بەخێوکردووە. هەرچەندە خوالێخۆشبو حوزنی موکریانی نێوی عەلی کوڕی میر سولەیمان دەبا کە لە دوای باوکی فەرمانڕەوایی کردووە، کەچی لەکاتی کوشتنی میر سولەیمان ناو هەر ناوی خانزادی سۆرانە، هەروەها موکریانی دەڵێ پاشماوەی ناوی عەلی میر سولەیمان گەلی عەلی بەگە، ئێمەش لەسەر زاری خەڵکی ناوچەکە سەربردەی بەدیل گرتنی عەلی بەگی داسنیم لە کتێبەکەم لیرەیەک لەگەنجینەی نەتەوەی کورد پەراوێز (٤) کە لە ساڵی ١٩٨٤ بە یارمەتی ئەمیندارێتی گشتی ڕۆشنبیری‌و لاوان چاپکراوە. نووسیومانەو کۆتاییەکەمان بەم دوو وێنە شیعرە تەواو کردووە: کاتێ دایکی عەلی بەگی داسنی دێتە ڕواندوزو هەواڵی کوڕی لە دایکی میر محەمە[...] ـرسێ‌و دەڵێ:

**«هەی عەنبەرێ عەنبەرە جوانی**
**لوم وەرە ناو کەرێی دیلانێ**
**بەئەشقێ مەلەکێ تاوس، مەنزڵی عەلی بەگی، ئەکلانێ»**

دایکی میریش وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ:

**«ئەرێ موعتێ موعتە جوانێ**
**سەری شین بکەی لەکووپێ خەخلێ**
**هەوڕۆ سێ ڕۆژە مەیتێ عەلی بەگیان ناردەوە ئیزدی خانێ»**

هەرچەندە دوو ڕامان لەبەردەستە دەربارەی دیل عەلی بەگی داسنی ڕای یەکەم ئەوەیە کە لە شەڕێکدا بەخۆی‌و ماڵ ومنداڵی گیراوە لەدوای ماوەیەک بەفتنەی هەندێک کوژراوەو تەرمی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەزارکی گەلی ڕواندوز هەڵواسراوە بۆیە ئەو گەلیە بە ناوی ئەو کراوە. لەکاتی‌خۆیدا بەر لەتێکچونی زار گەلی گۆڕێک واتە قەبرێک بەناوی عەلی بەگ هەبوو بەلآم ئێستاکە نەماوە.

ڕای دووەمیش هەروەکو جارێکیان مامۆستا طاهر ئەحمەد حەویزی خاوەنی مێژووی کۆیە بۆمی باس کرد: کە گوایە میر محەمەد پاشا بابەکر ئاغای کۆیە بەسوپاوە دەنێرێتە سەر ئیزدیەکان بەلآم بابەکر ئاغە شەڕ ناکاو ئەوانیش واتە علی بەگی داسنی ژنێکی پێشکەش دەکات لەچاکەدانەوەی بۆ ئەوەی ڕێخەلوکیان واتە خوێنیان تێکەڵ بێ، ئینجا عەلی بەگی داسنی جارێکیان سەردانی کۆیە دەکات و دەبێتە میوانی بابەکر ئاغای خزم و زاوا، کاتێ میر محەمەدی پاشا بەو میوانداریە دەزانێ بەرەو کۆیە دەکەوێتە ڕێ بۆ ئەوەی عەلی بەگی داسنی داوەت بکات. هەرچەندە بابەکر ئاغە بە داسنی دەڵێ ئەگەر میر داوەتی کردی بۆ ڕواندوز مەچو چونکە هاتنی تۆ بۆ لای من مەزاجی تێک داوەو ئەم درکە لەژێر پێ‌ی من وتۆ دەردێنێ. بەلآم غیرەتی داسنی ئەوە قبوڵ ناکات کاتێ میر فەرمووی میوانداری دەکات دەچێ بۆ ڕواندوز لەوێوە لەسێدارەی دەدات بە زارکی گەلی هەڵدەواسێ... تاد.

٣ـ هەرچەندە خوالێخۆشبو محەمەد ووردی لەکتێبەکەیدا خانزادو لەشکری دەڵێ عەیشێ خێزانی میر سولەیمان ئافرەتێکە لەو ئافرەتە دیلانە. منیش لە ئامیلکەکەمدا لەپەراوێزی (١٩) ئەوەم ڕوون کردوتەوە کە کچی حوسێن بەگی ئامۆزازای میر سولەیمانە، چونکە لە بەیتەکەدا ئەوەمان بۆ دەسەلمێ دەربارەی یارمەتیدانی خانزاد بۆ تۆڵەکردنەوە عەیشێ‌ی خێزانی میر سولەیمان هەوڵی داوەو نامەکەیان بەجووتە بۆ لەشکری نووسیوە، سەرەڕای مەلای هەریر.

٤ـ موکریانی دەڵێ: «لەکاتی گەڕانەوەی لەشکری لە بەغداوە بۆ هەریر، تەرمی میر سولەیمان لە هەولێر دەنێژن.

٥ـ بڕوانە بەیتی ئایشەگوڵ. بەیتی لەشکری ل ٢٧ ـ ٣٢.

٦ـ هەرچەندە لەعورف فەرمان ڕەواییدا میرایەتی بە پشتە نەک بە سک، بەلآم ئەگەر خانزاد شووی بکردایەو منداڵی هەبووبێ ئەوە بێگومان نێوی لە لاپەڕەیەکی مێژووی میرانی سۆران دەهات.

٧ـ بڕوانە شەرەفنامەو میرانی سۆران. پەراوێزی (٢٩) لە کتێبی لیرەیەک لە گەنجینەی نەتەوەی کورد.

### سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتوە

١ـ شەرەفنامەی شەرەف خانی بەدلیسی، گۆڕینی هەژار ١٩٧٣.
٢ـ مێژووی میرانی سۆران حوزنی موکریانی ١٩٦٢.
٣ـ بەشی یەکەمی تحفەی مظفریەی ئۆسکارمان ١٩٧٥.
٤ـ لیرەیەک لە گەنجینەی نەتەوەی کورد. ئەسعەد عەدۆ ١٩٨٤.
٥ـ بەیتی ئایشەگوڵ. ئەسعەد عەدۆ ١٩٨٣.
٦ـ نامەیەکی مامۆستا شێخ جەعفەر شێخ حەسەن بەرزنجی خاوەنی تەکیەیی شێخ حەسەن لە محطەی هەولێر لە ١٨/١١/١٩٨٨
٧ـ گفتوگۆیەک لەسەرەتای ساڵانی ١٩٨٠ لەگەڵ مامۆستا تایەر ئەحمەد حەویزی خاوەنی دوو بەرگی مێژووی کۆیە.



# لەپێناوی بوژاندنەوەی فۆلکلۆرو کەلەپووری نەتەوایەتیماندا

مولود قادر بیخاڵی

ئاشکرایە نووسەرانی فۆلکلۆری کورد لە کوردستان دا لەهێچ قوناغێکی ئەم مەیدانەدا لە هەوڵ دان و کۆشش نەکەوتوون بۆ ڕێگا کردنــەوەو چەسپانــدنی بیرو رای مرۆڤایەتی، چونکە نووسەری فۆلکلۆر ڕۆڵەی گەلەو بیرو باوەری لە ناخ و دەروونی گەلەکەیــەوە سەرهــەڵدەدات و، هەســت و کەرەســتــەی بەرهــەمــەکـانی تەنیـا لەیەك سەرچاوە هەڵدێنجێت، ئەویش برێتی‌یە لە خستنە ڕووی گێروگرفتی کەلەپورو داب و نەریت و، دۆزینەوەی شەقامێکی ڕاست و ساغا بۆ بوژاندنەوەیان و سەرکەوتنیان.

ئێمــەی فۆلکلۆر پەروەر پێــویستــە لەسەرمان وەك بیل بیلەی چاومــان ئەم کۆرپــە ساوایــەمــان بپــارێزین و، هەموو هێزو توانـایــەکمــان تەرخـان کەین بۆ چەسپــانــدنی ئەم لایــەنەو گەشــەپێــدانی، تابیێتــە مەشخەڵێکی تروسکەدار بە تیشکی خۆی هەمــوو کون و کەلەبــەرێـك لە کوردستــان دا ڕووناك بکاتەوەو هەر بیرو ڕایەکی پرو پوچیش دەربارەی کەلەپورو داب و نەریتی نەتــەوایەتی هەبێت ڕای ماڵیت، تا نەبێتە کوسپ و تەگــەرە لە ڕێگــای بوژانــەوەی چونکە ئەگەر چەند هەنگاوێك بەدوادا بگــەڕێینــەوە دەبێنین لەناوچەی کوردستان دا یەکەم جولانەوەی فۆلکلۆری بۆ کەلەپورو داب و نەریتی کوردەواری بەچاوێکی تەسك تەماشای کراوە یا بە تیژو توندی پیش بری لێکــراوە، بەڵام بەکــوڵ نەدانی نووســەرانی ئەم مەیــدانــە هەرچاوتەسکیەکی بەرامبەر بە «پەندی پێشینان و، ئەفسانەو، هەقایەتەکانی» نەتەوەکەمان هەبوو لادران، جا بۆ خۆهاندان و گەشانەوەی کەلەپوری نەتەوایەتی پێویستە بگەڕێینەوە پێش مێژووی زانستی، چونکە ڕێو پۆپی گەلێ دوورترەو پەیوەندی بە مێژووی کۆنمانەوە هەیە، ئەم هەڵوێست و ئاووردانەوەیەش دەمان گەیێنێتەوە کەلەپوری نەتەوەکانی دەوروبەرمان.

ئەوەتــا وولاتــانی پێشکەوتوو هەر لە کۆنەوە کەوتوونەتە خۆ، بەگورج و گۆڵی ڕوویان کردۆتە کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی داب و نەریت و کەلەپوری نەتەوەکەیان، چونکە داستانی قارەمانیەتی و ئەڤین و دڵداری، بەردەوام لەژێر نسێی فۆلکلۆردا کۆدەبنەوەو دەبــوژێنەوە. بەدرێژایی مێژوو گەلان لە خەبات و تێکۆشانی فۆلکـلـۆری بێ‌ووچــانــن و، بیرو لێکــدانــەوەی خۆیــان لەم زۆرانبازیەدا وەدەست دەهێنن و بابەت و بەرهەمی بەپێزو بەتام و بۆ دەخولقێنن، تا باری دوارۆژیان وەك ئاوێنە بریقە بداتەوە.

ئێمەی کوردیش داب و نەریت و کەلەپورێکی فۆلکلۆری گەلێ بەپێزو فراوانمان هەیە، ئەگەر لەهی نەتەوەکانی تر زیاتر نەبێت کەمتــر نییەو شان بە شانی کەلەپوری نەتەوەکانی سەر ئەم زەمینە سیماو هەناسەو ئاواتی مرۆڤی کوردی پاراستووە.

جا هەر نەتــەوەیــەك چەند ووشیاربێت پتر دەتوانێت سامانە شاردراوەکــەی بپــارێــزێت و بەرەو پێشــەوەی ببــات، ئەم لێکــۆڵینــەوەی کەلەپــوری نەتــەوایەتی، هاوبەشیمان دەگەڵ

نەتــەوەکــانی تری عیراقی خۆشــەویست لە پێنــاوی وەپێش خستنی فۆلکلۆر زیـاتر بەتین دەکات گومانی تێدا نیە هەموو نەتــەوەیــەك لەســەر زەمینەدا خاوەنی سامانێکی گران بەهای کەلەپـوری فۆلکلۆری نەتــەوایەتی خۆیەتی‌و هەردەم شانازی پێــوە دەکــات و، سوودی لێ وەردەگــرێت، چونکــە فۆلکلۆر بەســەرچــاوەیــەکــی گرنــگ و بنچینــەی ئەدەبی نووسراو دادەنــدرێت، مامــۆستــای نەمرو خوالێخــۆشبــوو علاءالدین السجادي لەپەرتوکی مێژووی ئەدەبی کوردیدا فەرمویەتی:

**«کــەلەپــوری فۆلکلۆری کوردی، ئەو گەوهــەرەو وشە جوانانەن کە لەدەم و لێوی شاعیرو ئەدیب و نووسەری ئەو قەومە دێتە دەرەوە».**

**«دیســان کەلەپور وەك چۆن ئەمەیان دەگرێتەوە ئەوەش دەگرێتەوە، هەر شتێك بەزوبان لەهەر زەمانێکدا دەربارەی زانست، یا دەست کردێکی جوان، یا پیشــەیــەکی نایــاب گوتــرابێت** لەســەر ئەم قســەیە هەر شتێك شاپەری خەیاڵی شاعــیرێــکــی، دەســت نەخشێنێکی ـ دەست ڕەنگینێکی، یا پیشەکاری پیشە سازێکی گەیشتبێتێ کەلەپورەو بە مێژووی کەلەپور دادەندرێت چونکە مێژووی کەلەپور بربرەی مێژووی رامیــاری‌و ئابــوری‌و کومــەڵایەتی گشت نەتەوەیەکە، فۆلکلۆر ڕوونــاکیــەکی مێــژووی تایبــەت بە ڕۆشنبیری یەتیەو؛ بەڵکو هەوڵدانیکە بۆ بوژاندنەوەو کارتی‌کردن و گۆرینەوەی جورەها ڕۆشنبیریی، جا چ لە نێوان ئەورووپای پیشکەوتوبێت یا لە نێوان گەلانــی جیهــانی سێــیــەم دا بێت یا لەنێــوان ڕۆشنبــیریی پیشکەوتووو دوا کەوتو دابێت، مێژوو بە درێژایی ڕۆژگار ئەم جۆرە ڕۆشنبیری‌یەی گەیاندۆتەوە یەك، دووریش نیە یەکێك لەم جۆرە ڕۆشنبــیریە ماوەیەك بڵاوبووبێتەوە، کۆنترین چیرۆك کە گەیوەتە دەست زانایانی ئەم مەیدانە ئەگەر نەختێ بە ووردی تەمــاشــای کەین پریەتی لە ئامۆژگاری‌و تاقی‌کردنەوەو شتی بەســوودو بەکــەڵك، ئەو شتانەی کە ئێستا گویمان لێ دەبێت دەربارەی فۆلکلۆرو داب و نەریتی نەتەوایەتی، گەلێکیان لە زۆر شوێــنی سەر زەمینــدا هی دەوری هەوەڵی ئادەمیــزادە هەر ماوەتەوە، وەك داستان و ئەفسانە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر باش سەرنجی بدەینێ لەچاو چەند چەرخێکدا هەر پیشکەوتووە، وەك لە چیرۆکــەکــانی بابــل و ئەفســانەی گوێ ئاگردانی کوردو، داستــانی هێنــدو، ڕازی میسریــەکــانــدا دەبینــدرێت ئەمانە هەمــوویــان بونــەتــە هۆیــەکی سەرەکی ـ کە خۆیــەتی تاك «شخصية فرد» تۆزی دەرکەوێت، بەڵام پاش یاسای ئۆتۆگراتی «حــکمی مطلق» نەتــەوە شارستــانیــەکــان لەم سەردەمــە ووشیاربونەوەو ڕویان کردە شانۆگەری‌و لاساکردنەوەو باس و خواسی ئاینی‌و ئەفســانــەی پروپوچ، وەك دەبینین لە بابل دا پادشــاو کاهینــەکــان لەکــاتی چونــە کۆبــونــەوەی ئایینی‌و پەرستگــاکــان جل و بەرگێکی وایــان دەبەر دەکرد لە شێوەی شانۆگەری دەکرد، میسریە کۆنەکانیش هەڵپەرکێ‌و مۆسیقایان لە پەردەیەکی شانۆگەری ئایینیدا دەگێرا، وەك چۆن کوردەکان گەلێجــار ڕەووشتی ئاینیــان لە شێوازی هەڵپەرکێ‌و سەمادا نواندووە، یونانیەکانیش کە هۆمیرۆسی ـ شاعیر باسی دەکات ـ جەژنە پیرۆزەکانیان بە کۆبونەوەو سەماو گۆرانی‌و لاساکردنەوە بردۆتە سەر. نووسینی نەژادو هونەر لە دەوری ـ ئۆتۆگراتی‌دا پایەی هەر لەوەدابووە کە بە دەوری ئامۆژگاری‌و ئاینی‌و ڕازو نیازی جادوگەری‌و باس و خواسی جنوکە بدوێت.

هەرچەندە بەربەیانی کەلەپورو داب و نەریتی کورد تاریك بووە، بەڵام بەپێی دەسەڵات، ڕۆشنبیران کۆششیان کردوە بۆ زیندو کردنەوەیان، چونکە بیروباوەرو خوو ڕەووشتی باب و باپیرانیان بووە، گەلێکیان لە دەماودەمەوە خستۆتە سەر بەردو کاغەز. تا گەیــوەتــە ئێمــە ئیستاش هەروەکو لەسەرەتادا بێت هەروایە، بەدەم دەگــێردرێتــەوە. کارو کردەوەی رابــردووان، گەلێ ڕازو نیازیش هەن بەچاوی سووك تەماشایان دەکرێت، بەڵکە هەر بە شتێکی بێ کەڵك و بێ سوودی دەزانن، وەك ئەم شتانە بە «شەو لە دیوەخانان یەکێك بەدەم دەی‌گێرایەوە یا لە کاتی نوستندا بۆ ئاغــاو خانمــانیان دەگێرایەوە» تا خەویان لێ بکەوێت، یا پیرە داپیران «پیرە ژنان» لەگوێ ئاگردان بۆ مندالانیان دەگێرایەوە بۆ کات بردنــە سەرو خۆ خافــڵانــدن، ئەم جۆرە شتــانــە لەنێو کوردەواری پێیان دەڵێن ڕاز.

خۆ چیرۆك و هەقایەت ئێستاش زوربەی زۆریان هەر دەماو دەم دەگێردرێتەوە، سەرەرای ئەوانەی سەرەوە داستان ئەفسانەش هەن.

أ ـ داستان:ـ بەزۆری باسی ئازایىو كۆڵ نەدانی پاڵەوانانە لەجەنگدا.

ب ـ ئەفسانە:ـ میثۆلۆژیایشی پێ دەڵێن: ووشەی میثۆ لۆژیا بەم ئەفسانـانـە دەگوترێت كە پەیوەندییان دەگەڵ خواكاندا هەبـووە، گەلێ باسی میثـۆلۆژیـا كراوە چونكـە سەرچاوەیەكی گرنگی زاناكانی «یونان»ە ـ ئەیونان ـ دەڵێت:ـ ئەفسانە هێماو نیشانەیەكە بۆ ئەو شتە ـ نەفسیو رەوشتەی لە ئادەمیزادا هەیە. ئەسكـەنـدەرو، ئەفلوتـێن و، فەرفـەریس ـ یش ـ دەربـارەی ئەفسانە دەگەڵ ـ ئەیونان ـ دا جیاوازێیكی ئەوتۆیانئ نییە. بەلام هۆمیرۆس دەڵێت:ـ ئەفسانە تەنیا هێندێ قسەی خەیاڵیە، بۆ ئەو ئازایەتیو كارەساتانەی كە لەمێژوو رویان داوە، لەچیرۆكی «زیۆس»دا دەڵێت:ـ پاڵەوانێ هەبووە بەدەست و بازوو مەچەكی پتـەوو بەتێنو توانای گەلێ شوێنی داگیر كردووەو لە دورگەی «كریت»یش كۆچی دوایی كردووەو لەو دورگەیە نێژراوە بووە بە خواو بوتە بەڵگەیەكی چاك بەدەست پیاوە ئاینییەكانی كڵێسا. بەلام بە وەخـەبـەر هاتنەوەی ئەورووپاو دۆزینەوەی ئەمریكاو ئەفـریقـاو دوورگـەكـانی ـ ئوقیـانـوس ـ زانـاكـان چەنـد ئەفسانەیەكی ساویلكەیان وەدەست كەووت، بۆیە هێندێكیان دەڵێن ئەفسانە دەربرینی ئەو رەوشتە ئاینییانە دەداتەوە كە نەتەوەكانی دەوری هەوەڵ بە جۆرێكی خاویلكەو بێ سەروپا وەریان گرتووە بێ ئەوەی شتێ لە بناغەكەی ئاین بزانن، جا بۆ ئەوەی شتێ لە ئایینەكە بزانن ئەم قسەو هەقایەتانەیان بۆ هەڵ بەستوون...

## چیرۆك :ـ

ئەگـەر هاتـو چیرۆكی نەتـەوەیەكمان خوێندەوەو بە چاوێكی فراوان تەمـاشامان كردو لێمان كۆڵییەوە، گورج بۆمان روون دەبێتەوە كە ئەم نەتەوەیە تا چ رادەیەك پلەی بەرز بووەو چ خوو رەوشتێكیش لە نێـوانیاندا باو بووە. كورد لە ئاخر دەوریان وەكـو ژیـانی سەرەتاییان هەر لەسەر كۆچەرایەتی ماونەتەوە، بۆیە لە چیرۆكی كوردەواریدا، زۆرتر ئەو شتانەمان وەبەر چاو دەكـەوێت، كە دەگـەڵ ژیانی ـ رەوەندایەتیدا ـ دەگونجێت و ئاشناییان هەیە، لە شەرو شۆرو، لە تێكەوڵاوی ژن و پیاو، كەم چیرۆك هەیە لە كوردەواریدا لەم شتانە خاڵی بن.
كورد لەچیرۆك و ئەفسانەو فۆلكلۆرو داب و نەریتی نەتەوایەتی كۆنـدا زۆر دەوڵەمەندە؛ بەلام داخی گرانم تا ئێستا زوربەی زۆری كۆنـەكـراوەتەوەو نەنووسراوەتەوە، هەر شتێ هەبوبێت دەماودەم گێردراوەتەوە.

هەر ناوچەیەكی كوردستان بگریت هەزاران چیرۆكی فۆلكلۆری وای تێـدایـەو هەمـووی پڕیـەتی لە داستانی رابردوان و لە چۆنیـەتی ژیـانی كومـەلایەتیو لە پەندو ئاموژگاری، كەوابو ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی لە هەمـوو كات و سەردەمێكـدا بە فەرهـەنگێكی نەتـەوایـەتی یا «ئـەنسیكلۆپیـدیـا»ی كوردی دادەنـدرێت، بەتایبەت بۆ ئەو شوێخ و نێونەمامانەی بایەخ و گرنگی دەدەن بە كۆكـردنـەوەی كەلەپـووری نەتـەوایـەتیو پاراستنی لەدەست رۆژگـاری چەتوون. چونكە گەلێ لە زاناو فۆلكلۆرنـاسـەكـان لەم بروایـەدان كە سەرهەڵدانی زانستی فۆلكـلۆر بەنـدە بە بزوتـنـەوەی ـ رۆمـان ـ و بیرو هەستی روشنبیرانی گەل.

ئەلكـزەنـدەر كراپ ـ دەڵێت:ـ دوو شەپۆلی گەورەی سەرەكی فۆلكلۆری هێنایەوە بەر چاوان و بایەخ پێدان.
**یەكـەمیـان**:ـ خۆیـەتی مرۆڤ و وەخۆهاتنەوەی، دوەمیش ـ هەردوو هێرشـە گەورەكـەی فرنسـاییو پیشـەسازی، بەمانە فۆلكلۆر ناسەكان دەستێكی بالایان لەو مەیدانە پەیدا كرد، هەر لەو سەردەمیشـەوە باس و خواسی مرۆڤـایـەتیو، سك بەخۆ سوتان و بەوانیتر هاتە بەرچاوان، بۆیە ـ ماریت ـ ی زانای فۆلكلۆرو ئەنترۆپۆلۆژی دەربارەی زانستیی مرۆڤ دەڵێت:ـ ئەم زانستیـە قەرزاری ـ داروین ـ ە ئەگـەرچی بیروراكانی داروینیش لە هەنـدێ لا رەت دەكـرێنـەوە، جا سەبارەت بە ئەنترۆپۆلۆژی دەبێ بابەتی تر بخوڵقێنین.
كاك خالید جوتیار لە لاپەرە «١٤»ی پەرتووكی بەرەو فۆلكلۆردا

دەڵێت:ـ کە هەقـایـەتی بەر ئاگردانی برایانی گریم لە ساڵی ۱۸۱۲ز بڵاوبۆوە فۆلکلۆر نووسەکان قەت ئەم کارە پیرۆزەی ـ یاقوب گریم ـ لەبیر ناکەن.

ئیمـەیش ئێستا کە بابەتی فۆلکلۆر پێش کەش بە جەماوەری خوشەویستمان دەکەین، دەبێ ئەمە روون کەینەوە کە ووشەی فۆلکلۆر چی‌یە لە چ شوێنێکی ئەو سەر زەمینە بۆ یەکەم جار سەری هەڵداوەو ووردە ووردە گەردەنی هەڵکێشاوە، تا گەیوەتە ئیمرۆمان.

فۆلکلۆر ـ ووشەیەکی لێکدراوەی ئینگلیزیە لە ساڵی ۱۸٤٦ز دا زانای شوێنەواری ئینگلیزی «سیر ویلیام جۆن تۆمز» ساماني کەلەپوری نەتەوایەتی بەم ناوە ناو ناوە، پاش لێکدانەوەیەکی دوورو درێژو بەراووردکردنێکی قوڵ دەگەڵ لێکۆڵینەوەکەی دوو برا ئەڵمانەکان ـ زانا گریم یعقوب گریم و، ویلهم گریم ـ کە بەشی یەکەمی لێکۆڵینەوەکەیان لەساڵی ۱۸۱۲ز بڵاوکراوەتەوەو بەشی دووەمیشی لەسـاڵی ۱۸۱۵ز دا بەنـاونیشانی داب و نەریت و هەقایەتی میللی گەلی ئەڵمان، لەو ساوە ووشەی «فولك ـ لور» ـ «حکمـة الشعب» بویە هێمای کەلەپوری نەتەوایەتی‌و داب و نەریتی ئەدەبی سەرزاری گەل لەبەر سووکی سەر زمان.
جارێکی تر کە دێینـەوە سەر باسی میثۆلۆژی. دەبێ هەوڵ و مانـدووبـوونـەکـەی برایانی ـ گریم ـ نەخەینە پشت گوێ، سەبارەت بە فۆلکلۆرو کەلەپوری نەتەوایەتی، هەرگیز دەبێ ئەو ماندوبونەو خۆ‌وەدەرخستنەیان بینینەوە بەر چاوان، جا کەوابێ نابێ ماندووبوون و زەحمەت کێشانی سوارچاك و عەگیدانی مەیدانی فۆلکلۆری کوردیش لەبیر بکەین، چونکە بەهەر جۆرێك بوبێ خۆیـان لە سوارچـاکـانی ووڵاتـانی پێشکـەوتوو نزیك خستـوّتەوەو، بەرهەمی بە پێزو تامیان هەڵ رشتۆتە بەردەمی خوێنـدەواران، تا بزانن ئەم نەتـەوەیەش چ جۆرە سامانێکی گەورەی فۆلکلۆری نەدۆزراوەی هەیە، بەلای منەوە گرنگترین بەرهەمەکان ئەوانەی خوارەوەن: دەربارەی بوژاندنەوەی مێژوو وکەلەپورو، پەندو، ئەفسانەو، چیرۆك و هەقایەتی کوردەواری:ـ

١ـ قسـەی پێشینـان ـ گوستان و لوبون ـ ماموستای بەرێز إسماعیل حەقی شاوێس ساڵی ۱۹۳۳ز لەچاپی داوە.

٢ـ بڵاوکراوەکەی زانای کورد ـ کامران بدرخان ـ کە لە ساڵی ۱۹۳۷ز لە پاریس لەچاپ دراوە.

٣ـ هەزار بێژو بەند ـ مامۆستای نەمر ـ معروف جیاووك ـ ساڵی ۱۹۳۸ز لەچاپی داوە.

٤ـ مێژووی ئەدەبی کوردی ـ مامۆستای زاناو نەمر علاءالدین السجادی ساڵی ۱۹۵۲ز لەچاپی داوە.

٥ـ پەندی پێشینان ساڵی ۱۹۵۷ مامۆستای بەرێزمان محمدی خاڵ لە چاپی داوە.

٦ـ بەرهـەمـەکـانی مامۆستایانی نەمر محمد توفیق ووردی‌و محمـد مولود ـ مەم ـ دەگـەڵ بەرهەمی گرنگتریش کەلێنێکی گەورە لەو مەیدانە پر دەکەنەوە، تا دەگەرێنەوە سەر بەرهەمی تازە سواران، وەك دکتـۆر معروف خەزنەدارو دکتۆرە شکریە رسـوڵ و ماموستا محمدی ملا کریم و کریم شارەزاو محمود زامـدارو، جعفـر حسـین و، علی معـروف شارەزووری‌و، عزیز گەردی‌و فاروق حسن و، عمر شیخ اللە‌و حجی جعفر دهوکی‌و، محمد کریم شریف و، ئەسعەد عەدۆو، طارق جامبازو محمد صالح سعیـدو، عثمـان محمـد هەورامی‌و، دەگـەڵ دەیـەها کەڵەمێردی تری ئەم مەیدانەو لێکۆڵینەوە گرنگەکەی دکتوری بەرێـز کاك عزالدین مصطفی رسول بە ناوونیشانی «ئەدەبی فۆلکلۆری کوردەواری» ئەو لێکـۆڵینـەوەو بەرهـەمانە هانمان دەدەن ـ پەنجـە بۆ مانـدووبـوونـەکـەی کاك خالید جووتیار درێـژبکـەین دەربـارەی ئەرشیف و پەیمان گاو، قوتابخانەو، زاراوەو، ناودارانی فۆلکلۆری جیهـانیکـە، لەوێـوە بۆمـان دەردەکەوێت کەئەم دامودەزگایانە چۆن بەتوندی رای ئەوانەی رەت کردوّتەوە کەدژایەتی بوژانەوەی فۆلکلۆریان کردووە.

دەبێ ئەوەش بڵێین کە لێکۆڵینەوە، تێ هەڵچوون بۆداب و نەریت و کەلەپووری کوردەواری چاو تێبڕینێکی نەتەوەکەمانە، بەمەرجێ لە جوڵانەوەی کۆنە پەرستی وە دووربخرێتەوە، چونکە وەیەك چوونی فلکلۆری کوردیو کارتێکردنی دەرەووشتی دانیشتوانی ناوچە لە بیرو باوەری تازەو کۆن نیشانەی دڵ و دەرونی ڕوڵەکەیەتی، فۆلکلۆر هۆی ڕاستیو یەکیەتیە، بۆ دروست کردنی مرۆڤێکی نیشتمان پەروەر، لەم ڕوانگەیەوە دەبێ بایەخ بەداب و نەریت و کەلەپووری نەتەوایەتی بدەین، چونکە پاشماوەیەکی کۆنەو دەگەڵ تازەدەگونجێت و، مەیدانی بۆ خۆش دەکات و کەڵکی لێ وەردەگرێت.

پەندو، کەلەپووری نەتەوایەتی جێی سەرسوڕمانی گەشتەوانە بیگانەکان نیەو، پاشماوەیەکی یەکجار کۆنیش نیە، ئێستا لەهەموو لایەکەوە لێی دەکۆڵنەوە، بۆ خاوێن کردنەوەی توخمە بەکەڵکەکانی ژیان و، بۆ وەپێش کەوتنێکی بەردەوام.

مامۆستای نەمر علاءالدین السجادی - فەرموویەتی - نەوەندەی نەمابو هەموو ئەوانەی بەدوای لێکۆڵینەوەی داب و نەریت و کەلەپووری نەتەوایەتیدا دەگەڕان بڵێن کەلەپوور سەروکۆزەری چەرخی سەرەکیو پاشماوەی گەلانە، بۆ بەڵگە چەندێکیان نیشانەی وادێننەوە کەئەم کەلەپوورانە لەسەرزەمان، لەنەتەوەیەك بۆئەوی تریان ماوەتەوە، بەکارەو، لەنێونەچووە، ئەفسانەش وانەبێ تەنانەت دەربڕینێکی نارەزاییو تورەو توندی بێت لەنێوانیان، نەخێر زوربەی زۆریان گەیبونە ئەم رایە، کە هەر پەلارو پەندو ووتەی تورەوزویرییە نەك ووتەی جێ‌گرە.

بەڵام ئەوانەی ئامانجیان ڕاستی بابەتەکەبووبێ ئاڵۆزی گەیشتنە ئەم قەناعەتە، بایەخ نەدان بەفۆلکلۆر هەڵەیەکی خۆڵێ وەدورخستنەوەیەتی، لەگەڵ ئەوەشدا لێکۆڵینەوەی فۆلکلۆری بەردەوامەو بەهەنگاوی پوخت وبەرنامەی ڕێك وپێك بەرەو باوەش زانایانی زانکۆ پێشکەوتووەکانی جیهاندا دەچێت.

یاقوب کریم لەو بیرو باوەڕی بۆ - ئاخیم خوانیم - ی دەربڕیبوو بۆ ڕاستەقینەی داب و نەریتی میللی تێیدا دەڵێت:- «ئەدەبی ڕاست لە کانگای دڵی - شاعیر هەڵدەکوڵێت، بەووشەکانیەوە جوڵانەوەیەکی سرووشتی سەربەخۆیە لەنێو مرۆڤ دا، جیاوازیەکەش دەگەڵ ئەدەبی هونەرئەوەیە:-

یەکەمیان: لەهەستێکی کۆمەڵایەتیەوە هەڵدەقوڵێت، کەچی دوەمیان: کانگاکەی یەك سانەیە، لەبەرئەوە خاوەنی هونەردەناسرێت و خاوەنی ئەدەبی میللی ناناسرێت، بەچالاکی هەموولایەك دادەندرێت

جی دبڵین :- بابەتی میللی بەم ئاوەدەشوبهێنێت کەلەچەند لایەکەوە ڕوودەکەنە ئاورێك و، وەیەك دەگەنەوە، «فردریك فون دیری‌لاین» لەباسەکەیدا دان بەبۆ چوونەکەی «جی‌دبڵین» دەنێت و دەڵێت:

لێکۆڵینەوەی سەربردەو ئەفسانەو ڕوداوی کۆمەڵی کوردەواریو، لێکۆڵینەوەی دەگەڵ پرۆگرامی - المۆرفۆلۆجی «پرۆپ» دەمانگەیێنێتەوە ئەم ڕایە کەڕوو لەم ڕوداوانە بکەین، کەهەقایەتەکانمان پشتی پێ دەبەستن. جاپێش ئەوەی بچینە نێو دەقی ڕوداوە میللیەکان و شیکردنەوەیان بەپێی «مۆرفۆلۆژی» دەبێ نیازی «پرۆپ» لەم شێوەو باوەڕەوە بزانین.

پرۆپ :- شیکردنەوەو دارشتنی - المورفولوجی - بەباسی هەقایەت دادەنێت، بەپێی پارچە پارچەکانیو پەیوەندی هەرپارچەیەك بەویتریان - لەدواییدا پەیوەندییان بەکۆمەڵ.

ئەلکزەندەرکراب - یش :- دەربارەی پەند دەڵیت: «پەند بەشیوەی خۆی ڕاستیەکی باوە» بەسووك وسانا زوربەی زۆری جەماوەر بە کاری دێنێت، چونکە بێ ئەولاو ئەولا دەربڕینێکی گشتەو ڕاستیێکی گشتی‌یە غۆستاف لوبون - یش دەڵێت:- ژیری ڕاستی‌ی بڕیار پێ دراوبەوێنەیەکی کورت بەکاردێنێت.

ئەلکزەندەر - دەگەرێتەوە، دەڵیت:- دەبێ - کراپ - دان بەوەبنێت کە (پەند) شێوازێکی کەلەپووری کۆنەو، ڕۆژانە بەسەردەماودەم دا هاتووە، جوان کاری لەداریشتن «پەند» بنەچەی جوان کاری - مرۆڤە - بەڵام جەماوەر بەگشتی بڵاویان

کردوتەوەو بەکاریان هێناوەو دەماودەم گوتراوەتەوە.

مامـوستای بەرێز ـ جلال الحنفی ـ دەڵێت :ـ لەپەندەوە خوو رەوشت و هەڵسوکەوتی گەلان ـ میلەتان ـ دەزاندرێت، لێشیەوە دەنگوباس و کاروباری کومەلایەتی لێ وەدەردەرکەوێت.

جا لەم بۆچونەی سەرەوە بۆمان روون دەبێتەوە کەکەم بابەت هەن لەبابەتی فۆلکلۆرو هەقایەت و سەربردەو داب و نەریت و کەلەپـوور بەتـام و چێـژتـربن، چونکە دەرگایەکی فراوانی سامانێکی گەورەمان بۆ دەخاتە سەرپشت، کەزانایانی فۆلکلۆر ئاواتیانە.

ناوچـەی کوردستان پرە لەسامانی شاردراوەی بابەتی نایاب تائێستـا دەستی مرۆڤی نەگـەیـوەتێ، کەلەپـووری وای لێ وەدەسـت دەکـەوێت لەبنـەچـەوە بۆ دورتـرین سەردەمی مرۆڤـایـەتی دەگـەرێتـەوە، خۆ ئەگـەر ووردتریشی لێبکۆڵینە دوورنیە بمان گەینێتەوە پاشماوەی ئەو تەهلیلەو هەقایەتانەی کە مرۆڤ پێـانی رابـواردووە لەمنـدالیـەوە، چونکە مێژووی فۆلکلۆر لەکـۆنـە ناوچـەکـانـدا دەڵێت :ـ ئەفسـانـەو ئاین و هەڵسـوکـەوتی نیشـانـەی کونتـرن لەهەقایەتی پرپوچ....

لێکـۆڵینـەوەیـەکی دوورو قوڵ دەربـارەی زانـای فۆلکلۆر لەسەردەمی کۆنەوە دانی بەمە ناوە، هەرچەندە ئێمەمانان لەم دواییـەدا گەیشتینـە ئەم بروایە، کەدەبێ فلکلۆری کوردی دەگـەڵ سەرچـاوەی جۆراو جۆر هاتبێت...؟! چونکە ناوچەی کوردستـان لەکـۆنـەوە رێبـازێکی کاروانی بازرگـانی بووە، سەرەرای گەلێشەرو شۆری گەورە. کەلەم ناوچەیەدا رووی داوە.

فۆلکلۆر شتێکی ـ بابـەتێکی ـ جودا نەکـراوەیـە لەژیـانی رابـردووی میللەت و سەرەتـایـەکی پتـەوو زینـدووی ژیانی کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و رۆشنبیری ئیمرۆی گەلە، بۆیە دەبێت بایەخ و گرنگی پێبدەین و، خۆ وەدوا نەخەین بۆ کۆکردنەوەو پاک کردنەوەی لەگرو گاڵی بی سوودو، دریغی نەکەین بۆ بوژانەوەو پەرەپێدانی.

بەم چەند دێرە کورتیلانە دەنگی خۆم دەخەمەپاڵ بانگەوازەکەی کاک «طارق جامباز» کەلەدوا دێرکانی لاپەرە/ ١٤ی ـ تێکستی هەشت چیرۆکی کوردیدا، دەڵێت :ـ «دەزگـایێ نیـەو گرنگی بەکەلەپووری نەتەوایەتی بدات، بەهەر حاڵ هیوادارم ئەم داوا کاریـەمـان بایـەخـی تەواوی خۆی بدرێـتـێ‌و، هەوڵی هەمووڵایەکیش کارەکەمان دەوڵەمەندترو سەر کەوتوتر دەکات.

**سەرچاوە :ـ**


١ـ مێـژووی ئەدەبی کوردی ـ مامـوستـای نەمر علاءالدین السجادی سالی ١٩٥٢م لەبەغداد لەچاپ دراوە

٢ـ دراسة في ادب الفولكلور الكردي ـ پسپۆری بەرێز ماموستا عزالدین مصـطفی رسـول زنجـیرەی (١٦٠) دامـودەزگـای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی سالی ١٩٨٧م

٣ـ زانستی فۆلکلور ـ ئەلکزەندەرکراب/ ئامادەکراوەکەی کاک خالید جووتیار بەرەو فۆلکلۆر/ ١٩٨٤

٤ـ عرب و اكراد ـ المقدم منذر الموصلي ـ الطبعة الاولى ١٩٨٦م

٥ـ مذكـرات الدراسـة الفولكلور ـ الكويتي ـ صفوت كمال ـ الطبعة الثانية ١٩٨٦م

٦ـ لمحة عن الاكراد ـ تومابووا ـ ترجمة محمد شريف عثمان ١٩٦٩م

٧ـ گۆڤاری هەولێر ژمارە (١) و (٢) سالی (٢) ١٩٧١م

٨ـ کوردو کوردستان ـ ماموستا شوکور مصطفی لەتورکی‌یەوە کردوویـە بە کوردی سالی ١٩٨٣ «لەچـاپکـراوەکـانی کۆری زانیاری عیراق «دەستەی کورد»




# کتێبی گوڵێك لە ڕەوسەی فۆلکلۆری کوردەواری لەبەر تیشکی هەڵسەنگاندندا

○
عومەر ئیبراهیم عەزیز
○




ئەم بەرهـەمە فۆلکلۆری‌یە، لە نووسینی مامۆستا «داود محـەمـەد شڕۆڵ»ەو، نۆبـەرە بەرهەمیەتی، بە یارمەتی، «ئەمینداریەتی‌ی گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوان»ی ناوچەی کوردستـان لەچـاپ دراوە، نووسەر سەرکەوتنێکی چاکی بەدەست هێناوەو، زیرەکانە بابەتەکانی شیکردۆتەوەو، بە زمـانێکی پاراوی کوردەواری‌یانە ڕستەکانی ڕازاندۆتەوە؛ زاراوەو ووشـەکـانی خۆی لەخـۆی‌دا فەرهـەنگێکـە بۆ نووسـەرانی کورد بەگشتی‌و، هۆنـەرو چیرۆك نووس و ڕۆمان نووس و هونەرمەندانی تر بەتایبەتی.

نووسـەر زۆر وەستـایـانـە وشەکانی لەجێگای خۆیاندا بەکـارهێنـاون، هۆی ئەم وەستـایی‌و زیـرەکی‌یـەیشی دەگـەڕێتەوە سەر ئەوە کە نووسەر کوڕە دەشتەکی‌یەو، زۆربـەری هەرە زۆری ئەو کەل و پەلە کشتوکـاڵیانەی بینـوە، ئەگـەر خۆشی بەکـاری نەهێنـابن: بەڵام من لەو باوەڕە دام خۆی جووتیـاری‌و سەپانی‌و بگرە کارەکانی تری لادێی‌ی هەموو کردووە سەری زۆر باش لێیان دەردەچێ.

ئەو هۆیـانـەی باسمـان کرد هۆی بەپێزی‌و بەنرخی‌ی بەرهـەمەکەیەتی‌و تێنوێتی‌و شەیدایشی لەلایەکی ترەوە بونەتە هەوێنی ئەم بەرهـەمـە فۆلکلۆری‌یـە، لەگـەڵ ئەوەشـدا، ئەم بەرهـەمە فۆلکلۆری‌یەی مامۆستا «داود»و، هەموو بەرهەمێکی تری وێـژەیی بێ کەم و کوڕی‌و ناتـەواوی نابێت، ئێمەش لە میانی ئەم‌هەڵسانگاندنەداهەوڵ دەدەین لایەنی چاك و خەراپی دەست نیشان بکەین، بەشێوەیەکی زانستی‌و بابەتیانەی دوور لە مەسەلەی خۆیەتی.

هەڵسـەنگاندنیش: واتا کرداری دەست نیشان کردن و چارە

سەرکردن دەگرێتەوە.
ئێمە سەرەتا لایەنە چاکەکانی دەست نیشان دەکەین ئینجا لایەنە ناتەواوییەکانی‌و، بەپێی توانا‌و لێزانینمان چارەسەریشی بۆ دادەنێین.

**یەکەم: لایەنە چاك و سەرکەوتوەکانی کتێبەکە:**

ا- بەرگی ئەم کتێبە لەگەڵ بابەتەکانی ناوەوەی ئەم بەرهەمە فۆلکلۆرییە زۆر جوان دەگونجێت و، پەیوەندیەکی راستەوخۆی لەگەڵ باسەکاندا هەیە.

ب- لەلاپەرە (٩)، لەژێر ناونیشانی (پێشکەشە)دا نووسەر ئەم بەرهەمەی خۆی بەسێ جۆرە کەسان پێشکەش کردووەو، زۆر زیرەکانەی هەڵی بژاردوون، لەسەرەتادا بە مندالانی خۆیەوە دەستی پێ کردووە کە دەڵێت: «پێشکەشە بەو شەش نێرینەو سێ مێینەکانم کە دەبێ تا ئەو رۆژەی گرێ لە کفنەکانیان دەدەن، لە توخوبی رێرەو رێبازو خزمەتی نەتەوەو نیشتمانیان لانەدەن».

لە خاڵی دووەم دا دەڵێ: «پێشکەشە بەو نەوە داهاتوانە لە نێرو مێ کە دەبێ ئەوانیش چەند کون و کەلەبەری وولاتەکەمان هەیە بپشکنن و باوك و باپیرانیان هەناسەسوارو جێ‌لەق بکەن تاوەکوو راستە رەوسەی کەلەپووری کوردەواریان بۆ بڕ بکەن).

لێرەدا لەگەڵ ئەم پێشکەش کردنەیدا ئامۆژگاری نەوەی داهاتووی کردووە بۆ گرنگ پێدانیان بەو سامانە نەتەوایەتی‌یە لەبن نەهاتووەی باووباپیرانمان، کە خۆی لەخۆیدا داواکارییەکی پەسندو بەجێیە.

خۆ خاڵی سێیەمی هەر باس ناکرێ‌و، بەم جۆرەی خوارەوە پێشکەشی، کردوون و نووسیویەو دەڵێت: «پێشکەشە بۆ ئەو کەسانەی کە عەوداڵی نووسینی کەلەپوورو داب و نەریتی کوردەوارین. کە ئەوانیش دەبێ نیفۆی دەرپێیە سپیەکانیان سێ‌چوار قەف بەلای دەرەوە وەربگێرن.

وەك خۆ ئامادەکەرانی قورکاری پایزی، مەبەستی هەرە سەرەکییان دیتنەوەی یەکەم بناغەو قورەپەستی بنیات نانی شارستانیەتی کوردەواری بێت.».

ج- لە لاپەرە (٧-٣١) لەژێر ناوی «پێشەکی»دا، پێشەکی‌یەکی تێرو تەسەلی زۆر بەتام و خەستی نووسیوە بە جۆرێك کە خوێندەوارانی کورد لە خوێندنەوەو تام وچێژ وەرگرتنی هەر تێر نابن و، بەهیچ جۆرێك هەست بە هەراسانی‌و بێزاری ناکەن هەرچەندە پێشەکی‌یەکەش درێژە، بەلام ئەوەندە وشەی رەسەنی کوردەواری بەماناو جوان و بەجێ‌و رێك و پێکی بەکارهێناوە بەتووبێ سێ‌بارەو چواربارەی بکەیتەوە ئینجا ئەگەر لە خوێندنەوەی تێر ببێت!!

هەر بۆ نموونە چەند وشەیەکی جوانی ناو ئەو پێشەکی‌یە دەخەینە پێش چاو، لەوانە: «هۆزەبانە، هەلۆتکە، بەردەسێر، سەرزەن، رەبباس، ساتمە، مرومۆ، تەترە، فرچك، هورێنە، حالۆری، پاشۆل و،....» سەدان وشەی تری واتادار.

مامۆستا «داود» لە پێشەکی‌یەکەیدا بەوەش نەوەستاوە بەڵکو وەك جوگرافی ناسێك چەندان ناوچەی کوردستانی ناو هێناوە، لەوانەش: «ناوچەی سۆران و بادینان و دەشتی بیتوێن و شارەزوورو قەراج و کەندیناوەو زورگی زورگەزراو زەرگەتەن و چیای دێدەوان و بەنی حەریرو سپیلك و گەلاڵەو حاجی ئۆمەران).

خۆ باسی ئەو پەندە زۆرو جوانانە هەرناکرێ کە لە جێگای خۆیدا بەکاری هێناون، لەوانە: «کەس لەپرێ نەبوویتە کورێ» «بەدەستی خۆت، خۆت نەخورێنی خورشتت دەنامرکێ» «گیا لەسەر پنجی خۆی دەڕوێتەوە یا شین دەبێتەوە»، «قسە هاتە روو نامێنێ ئەرجوو»، «قسە هەزارە دووی بەکارە»، «چ لەناو مەنجەڵ بێت ئەو دێتە ئەسکۆ»، «شەوت ماڵە مزگەوت بەتاڵە»، «نان ئەو نانە ئەمرۆ لە خوانە»، «گیا ئەمەیە بەدەمی بزن خۆشبێت».

بێجگە لەم لایەنە خۆ لایەنی ئاسمانەوانیشی فەرامۆش نەکردووە، ئەوەتا ناوی «حەفتەوانەو گەلاوێژو کاروان کوژەو پێروو تەرازوو کاکێشانی» هێناوە لەگەڵ ناوهێنانی «کەژو حیساب راگرتنی «کەژو مێرم و ئۆغەن و پیت و پالۆزو بەندو بەندەرخەو پیرەژن و... هتد».

د- لە لاپەرە (٢٦،٢٧)ی ئەم پێشەکی‌یەدا لەژێر ناوی «مەبەستیش لە خرکردنەوەی کەلەپوور ئەوەیە» بە (٦) خاڵ گرنگ سوودی کۆکردنەوەی کەلەپووری کوردی روون کردوتەوە، لەوانە:

١ـ گێڕانەوەی زیندووکردنەوەی ڕەسەنایەتی ڕابردووی ژیانی ئەم کۆمەڵە لە هەموو بارێک دا، وەکو: پەروەردەو ئایین و زانستیو کارو کرداری داب و نەریت.
٢ـ ژینەوەو بەکارهێنانی چەندین ووشەی ساغ و ڕەسەن لە زمانی زگماکی کوردەواریو دەوڵەمەندکردنی گەنجینەی زمان.
٣ـ زیندووکردنەوەی چەند کرداری پیشەسازیی سادە لەکاری جوڵاییو بەرهەمەکانی جاجم و دووگردو بەرماڵ و پەشمەو کری ڕانك و چۆغەی جۆراو جۆری مێرانی کورد.
هـ ـ لە لاپەرە (٢٨ تا ٣١)ی ئەم پێشەکییە نووسیویە «کارەکانی پەرەسەندنی خرکردنەوەی کەلەپووری کوردەواری»، زیرەکانە چەند لایەنێکی ڕوون کردۆتەوەو چەند داواکاریەکی بەجێی خستۆتە ڕوو، لەوانە:ـ

١ـ لەلایەن میرییەوە:ـ اـ داوا لە میری بکەین بۆ ڕێگادان بە کردنەوە (کۆمەڵێکی کەلەپووری کوردەواری).
ب ـ کردنەوەی مۆزەخانەیەکی گەورە، لە شوێنێکی کوردستان.
ج ـ بەخشینەوەو ناردنی چەند دیاریی کەلەپووری جوان و لێومشاوە، بۆ چەند مۆزەخانەکانی ناو ووڵات و دەرەوە بەناوی کەلەپووری کوردەواری.
٢ـ هەوڵ و یارمەتیدانی میللەت هەریەك لەراستەخۆی: چ لە لایەن مامۆستایان و قوتابیانەوە بێت، یا لە لایەن هونەرمەندان و خاوەن کارگەچیو جوڵایەکان و برا وەستاکانی دیوارو خانووبەرە دروست کەرەکانەوە بێت.
و ـ لە لاپەرە (٣٢)دا باسی «ڕەنجبەر گرتن و مەرجەکانی»و لە لاپەرە (٣٤ـ٣٥)دا «پسپۆڕیو کارچاکی جووتیار ئەمانە بوون»و، «جووتیاری ناپەسند» بەتێرو تەسەلیو ڕێکییەوە ئەولایەنانەی ڕوون کردۆتەوە، وەکو ئەوەی یەکێك بووبێ لەو ڕەنجبەرانەو، چەند جارێ بەرەنجبەرایەتی گیرابێ وای بۆ چووەو مەبەستەکانی پێکاوە.
ی ـ لە لاپەرە (٣٥)دا، ناوی مانگەکانی کوردیی لە وەرزەکانی ساڵدا بڵاوکردۆتەوە، چونکە ئەم مانگانە پەیوەندییان بە چاندن و تۆوکردن و ڕەنجبەرگرتن و کاری تری کشتوکاڵی ڕاستەوخۆوە هەیە، بۆیە ئەم لایەنەشی لەبیر نەکردووەو، بەم شێوەیەی نووسیوە:ـ
بەهار: نەوروز، گوڵان، جۆزەردان.
هاوین: پوشپەر، خەرمانان (خەزەلوەر)، گەلاوێژ
پاییز: ڕەزبەر، گەڵاریزان، سەرماوەز.
زستان: بەفرانبار، ڕێبەندان، ڕەشەمە.
ر ـ لە لاپەرە (٣٦)دا هەڵبەستێکی خۆی لەسەر کەرەستەی جوت ودرەو، لەژێر ناوی «هەڵبەستێك لەسەر کەرەستەی جوت و درەو» بڵاوکردۆتەوە، لە (١٠/١٢/١٩٦٨) نووسیویە بەهۆی ئەم مێژووە بۆمان بەدیار دەکەوێ کە مامۆستا «داود» جووتیارو سەپانێکی باشی ئەو سەردەمە بووە.
ئەمەش چەند دێرێکی ئەو هەڵبەستەیە:ـ
کەرەستەی جوت لای گشتمان دیارە
نەك تودەرو خەرتەو بەیارە

پەرێزو خەرتەو شۆو گەردو وەرد
هەوجاروو گاسن دوژمنن لە ئەرد

لەنیوەی ڕەزبەر، گەڵاریز گشتی
سەرماوەز هەندێ ڕەش ئەبێ دەشتی
کەرەست ڕێك دەخا، کاکی کوردەوار
لەهیرتەو خەپەو مژانەو هەوجار.
..... هتد
ز ـ لە لاپەرە (٣٩ تاکو ٤٨) باسی «کەرستەکانی جوت کردن»ی یەك بەیەك زۆر بەجوانیو ئاشکرایی ڕوون کردۆتەوەو، لە لاپەرە (٤٠) شدا مامۆستای هونەرمەند «ئەسکەندەر» ئەوەندە بە کارامەییو هونەرمەندانە کەرەستەکانی بە وێنەیەك کێشاوە، کە بەبێ ماندووبوون و بێزاری خوێندەوار لێی تێ دەگات.
لەوەی جێی دڵ خۆشکەرییەو، زانیستانە دەبینرێت، مامۆستا «شرۆل» هاتووە زۆر بە شارەزاییو لێهاتووانە چەند ووشەیەکی گرانی پێناسەو شیکردۆتەوە، کە لەلای ئەوەی نوێو بگرە هەتا ئێمەو مانانیش لەبیر کراوە یا هیچی لێ نازانین، لەوانە: «پەرە، ڕەباس، تووخب، بەیار، بەربەیار، بەریار بر،

خرتە، شۆبر، وەردانەوە، هیشکاووز، تەراووز، تەرمکار، خێڵۆك، لات، ناوبەرە، سەدە، هۆدانەوە، هاونیر، دوورەگا، بوورە، قورکێل».

دەکرێ ئەو ووشانە بکرێنە ناوی کۆگاو نووسینگەی تایبەتی تاکو ئەم ووشەو ناوانە هەتا هەتایێ بمێنێتەوەو، لە بیرمان نەچنەوەو، نەوەی (نوێ)مان لییانەوە بێبەش نەبن و، ووشە گرانە بێگانەکان نەبنە هەوێنی مێشکی لاوەکانمان!!

س ـ لە لاپەرە (٦٢ـ٦٧)دا، بە ووردی باسی «جۆر بابەتەکانی تۆکردن)ی کردووە، لەوانە: «تۆکردنی سەربەخۆ، تۆکردنی نیوە تۆ (بنەتۆ)، تۆکردنی بەتایۆ، بەکرێ گرتنی زەوی چاندن، رەهن گرتن، شکارتەی رەنجبەر، شکارتەی خۆییو خۆشەویستان، شکارتەی مەلای دێ، قەرسیل چاندن» بەراستی زیرەك و شارەزایانە هەمووی یەك بەیەك باس کردوون، وەکو یەکێکی وا کە بەخۆی بەم جۆرە تۆکردنانە هەستابێ.

ش ـ لە لاپەرە (٧١ـ٧٣)دا، «مەرجی رێکەوتنی سەپان بەم جۆرە بوو)، لە (١٤) خاڵی سەرەکیدا دەست نیشان کردووە.
هەروەها لە لاپەرە (٧٤ـ٧٨)دا، «کەرەستەکانی درەو (دورنە)ی یەك بەیەك روون کردۆتەوە، لەوانە: «داس، داسووکە، قەرانگ، قەینـاغ، هەسان، کەرەدان «کەرەشاخ» کوندەی ئاو، دۆدانە، سێبەرۆکە «رەشماڵۆکە»، مەرەغان».

ص ـ لەلاپەرە (٧٨ـ٨٣)دا، چەند ووشەیەکی تری ئەو بابەتانەی کە پەیوەندی‌یان بە جوت کردنەوە هەیە شیکردۆتەوە زۆر بە جوانی و رێك وپێکی، لەوانە: «تەبارە، گاز، بەر، سوارە، مەرۆ (مەڵۆ)، باوەش، گیشە، گەلاوێژ، گیشەکەر (تێلەکێش)، سەپان، پاڵە، سەرپاڵە، قارە، ووشی، داوەر، پەرێز، کۆگە، کوندەرانی پەرێز، بەرکوت، زبارە، سەربرانە، سەربرانەی شوانکارە، قۆپەن، قەرەخەرمان».

ع ـ لەلاپەرە (٩٣ـ٩٦)دا، (چەنداب و نەریتی سەپان و درونە)ی زۆر بە لێوە شاوەییو شارەزایانە لێك داوەتەوە وەکو سوارە بڵندکردن، ملەی سەپان، شەرە داسی سەپان، بەسەردا سوورانی سەپان، سەربرانەی دورنە، زبارەی هاوپەرێزی، خواردنی کەرەی ناو کەرەشاخ، چەند ووتەی نەستەق لەسەر چاندن و دورونەو جۆخین و پەرەکەوتن».

غ ـ لەلاپەرە (٩٦ـ١٠٠)دا، «باسی شەغرەو پێك هێنەرەکانی شەغرە»ی زۆر بە تەواوی‌و دروستی‌یەوە یەك بەیەك و بەش بەبەش روون و لێك داوەتەوە، مامۆستای هونەرمەندیش کاکە ئەسکەندەر لە لاپەرە (٩٨)دا بە وێنەیەکی زۆر ئاشکراو روون بەشەکانی بۆ خوێندەواران خستۆتە روو.

ف ـ لەلاپەرە (١٠٤ـ١١٦)دا، زۆر بەچاکی باسی جۆخین کوتین (بەگێرەو بەچان (کوتەر)و جەنجەرو پێکهێنەرەکانی جەنجەری) کردووە، بەهەمووو بەش و کەل و پەلەکانیەوە، لە لاپەرە (١١٠ـ١١١)شدا بە دوو وێنەی ئاشکرای روون، جەنجەرو پێکهێنەرەکانی خراونەتە روو، کە لە لایەن هونەرمەند کاکە (ئەسکەندەر) کێشراون، پێکهێنەرەکانی جەنجەر ئەمانەن: [حوشترۆکە، تۆپی جەنجەر، پاڵتە، کلدانە، تۆقی تۆپ، کلچووکە، سیرۆکە، شیرۆکە شوونکی حوشترۆکە (چوار قۆڵی دەفەی جەنجەر، دەلاقەی حوشترۆکە، دەفەی پاش و پێش، پردۆکەی جەنجەر، پردی دانیشتن، دار ئەقرەبە، حەلقەی ئەقرەبە، تیرەی حوشترۆکە، بەستەکی جەنجەر، دار بەستەك، چاپخانۆکە (کوچ کوچە).

ق ـ لەلاپەرە (١١٦ـ١٢٦)دا، چەندان ووشەی فۆلکلۆری تایبەت بە جەنجەرو کوتانی پێناسە کردووەو، بە لێهاتوویی شی‌ی کردنەتەوە، لەوانە: «جەنجەر دابەستان، جەنجەر بەردان، جەنجەرەوان، چاوە، رۆخە، زنجیرەی جۆخین، گوریس و زنجیرەی ناو تیرەی جۆخین، دار جۆخین، قرشە شکێن، هوردە کوت، پێ وەرگێران، بەر گرتنی جەنجەر، پێ هەڵدانەوە، رەندەی جۆخین، لاچاوەی وولاغی جەنجەر، شەنەبا، تارمە، بیرەبا، بیرۆك، شەنەی ئاسن، شەنەی دار، کوزر، بن جۆخین، بێژینگ، سەرەند، رەوسە، رەوسەبر کردن، تاپۆی عەرد، زەکاتی شەرع، عەمبار، چاڵ، لەوەدە، سەرکوت، دەست باڵ، پشت باڵ، ئاو خۆرەوە، رووبە، قەرناغ، عەلبە، دار رووبە، دەست، زیادە، شەقڵ، شەقڵچی، سەرکار، قاوەچی، خوبزە، رەشکە».

ك ـ لەلاپەرە (١٢٦ـ١٣٨)دا، خۆلەباسی (شەنەباو رێکخستنی تارمەو رەوسەبر کردن و قسەی جوان و ئاینی‌یە بە کەڵکەکان هەرباس ناکرێ کە بە ئاوازە دەنگ خۆشەکانی چۆن رازاندۆتەوەو، زۆر بە هێمنی‌و وورییانە یەك بە یەکی باس

کردوون، ئەوەتا لەکاتی ڕەوسەبڕ کردن دا لەسەرەتاوە بەمە دەستیان پێ کردووە:

**بسم الله الرحمن الرحیم**

**بەناوی هەر چار یاری نەبی**
**ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان و عەلی**
**ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێبی**
**لەسەر مەو موسەلمانان بە عامی**

ئینجا بەیەك یەك و دوو، دوو تا دەگاتە دە، دە، دەیان تەواو دەکردو بەردەوام دەبوون لەم ڕەوسە برکردنەیان دا.

ـ لەلاپەرە (١٣٩ تا ١٥٠)ی ئەم بەرهەمە فۆلکلۆرییەی مامۆستا «داود» فەرهەنگۆکێکی بۆ ئەو زاراوەو وشە گرانانەی ـو ئەو کتێبە ئامادەکردووە، بەڵام چ ئامادەکردنێك، زۆر ڕێك، زۆر بە تواناو ئاشکرا، زۆر ووشەی بە کەڵکی فۆلکلۆری کوردەواری خستۆتە بەر دەست ڕۆشنبیرانی کورد.

هـ ـ لە لاپەرە (١٥١)ی ئەم بەرهەمەدا، سێ لاپەرەی بۆ (هونەرمەند ئەسکەندەر عوسمان) تەرخان کردووە، کە بریتییە ـە کورتەی ژیانی هونەرمەندی ناوبراوو، هەندێ لە تابلۆکانی ناو هێناوە، چونکە ئەم هونەرمەندە وێنە فۆلکلۆرییەکانی سەر لاپەرەی ئەم کتێبەی ڕازاندۆتەوەو هەموویان لە دەستکردی ئەون.

بۆیە باس کردنی ژیان و بەسەرکردنەوەی بەم شێوەیە لە جێگای خۆیدایە.

ن ـ لەلاپەرە (١٥٥)شدا، مامۆستا «داود» سوپاسی چەند بەڕێزێکی کردووە، کە یارمەتیان داوە بۆ نووسینەوەو خۆشنووسیو بەرگ کێشان و چاپ کردنی.

**دووەم :لایەنەکەم و کوری و ناتەواویەکانی کتێبەکە**

لێرەدا لایەنی ناتەواوییو کەمو کوری کتێبەکە دەست نیشان دەکەینوراستیەکان دەخەینەروو.

ا ـ لەلاپەرە (٣)ی ئەم بەرهەمەدا، نووسەر (مامۆستا داود) هاتووە، وێنەی خۆیو کورتەی ژیانی لەچەند دێڕێکدا بڵاوکردۆتەوە، کە ئەدەبوو مامۆستا لێرەی بڵاوبکردایەتەوە؛ بەڵکو وا چاکتربوو لە دوا لاپەرە، یا ئەوەتا لەسەر بەرگی داوەی ئەم کتێبەی بڵاوبکردایەتەوە؛ لەمەیش زیاتر دەیتوانی «ناوەخن، ناوەرۆك»ی لە جێگەی ئەودا بڵاوبکردایەتەوە، ئەمەش تەنیا لەلای مامۆستا «داود» ڕووی نەداوە؛ بەڵکو لەلای ئێمەوە زۆربەی نووسەرانی کورد ئەم لایەنەمان فەرامۆش کردووەو، پەیرەوی ناکەین، بە پێچەوانەی کتێبە عەرەبیو بێگانەکان کە (ناوەخن) لەسەرەتادا دەنووسن، ئەمەش سوودی زانستیو ئابووری زۆری هەیە، با ئێمەو مانانیش وەکو وڵاتە پێشکەوتوەکان لایەنی زانستیو نوێکاری پەیرەو بکەین، لەوانە لەبەرهەمە (میسری) یەکان ئەم لایەنە زۆر دەبینریو دێتە بەرچاو، وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا، کەهێندێکیانن هەر بۆ نموونە دەیان هێنینەوە:ـ

لە کتێبی «دەروونزانی پەروەردەیی ـ علم النفس التربوی» کەلە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی «النهضة»ی میسریە ساڵی (١٩٧٢)ز چاپکراوە.

یا لە کتێبی «ڕەگەزو دەروون ـ الجنس والنفس» لە ژیانی مرۆڤایەتیدا، کە لە نووسینی (د. عەلی کەمال)ە، لە ساڵی (١٩٨٥)دا چاپکراوە بەدی دەکرێ.

لێرەدا هەر مەبەستمان مامۆستا «مەلا داود» نیە بەڵکو گشت نووسەرانی کوردە لەپێش هەموشیانەوە ئێمەومانان کە وەکو داواکاریەکەو بەس؟!

ب ـ لەلاپەرە (٣٩)دا، هەڵبەستێکی «شێخ ئەنوەری سەید ئەحمەد» کە تەنها چوار دێری لێ بڵاوکردۆتەوە، وەکو من بیزانم و لێی ئاگادارم ئەو هەڵبەستە گەلێ لەوە درێژترە کە مامۆستا «داود» نووسیویە، پێویست بوو مامۆستا هەمووی بڵاوبکردایەتەوە، چونکە هۆنراوەکە گەلێ جوانە، ماوەی چەند ساڵێك لەمەو پێش لە ماڵی خۆیاندا لە مامۆستا «شێخ ئەنوەر»م وەرگرت تا لە کاتی کردنەوەی یەکەم پیشانگای فۆلکلۆریمان کە لە ڕۆژی ١٩٨٦/٣/٢٦ کرایەوە؛ بینەرانی پیشانگاکە هۆنراوەکە بخوێننەوە، چونکە پەیوەندیی بەو کەل و پەلانەوە هەبوو کە لە پیشانگاکەدا خرابوونە ڕوو.

مامۆستا ئەم چوار دێرەی لێ بڵاوکردۆتەوە:ـ

کاروباری جۆت دەزانن چی دەوێ ئەی ڕەنجبەرانی
دارکراوەو بن مل و نیرو مژانەو کۆپەران
چیتری پێویستە بێشك زەنگوڵەو هیرتەو خەپە

جوتی خوتان دابەستن لێخورن راستەو چەپە
**کەچی ئەمە تەواو کەرەکمیەتی، زۆر جوان و بەمانایە کە دەڵێت:**

جوتەکەت باژۆ بەبێ ترس و لەرز راستەو چەپە
بێ فەلاحەت کاروکردەی تۆ هەموو گاڵتەو گەپە
با بزانین چیتری پێویستە بۆ کێلانی عەرد
یعنی بۆ جوت کردن و بۆ هەڵدرینی دەشتو هەرد
بێگومان دو «گا» وەیا دو «ئێستری» چاکن ئەمین
ئێستری رەهوان و زاناو شارەزاو ئازاو بەتین
مامی جوتیار تاکو بیکێلێ زەوی‌و بیکا بە وەرد
تا گرێی لێ ببرێ بیگێڕی بە خاکو تۆزو گەرد
تۆدەرێکی شارەزاش پێویستە بۆ تۆ کردنی
دانەوێڵەو گەنم و جۆشی پێدەوێ بۆ چاندنی
کاکی جوتیار تێبگە ئەو باس و خواستە بۆ تووە
لەو شتانە کاروباری جوتەکەت پێك هاتووە
جا ئەبێ تۆ یاری جوتت بی هەتا زوو دەرکەوی
تا لەنێو میللەت لە کارو کردەوەی خۆت سەرکەوی
تا ژیان و نان و هەرزانی بخەیتە نیشتمان
تا بژی‌و سەربەستو ئازاد بی هەموو کاتو دەمان
تا نەجاتت بێ لە کۆکەو کارەساتی دوژمنان
تاکو رزگار بی لەدەست کورتی‌و لە چەنگ تاڵی ژیان

● ● ●

زۆر جوانتربوو ئەگەر مامۆستا «داود» هەمووی بنوسیبایە، چونکە مامۆستا «شێخ ئەنوەر» بە شێوەیەکی نووسیوە تام و چێژی لەگەڵ هۆنراوەکەی مامۆستا «داود» جیایە، بێجگە لەوەش مامۆستا «شێخ ئەنوەر» وەکو هۆنەرێکی ناوچەی کۆیێ‌و، مامۆستا «داود» وەکو مامۆستاو، شارەزایەکی «دەشتی قەراج»ی ئینجا زۆر رێك تر دەردەچوو، یا ئەوەتا بیگوتایە ئەم چەند دێرە بەشێکە لەو هەڵبەستە درێژەی مامۆستا «شێخ ئەنوەر» کە دەربارەی کەرەستەی جووت و درەو دایناوە.

ج ـ لەلاپەرە (٥٦)دا، وێنەی جووتیارێکی دەست کردی بڵاوکردۆتەوە، دەیتوانی وێنەیەکی راستەقینەی بڵاوبکردابایەوە، چونکە روون کردنەوەی تێدا نیە تاکو بڵێین پێویست بوو بە دەست بکێشرایە.

ئەو وێنەیەو، گەلێ وێنەی تری کشتوکاڵی بەئاسانی لەلای مامۆستا دەست دەکەوت، چونکە وەکو گوتمان مامۆستا دەشتەکی‌یەو تاکو ئێستاش بگرە هەر لە دەرەوەی شار مامۆستایە.

د ـ لەلاپەرە (٦٠)دا نووسیویە: «بەڵام زستانان لە کاتی رۆژ هەڵاتێ جوتیارەکان لە گوندەکان دەردەچوون، هەرکەسێ تەدارەکی جۆتەکەی بە تەنکێشی وولاغەکی وەدەکردو بەخۆشی عارەبی سواری وولاغەکەی تر دەبوو، ئەوی تری قەتارکێش دەکردو دەستی بە حەیران گۆتن دەکرد بە تایبەتی ئەگەر جووتیارەکە لاوبوایە هەستی دڵدارو یاری هەبوایە». دەبوایە مامۆستا نموونەیەکی لەو جۆرە (حەیرانانە)ی بهێنابایەوە، ئەوکاتە بەتام تر دەبوو.

هـ لەلاپەرە (٦١)دا، باسی جۆت دابەستان و بەردانی‌و هاتنەوە بۆ ماڵەوەی کردووە شتێکی بچووکی لەبیر کردووە، ئەویش «وولاغی شەیتان و چەموشە»، چونکە هەروەك دەزانین ئەگەر یەکێ لە وولاغەکانی «هێسترەکانی» شەیتان بوایەو، زۆر ئاوری بدابایەوە، ئەوە جووتیارەکە هەڵدەستا بە پارچە لبادێك «بەرچاوەکی» بۆ دەکرد، واتە لاچاوی لای دەرەوەی پێ دەبەستایەوە تاکو نەتوانێ ئاوربداتەوە، راست برواو نەچێتەوە ناو خەتێ.

هەندێ وولاغی تریش هەبوون (چەموش) بوون، نەیان دەهێشت جووتیارەکە دایان ببەستێ، ناچار جووتیارەکە چاووی هەردوو وولاغەکەی دەبەستایەوە بەهۆی چەفیەیەك یا هەر شتێکی تر بووایە، تاکو دای دەبەستان و راستەرێ دەبوون ئینجا چاوی دەکردنەوە یا ئەوەتە بۆ هێستری شەیتان جووتیار هەڵدەستا تەنها «کا»ی بە تەنها دەدایێ، واتا بێ (جۆ) تاکو تەمێ دەبوو!!

و ـ لەلاپەرە (٦٧ـ٧٠)دا، باسی «هەندێ لە نەخۆشیەکانی دەغڵ و دان»ی کردووە. وەکو: «کرم، مشك و جورج، ژەنگ، کیسەڵە، سن، کورك، هەور بردی، پیك برە، قووتە گوڵ و، پەلەپیسە»، نازانم لە پاڵ ئەمانە زیانی (کوللە) کلۆی چۆن لە بیر کردووە چونکە ئێمە هەمووما ن دەزانین کە کوللە گەلێ زیان بە دەغڵ و

دان دەگەینێ بەتایبەتیش «جۆ»؛ هەتاکو ئێستا کە گەلێ ساڵی مێژوویی بەهۆی کوللەوە ناو دەبرێ، بەتایبەتی ئەو ساڵەی کە کوللەی لێهاتووە دەڵێن: «ها ساڵی نەهاتەکەی هاتنی کولله!!».

بێجگە لەوەش نازانم مامۆستا چۆن لە سەپانانی گوێ لێ نەبـووە، کە زوربـەی زۆری سەپانەکان دەربارەی کولله ئەم چەند کۆپلەیەیان گوتووە چونک ‌ندە لە کولله داخ دار بووینە بۆیە نارەزایی خۆیانیان بە هەلبەستی دروونە دەربڕیوە، کە گوتویانە:

کلۆ هاتـــیـه پێ خوره
سەپـانـــان مره مڕە
تێـلەکـێش مەمـکـی خڕە

ي ـ لەلاپـەرە (٧٠)دا، لە باسی (درونـەکـردن و ئەندامانیو کەرستەکانی)دا نووسیوویەو دەڵێ: «دەغڵ و دان کە بەژنی فراندو قۆپەنی لێ پەیدا بوو؛ وەیا دەغل کەرویشکەی کرد، ئەوا برای کەشتیـارمـان هەرگیز سەر لە دەغلەکە نابڕێو دەست دەکـات بە پشکنـین و هەڵکێشانی گیاو گۆڵی زیان بەخش لە دەغلەکـەدا، وەکـو: زیـوان و کوتکەو سوارەدڕەو پەرۆشە.... هتد». هەروەها پارێزگاری دەکات لە کەنگرو کاردیکەر».

جارێ لەلای هێوە واتە لە پێشەوە دەبوایە لەژێر ناوێکی سەربـەخۆ باسی بژارکردنی بکردایە، چونکە ئەو رستەیەی کە مامـۆستا باسی کردووە کە دەڵێ: «پشکنین و هەڵکێشانی گیاو گۆڵی زیان بەخش»، لە کوردەواریدا لەلای خاوەن دەغڵ و دانان پێی دەگوترێ: «بژارکردنی دەغڵو دان».

جگـە لەوەش وا بزانم «پـەرۆشـە»، بژار ناکرێ چونکە بنکـەی زۆر لە زەوی دا دەکـوتێو پەلکـەکانی بەخۆی وشك دەبێو، هیچ زیانێکێش بە دەغڵەکە ناگەینێ چونکە بژار بۆ ئەو گیـاو گۆڵانـەیە کە زیان بە دەغڵ و دان دەگەیەنن، هەروەکو مامۆستاش وای گوتووە کەواتە «پەرۆشە» زیان بەخش نیە، کە زیـان بەخشیش نەبێ بۆ بژار بکرێ بەتایبەتی ئەگەر ماندوو بوونیشی زۆر بوێ بۆ هەڵکەندنی.

لەوانـە ناوی چەنـد گیایەکی تری نەهێناوە وەکو: «گیا گەنمـەو، زەردە دڕە»، لەگەڵ هەموو ئەوانەش مامۆستا «داود» بژاری گەورەی لەبیر کردوەو ناوی هەر نەهێناوە، بژاری گەورە:

ئەوە بوو هەڵدەستان شارە مشکیان دەدیتەوەو ناچار دەبوون قانگی بدەن !!

یەکـەم جار هەنـدێ (کـا)یـان دەهێنـاو کونـەکـانی تریـان دەپەستایەوە، تەنها لە کونە گەورەکەی (کایان) تێ دەکردو، ئاگریان تێ بەردەدا «قانگیان» دەدا مشکەش ناچار لەبەر ئەم قانگدانەی دەتۆپی!!

لەبەرچیش وایان دەکرد چونکە «ئەو مشکە» دەغڵ و دانی گوڵ بڕ دەکردو هەر لە باسکییەوە ڕا دەیبڕیەوەو، هەمووشی خەسارو پەســار دەکـردو دەی فەوتـانـد.. ساڵ هەبـووە ناوچـەیەکی بەتەواوی دادەگرت و ساڵانی تریش هەبووە، هەر نەبووە، بەڵام دوای بەکارهێنانی تەراکتەرو ئامێری نوێی تۆکردن ئەو مشکە کەم بۆتـەوە چونکـە زەوییـەکـە لەبنەوە ڕا هەڵدەتەکێنی، بە پێچەوانەی هەوجارو سێ گاسن و پێنج گاسنی سەردەمی کۆن.

ر ـ لەلاپـەرە (٧٦)دا لە کەرەستـەکـانی دروونە لە «کوندەی ئاو»دا توشی هەڵەیەکی بچووك هاتووە، کە نووسیویە: «کوندەی ئاو پێستـەی بزنـە لەکـاتی سەربـڕینا کەوڵی ناکەن و دەری دەهێنن، یانی پێستەکەی لە ناوەندێ ڕا شەق ناکەن بەڵکو بە هێمنی گۆشتەکەی لەناو پێستەکەی دەکەنەوە پێستە بە ساغی دەمێنێتەوەو، جەفت و پەلکە هەنارو مازی تێدەکەن، لە کوندەی ئاوێ تەنهـا حەفت بەکـار دەهێنن نەك «پەلکە هەنار» چونکە کوندەکە زەرد دەکات. ئەم پەلکە هەنارە بۆ مەشکە بەکار دێ.

ز ـ لەلاپەرە (٩٣)دا نووسیویە: «لە گەرانەوەیش داب و نەریتی خۆی هەبووە، سەپانەکان لە دوای سواربوونی وولاغ و کەوتنە رێ بۆ گەرانـەوەی دێ دەستیـان بە گوتنی چەنـد گۆرانیەك دەکـردو ئەوانـی تریش لە دوایـان دەگـێرایـەوەو جۆری گۆرانیەکانیش ئەمانە بوون:

بەبووکیان هەڵدەگوت، وەیا گۆرانیی حاجیلە، حاجیلە هەبوو (هێ هۆرەو شەمال دەدا لەدار) یان دەگوت تا دەگەیشتنە بن گونـدی ئەوجـا کڕ دەبوونەوەو، هەرکەس پەرتەو خوا حافیزی لەیەکتری دەکرد.

دەبـوایـە مامـۆستـا نمـوونـەیـەکی ئەو حاجیلە حاجیلانەی بڵاوبکردایەوە، وەکو ئەم نموونەی خوارەوە، کەبڵاوی دەکەینەوە:

هەی حاجیلە هەی حاجیلە وەرە خواریّ بە کۆفیلە
خوشکی دەدەمیّ بە بەرتیلە بەماری دنیایێ قایلە
هەی حاجیلە هەی حاجیلە بووکمان هینا بە بەرتیلە
حاجی دەریّ ئەز حاجیمە ساحێبی قەسریّ سپیمە
حاجی دەریّ حاجی ناکەم قەسریّ سپی بەتار ناکەم

لەگەڵ جارانی ترا بەسەر وەرزەکانی ساڵ و بایێ شەمالیان دا گوتـووە، وەکـو ئەم نموونە کە دەیهێنینەوە، دەبوایە مامۆستا «داود» هەر هیچ نەبوایە یەك دوو کۆپلەی لێ بڵاوبکردنایەوە، لەوانە:

بایــێ شەمــار بە هاویـنـێ
دەیـدا لە رەندەی چۆخینێ
خەو خۆشـە لەگەر هەمینێ

★ ★ ★

بایــێ شەمــار بە هاویــنــێ
دەیــدا لە رەنــدەی چۆخــیــنــێ
خەو خۆشــە لەگــەر هەمــیــنــێ

★ ★ ★

یا ئەوەتا هەندێ جاران ئێواران لەکاتی گەرانەوەیاندا کە بەرەو ماڵ دەبوونەوە، کوڵندە کوڵندەیان دەگوت، یەکێك دەی گوت و، ئەوانی تریش بەیەکەوە دەیان گێرایەوە، لەبەر ئەوەش بوو تاکو دەردو کەسەری دڵیان و ئەو ماندووبونەیان بەهۆی ئەم کوڵندە کوڵندە گوتنەوە بەبا بکردایە.

گوتنی کوڵـنـدە کوڵـنـدەش سەرەتـا بەهـۆی دەست پێکردنی سەربەندەکەیەوە دەگوترا، ئینجا گەرم دەکراو، پێدا دەچوون، ئەمەش سەر بەندەکەیەتی:-

هەی کوڵندە کوڵندە کوڵندە
بەژن و بارای برنـدە
ئەو جێی یارمــی لێ نەبــێ
لێی بخـیـنـێ قەلێ قونـدە

دوای گوتنی ئەم سەربـەنـدە ئینجـا کابرای بەستەبێژ گەرم دەبـووو، پێـدا دەچوە خوارەوەو، بەزۆریش بەسەر کاتەکانی رۆژیان هەڵداوە، (بەیانیان، نیوەرۆیان، ئێواران، نیوە شەوان) وەکو ئەم نموونانەی خوارەوە:-

هەی کوڵندە کوڵندە کوڵندە
بە کوڵنـدەکـەی بەیـانــی
قونـدەرەی بیـلاد لەپێ کە
تەشریـفـت بێ لۆ کانــی
گوتـمــێ بیـنــە ماچـت کەم
نەکــەی دایــکـت بزانــی

★ ★ ★

هەی کوڵندە کوڵندە کوڵندە
بە کوڵنـدەکــەی نیــوەرۆ
تیرەکــی لە جەرگــی دام
لە دەرم بویــتــە سێ بەرۆ

★ ★ ★

.. ... هتـد

س ـ لەلاپـەرە (١٠٢ـ١٠٣)دا، کە باسی شەغرە کێشانەوەی کردووە، دەبوایە شەغرەی بچووك و گەورەی لێك بکردایەتەوە، چونکـە شەغرەی کچکە هی گوێ درێژان و، هی گەورەش بۆ هێستران بووە.

ئەمـە لەلایەك لەلایەکی تریشەوە، چەند ووردەکارێکی تری شەغـرەکێش و کێشـانەوەی لەبیر کردووە، وەکو: ئەگەر شەغرەکێش منداڵ بوایە ئەوە هەڵدەستان شەغرەکەیان زۆر بۆ قایم دەکردو، منداڵەکەیان سواری کەرێکی تر دەکرد بەتایبەتی ئەگـەر رێگـا دوو بوایەو، هێسترەکەش جەموش بووایە، ئەوە هەمـوو دەم گوێ درێـژێکی هێمنـانەیان بۆ منداڵەکە تەپان دەکـردو، هێستـرەکـەی بەدوای خۆیـەوە رادەکێشـا تاوەکـو منـداڵەکـە بەرنەداتەوەو، دەستی نەشکێنێ، چونکە زۆر جار شتیوا رووی داوە.

هەروەهـا باسی ئەوەی نەکـردووە کە لە کاتێکـدا گەر تێلەکێش پێ نەوەستایە یا ئەوەتە نەیتوانیایە یەکێ لە سەپانە ئایەغەکان یاریدەی دەدا. گەلێ جاریش سەپانی ئایەغ خۆی بەشتی ترەوە خەریـك دەکـرد، یا ئەوەتـا درۆیـەکی گەورەی دەدیتـەوەو دەی گوت: زگم دێشی یا دەی گوت: نیـوەرۆ نانم نەخـواردووە یا دەی گوت: ئەمشەوە سەرمام بووە، ئەوانەشی هەمووی درۆ بوو، شەرمی کردووە بڵێ ناتوانم یا ماندوو بویمە

لەبەر ئەوەی نەوەکو تێلەکێش بزانێ بۆیە ئەو فروفێڵانەی دەکرد!!!

کەچی هەندێ وولاغی شەغرەکێش هەبوو بەبێ ئەوەی هیچ کەس بیهێنێتەوە بۆ گوندو سەر جوخینی قرشەی بەخۆی هاتۆتەوە، دوای بەتاڵ کردنی قرشەکە یەکێك بردویەتیەوە بۆ سەر پەرێزێ. یا ئەوەتا زۆر جاران شەغرەی لەنیوەی ڕێدا «دەزا» واتا شەغرەکە دەکەوتە سەر زەوی‌و قرشەی لایەکی بەلایەکەی تردا ئاوا دەبوو... ئەوجا شەغرەکێش دەی گوت: دەك کۆراییت لێ کەوێ تێلەکێش لەگەڵ خۆت شەغرە ێنانت.؟ لەکێشتانان‌و نیوەڕۆو عەسران و ئێواران و نیوە شەوان هێسترەکانی ئاو دەدان لەپێش ڕۆژ ئاواش هەڵدەستا وولاغەکانی شەغرە کێشانەوەی لەسەر قرشەی جۆی ـەبەستایەوە تا ماڵ نوستنان ئینجا دەی هێنانەوە ماڵەوەو، زۆر باشی دەبەستانەوە تاکو بۆ بەیانی بەر نەبن و شەغرەی پێ بکێشێتەوە.

نە کوردەواریش دا «زبارەو دەستەوایی» لە شەغرەکێشانەوەش هەر هەبووەو لەگەڵ یەکتری لە نێوان ماڵە دراوسێکانی جووتیاراندا.

ش ـ لەلاپەرە (١٣٩،١٥٠)دا فەرهەنگۆکێکی بۆ ووشە گرانەکان کردووەو، لەهەموویانیش سەرکەوتنی بەدەست هێناوە تەنها لە دوو ووشەدا نەبێ کە پتر پێویستیان بە روون کردنەوە هەبوو:

ا ـ لەوانە ووشەی «هۆزەبانە»، مامۆستا نووسیویە:

«ئاهەنگ و خۆشی‌و داوەتی لەدایك بوونی منداڵە».

هەموو نەوەی نوێی ئەمرۆمان وا بە ئاسانی لەم ووشە پرمانایە ناگەن؛ بەڵکو پێویست بوو بیگوتایە: «لە دوای ئەوەی کە ئافرەتێك منداڵی دەبێت بەتایبەتی کور چەند کەسێك دەچنە لای دایکی منداڵەکەو، پێی دەڵێن: کێ خاڵی منداڵەکەیە؟ ئەویش دەی گوت: فلان کەسە، مەرجیش نەبوو خاڵی راستەقینە بێ، دایکە کێی بەخاڵ دابنێ‌و بە برای خۆی بژمێرێ ئەوە ئەو دەبێتە خاڵی منداڵەکە، ئەوانیش دەیان گوت فلان تۆ دەبێ هۆزەبانەمان بۆ بکەی، تۆ خاڵی! ئەویش ناچار قەندێ شەکری دەکری‌و چایەکی زۆر خۆش و بەتامی بۆ لێدەنان، ئەگەر نا بە دارێیان وە دەکرد، ئەو کەسەی نەیهێشتابایە بە دارێ وە بکەن، ئەوە هۆزەبانەکەی دەکەوتە سەرو، ئەو بە ئەرکەکە هەڵدەستا.».

ب ـ لە ووشەی «هەلیکسە»دا، نووسیویە: «هەلیکسە یارییێکی منالانەیە. دەبوایە بڵێت: یارییەکی منداڵانەی کچانە لە تەمەنی (٧ـ١٠) ساڵیدا دەکرێ.

بێجگە لەوەش دەبوایە مامۆستا «داود» ووشەکانی ئەم فەرهەنگۆکەی بەپێی پیتی ئەلف و بێی کوردی رێکبخستایە، تاکو زانستی‌یانە تر بوایە، نەك هەر ڕەمەکی بەری لێ گرتووەو، بڵاوی کردۆتەوە.

لە کۆتایی‌دا هیوادارم لەم هەڵسەنگاندنەدا ناوەندی دارم گرتبێ‌و، خوێنەدەواران و مامۆستا «داود»یش بە مەبەستی خزمەت کردن ئەم نووسینە سادەیەم لێوەربگرن و بە پەسەندی بفەرموون.


__سەرچاوەکان:__

١ـ گوڵێك لە ڕەوسەی فۆلکلۆری کوردەواری، چاپی یەکەم، داود محمد شرۆل، بە یارمەتی ئەمینداریتی گشتی ی رۆشنبیری‌و لاوانی ناوچەی کوردستان لە چاپ دراوە، چاپخانەی «الحوادث» بەغدا، ١٩٨٧.

٢ـ أساليب الأختيار والتقويم في التربية والتعليم، س. م لندڤل وەرگێرانی: عبدالملك الناشف، د. سعيد التل، بيروت ـ نيويورك ١٩٦٨، ل/ ٢٧.

٣ـ هەڵبەستێکی مامۆستا «شێخ ئەنوەر سەید ئەحمەد» کە لە ٢٥/٣/١٩٨٦، لە ماڵی خۆیان لەگەڕەکی ئەندازیاران لە خۆیم وەرگرت بە ئامادەبوونی مامۆستا «معتصم عبدالكريم معروف بەرزنجی».

٤ـ علم النفس التربوي، د. احمد زكي صالح، مصر ١٩٧٢.

٥ـ الجنس و النفس، د. علي كمال، ١٩٨٥.

٦ـ هەندێ داب و نەریتی باوی کوردەواری، کۆکردنەوەو ئامادەکردن و لێکدانەوەی: عومەر ئیبراهیم عەزیز، دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی، زنجیرە (١٩٥)، ١٩٨٨.


٥



# کالۆ

جلال ملا حسن خۆشناو

دەگێڕنەوەو دەڵێن لەکوردستانی تورکیادا لەسەردەمی میری عوسمانی‌دا، ئاغایەك هەبوە ناوی (خالید) ئاغا بووە، سەرۆکی خێڵی (زیلان و حەیدەران) بووە، ئەو خێڵە لە (١٧٠٠) ڕەشماڵ پێك هاتبوو.

ئێوارەیەك هێشتا ڕۆژ لەچیا سەرکەشەکانی کوردستانی تورکیا ماڵ ئاوایی نەکردبوو، زەردەی خۆرەتاو لەناو ڕەشماڵەکان هەر مابوو، (کالۆ)و خێزانەکەی کە ناوی (مێرك) بووە لەگەڵ چەند دەوارێکی بارکراو دەگەنە نێو خێڵی (زیلان و حەیدران) . ئەم بارکردنەش بەهۆی دوژمنایەتی ((کالۆ)) لەگەڵ بەرەبابێکی تری خێڵی زەریاندا بووە.

نۆکەرو پیاوەکانی خالید ئاغا (کالۆ) دەبەنە لای خالید ئاغا ئەویش کە چاوی بە ((کالۆ)) دەکەوێ بە پیاوەکانی خۆی دەڵێ یارمەتی بدەن، چونکە پیرەو لێقەوماوە، بێگومان ئەمەش ڕەوشت و نەریتی کۆنی کوردەوارییە، کە مرۆڤ تووشی کارەساتی دوژمنایەتی‌و، ژن هەڵ گرتن و، سل بوون ببوایە، ڕووی دەکردە خێڵێکی تر، بۆ ئەوەی ژیانی لە مەترسی بپارێزرێت.

((کالۆ)) ماوەیەکی زۆر لەنێو خێڵی (زیلان و حەیدەران) بەسەر دەبا‌و، دەبێتە دڵسۆزی (خالید ئاغا)، هەروا خەڵك خۆشیان دەوێ‌و، ڕێزی لێ دەگرن.

خالید ئاغاو خێڵی «زیلان و حەیدەران» نەیان زانیووە کە ئەو (کالۆیە) هەرچەندە پیرە؛ بەڵام لەکاتی تەنگانەدا لەشەڕە شێرو ڕەبازی‌دا شۆڕەسوارو پاڵەوانی مەیدانە.

ڕۆژگار وا ڕێك دەکەوێ خوارزای «کالۆ» کە (محۆیێ زەری)یە لەگەڵ خوشکەکەی کە ناوی (گەورك) د زویر دەبن و، ڕەشماڵی خۆیان هەڵ دەگرن، لەگەڵ مالاتێکی زۆردا، خێلاتی (زەریان) بەجێ دێڵن و، دەکەونە لە هەوارێك دا بۆ هەوارێکی تر، تا دوای چەند ڕۆژێك دە هەوارێك و دادەمەزرێن، ئەو هەوارەش زەوی زارو پاوانی خ ئاغا دەبێ، هەروا هەوارەکەش نزیکی خێڵی «زیلا حەیدەران» دەبێت.

خالید ئاغا تەماشا دەکا ڕەشماڵێکی ڕەشی عە لەسەر زەوی‌و زارو پاوانی وی هەڵدرایە، بۆیە بانگی دوو پیا خۆی دەکات و، پێیان دەڵێ: «بڕۆن بە خاوەنی ئەو ڕەش بڵێن کە لەسەر زەوی‌و پاوانی منی هەڵدایە، لێی پرسیارکەن ڕێبوارە؟ یان لێقەوماوە؟ یان بەزۆری ڕەشماڵی لەسەر زەو پاوانی من هەڵدایە؟».

هەردوو پیاوەکانی ئاغا بەرەو ڕەشماڵەکە دەکەونە ڕ کە نزیك ڕەشماڵەکە دەبنەوە دەبینن ئافرەتێکی جوان و خر خوێن شیرین و، ناسك و نازدار، لەڕەشماڵەکەدا دێتەدەر، لە جوانی ئەو ئافرەتە سەرسام دەبن و، ماوەیەك خۆیان لە دەچێ، لە دواییدا هۆشیان دێتەوە سەرخۆو دەچنە ڕەشماڵە بەپێی نەریتی کوردەواری، خاوەن ڕەشماڵەکە ڕێزیـ دەگرێ‌و، خواردنیان بۆ ئامادە دەکات و، دۆی ساردیـ دەرخوارد دەدا.

لەدوایی‌دا پیاوەکانی ئاغا خۆیان بە خاوەن ڕەشماڵە دەناسێنن و ئەوەی خالید ئاغا پێی گوتبوون بە خاوە

ڕەشماڵەکە رادەگەیێنن.
خاوەنی ڕەشماڵەکە وەڵامیان دەداتەوەو دەڵێ:
**«ئەز بەخوا (محۆ)مە (محۆیێ زەری)مە، ئەز لێقەوماوم، پەنا بەخوا بەم زووانە سەردانی ئاغا دەکەم».**
یەکێك لە پیاوەکانی ئاغا دەیەوێ بزانێ کە ئەو ئافرەتە کێیە؟
خۆیـە دەڵێ برا محـۆ، هەرتۆو خێزانت لەم ڕەشماڵەدا دەژین، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ:
نەخـێر، من خێـزانم نـیـیە، بەڵکو تەنها (گەورك)ی خوشکم لەگەڵ دایە.

پیـاوەکـانی ئاغا دەگەڕێنەوەو دەچنە لای خالید ئاغاو بۆی دەڵێن، خاوەنی ڕەشمـاڵەکـە ناوی (محـۆیێ زەری)یەو لێقەوماوە، لەم زوانەش سەردانی تۆ دەکات هەروا پیاوەکانی بە خالید ئاغا رادەگەیەنن کە (محۆیێ زەری) خوشکێکی هەیە ناوی (گـەورك)ە، هەر دەڵێی پەریە، لەنێو هەموو خێڵەکاندا بجوانی وا نەبووەو نابێت، واچاکە لەدەست خۆتی نەدەی.
خالید ئاغا باوەر ناکاو دوو پیاوی تر دەنێرێو، ئەوانیش زیاتر باسی جوانیو نازداریو شۆخ و شەنگی (گەورك)ی بۆ دەکەن.

خالید ئاغا ئەگەرچی سێ ژنی هەبووە؛ بەڵام بریار دەدا کە خوشکی محۆیێ زەری خوازبێنی بکات جا بەخۆشی بێت؛ یا بە نا خـۆشی، هەر بۆیـەش دوو سێ پیـاومـاقـوڵی خێڵەکە بۆ خوازبێنی دەنـێرێ، کە دەگەنە ڕەشماڵەکە، محۆیێ زەری بە گەرمی پێشوازیان دەکات و، زۆر ڕێزیان دەگرێو، پێیان دەڵێ: فەرموون چیتان گەرەکە من ئامادەم بۆ جێ بەجێ کردنی.
ئەوانیش دەڵێن خالید ئاغا ئێمەی ناردووە بۆ لای تۆ، کە خوشکی خۆت (گەورك) بدەیتە خالید ئاغاو، خزمایەتیت لەگەڵدا پەیدا بکات، هەروا هەرچی تۆ بخوازی ئاغا ئامادەیەو راوەستاوە..
محۆیێ زەری ماوەیەك بیر دەکاتەوەو، دەڵێ:
**«خـالیـد ئاغا ئێوەی ناردووە بۆ لای من بۆ خوازبێنی، کەچی نەمن خالید ئاغام دیوە، نە خالید ئاغاش منی دیوە، بەراستی جێی سەرسوڕمانە؟».**
**بەڵێ من دەتـوانم خوشکی خۆم بدەمـە خالیـد ئاغـاو، نایدەمە یەکێکی تر کە لەخالید ئاغا باشتربێت.**
**بەڵام کاتێك دەنگوباسی بەشوودانی خوشکم لەناو خێڵاتی زەریان بڵاو دەبێتەوە، دەزانی چیم پێدەڵێن؟**
**«دەڵێن محـۆیێ زەری چەند ڕۆژێك سل بوو، کەوتە نێو خێڵەکـانی تر نەیتـوانی گوزەران بکـات بۆیە خوشکی خۆی دایە خالید ئاغا تا گوزەران بکات، ئەمەش کارێکی ناشیرینە بۆ خۆم و، بۆ خێڵەکەم!»**
**هەروا محۆ بە پیاوە ماقوڵەکان دەڵێ: ئێوەنێردراوی ئاغان و هیچتان لەدەست نیيە، ئەگەر وانەبوایە سەری هەمـووتـانم دەبریو بەسەر ڕمانم وەدەکردوو، بۆ ئاغام دەناردنەوە فەرموون برۆن و، بەخالید ئاغاش بڵێن:**
**محـۆیێ زەری دەڵێ ئەز بە زۆری ڕەشمـاڵی خۆم لەسـەر زەویو پاوانی وی دانایە، هەرچی لەدەستی دێت با بیکات.**
**نێردراوی خالید ئاغا کە دەگەڕێنەوە دەقی وەڵامی محۆ بە ئاغا رادەگەیەنن.**
**محـۆیێ زەری بۆ ئامادەبوونی شەر ڕەشماڵی خۆی هەڵ دەگـرێو دەیبـاتـە (خـانێ خەربـەزێنێ) ڕووبەڕووی لەشکری خالید ئاغا بوەستێ**

لەهـەمـان ڕۆژدا کاتی ئێـوارێ خالیـد ئاغـا داوا لە (قـاوەچی) دەکـات کە (هـاوەن)ی گەورە لێبـدات، لێدانی (هـاوەن)ی گەورەش واتە ئامادەبوونی خێڵە بۆ تاڵان کردنی خێڵێکی تر، یان بەسـەرهـاتێکی گەورەیە، یان شـەڕو شۆڕی لەدوایە. کە قاوەچی «هاوەن» لێدەدا، لەنێو (١٧٠٠) ڕەشماڵی زیلان و حەیدەران دەنگ دەداتەوەو، لەهەر ماڵێك یەك دوو پیاو بەرەو دیوەخانی خالید ئاغا دەچن، بۆ ئەوەی بزانن چ باسەو چ ڕووی داوە!!
هەروا ڕەشـەکی خالیـد ئاغاش کە ناوی(حەمۆ) دەبێ ئامادە دەبێ، حەمۆ پاڵەوان و پیاوکوژی ئاغا بووە لە مەیدانی شەڕدا ڕوو بە ڕووی (١٥٠) سوارچاك ڕاوەستاوە، خەڵکەکە بە خالید ئاغا دەڵێن:
**ئاغا چی قەوماوە، چی ڕووی داوە!؟**

خالید ئاغا وەلامیان دەداتەوە، دەڵێ:
محۆیێ زەری بە زۆری ڕەشماڵی خۆی لەسەر زەوی و پاوانێ من دانایە.

ئیتر بۆ بەیانی (١٧٠٠) سوارچاکی خێڵی زیلان و حەیدەران ئامادە دەبن و، چاوەڕێی فەرمانی ئاغا دەکەن.

ژنی ((کالۆ))ی کە ناوی (مێرك) بووە بۆ نوێژی سبەینێ دەچێتە سەر کانی، لەپاش نوێژکردندا کوندە ئاوەکە پڕ دەکات و دەکەوێتە پرسیار کردن لەو ژنانەی دەورو بەری.

یەکێك لەو ژنانە پێی دەڵێ: خالید ئاغا (١٧٠٠) سواری ئامادە کردووە، کە شەڕی محۆیێ زەری بکات و، خوشکەکەیشی بە زۆری لەگەڵ خۆی بێنێ و، مارەی بکات. زۆری پێ ناچێ خالید ئاغاو لەشکرەکەی بەرێ دەکەون بەرەو «خانێ خەربەزینێ» کە «مێرك» چاوی بەو هەموو سوارانە دەکەوێ خۆی پێ ڕاناگیرێ و ناتوانێ لەو زۆرداری یە بێ دەنگ بێت بۆیە هەروەکو شێت بەرەنگاری (کالۆ)ی مێردی دەبێت و، دەڵێت:

**مێرك دبێت :**

«وەی لێ کالۆ بلا زۆزان بشەوتێ ل خانێ خەربەزینێ بسەرێ تەدا کالۆ.
وەرە لێلێ لێ لۆ دەلۆ لۆلۆ لۆ کالۆ وا ب (بی)یە.
بەلێ کالۆ ب خانێ خەربەزینێ داکەتم ل من بهاری تەرە، حالید ئاغا ل گەل خۆ ڕاکر (١٧٠٠) سوارێ زیلان و حەیدەران ل خانێ خەربەزینێ، ل سەرملێ محۆیێ زەری گرتن چار دەورو چار کنارە کالۆ. درابە کالۆ لۆلۆ ئاخ مشەختۆ لۆلۆ ئاخ وەختیارۆ لۆ من تە ناڤێ.

**مێرك دبێت :**

وەی لێ کالۆ بلا زۆزان بشەوتێ ل خانی خەربەزینێ کالۆ بسەرێ تەدا.
وەرە لێلێ لێ ئاخ لۆلۆ لۆ ئاخ دەلێلێ لێلێ کالۆ وا ب (جە)یە.
وەرە کالۆ ب خانێ خەربەزینێ داکەتم وا ب (جە)یە، خالید ئاغا دگەل خۆ ڕاکر (١٧٠٠) سوارێ زیلان و حەیدەران لەسەر ملێ محۆیێ زەری وەیلا من گۆ، من دێرانا خودێ، گرتنەوە چار دەورو (ئۆغرمە)یە، کالۆ
بەرێ «کالۆ» دێ ڕابە هەکە تو نارابی ناوی مێرکی ل سەر تەیە، وەلا من گۆ محۆیێ زەری چی من نی‌نە بەرێ دبێژن ڕەبەنۆ خوارزاکی تەیە.
وەکە محۆیێ زەری بکوژن وەلا تو بزانە سبەش دۆراتەیە.
ئاخ دەلۆلۆ لۆلۆ مشەختۆ لۆ دۆراتەیە.

**مێرك دبێت :**

وەرە کالۆ بلا زۆزان بشەوتێ ل خانێ خەربەزینێ وەلا کالۆ ئاخ وەرە لۆلۆلۆ ئاخ دەلۆلۆلۆ ب (کەڤوت)ە. بەرێ کالۆ خالید ئاغا ل گەل خۆ ڕاکرن (١٧٠٠) سوارێ زیلان و حەیدەران ل خانی خەربەزینێ، وەختێ من گۆ بلبلێ سواران ژۆردا تێنە خوارێ، من گۆ دۆرا کۆنێ محۆی وەیلا من دێرانێ خودێ، وەیلا کەت کەتە جوت ب جوتە، وەلا وەکی سبەی محۆی بکوژن خەڵك و عالەم ل کۆشك و دیوان و مەجلیسێ مەزنان و ئەکابیران، ئاخ دێ بۆ تە چ کەلامە، وەیلا من گۆ تە چ گۆتە.
لۆلۆ لۆ ئاخ کالۆ ڕەبەخۆ.

**مێرك دبێت :**

«وەی لێ کالۆ وەزێ ب خانێ خەربەزینێ داکەتم وەلا بسەرێ تەدا ئاخ لێ لۆلۆ وەرە لۆلۆ لۆلۆ کالۆ ب (سماق)ە.
وەلا کالۆ خالید ئاغا ل گەل خۆ ڕاکرن (١٧٠٠) سوارێ زیلان و حەیدەران، ل خانێ خەربەزینێ سەر ملێ محۆیێ زەری گرت، وەی لا من دێرانا خودێ چار دەورو (ئیتیفاق)ە.
وەی لێ کالۆ، درابە من تو نەڤێ، من ڕەشەکێ خالید ئاغای دڤێ، دبێژنێ (حەمۆ).
وەرە دێ ڕابە من خەلاس کە ب (سێ) تەلاقە، لۆلۆ ئاخ لۆلۆ لۆ کالۆ ب (سێ) تەلاقە».

**کالۆ دبێت :**

«وەلا مێرکێ بلا زۆزان بشەوتی ل خانێ خەربەزینێ بسەرێ تەو محۆیدا، مێرکێ وەلا کەکی لێلێ لێلێ وەرە لۆلۆ لۆ ئای دەلێلێ لێلێ مێرکێ وا ب (بی)یە.
وەلا مێرکێ وەزێ ب خانێ خەربەزینێ داکەتم وا ب (بی)یە، خالید ئاغای دابۆ من سینیەکە زێرە، یەك مەجیدی‌یە، بلا بچی

محۆی بکوژی ل نیوەکا تەولخانێ، هەر وەکی محۆ چیمن نییە.
بەلێ من گۆ قرارێ خودێ ب گیانێ من کەتبی، دەما تو بکەیە رکە وەزێ سبەی زوو بچمە خانێ خەربەزینێ نیوا مەیدانێ رەمەکی ل نیوا قولنجێ (حەمۆ)ی بدەم، رەشەکێ خالید ئاغای وەزێ (سەورك) و (نەمرکا) سەرگیانێ تە رابینم (هەویاتی)یە، ئاخ مێرکێ لێلێ لێ لۆلۆ لۆ ئای دەلێلێ لێلێ مێرکێ وەز (کالۆ)مە.
کالۆ بسێ دەنگا بانگ دکا، مێرکێ دێ تو رابە لەز بکە خۆ ب ناو عێلاتێ زەریا بگەینە حەفت حەلەقەو دوازدە بەربەنا گیانێ من بینە چ کچکەکە جوانە کل و کلدانێ وێ، ژێ وەربگرە مێرکێ تو ژمن رابینە.
مێرك رابــووە لەشکـری نەزانـدیە، خۆ ب ناو عێلانێ زەریادا بەردابـــە حەقت حەلەقـــەو دوازدە بەربـــەن ب گیـانێ کالۆی راهانییە، چ کچکەکە جوانە کل و کلدان ژێ وەرگرتییە، وەلا بۆ کالۆیرا وێ هانییە.
پاش ئەوەی مێرك پێویستەکانی کالۆی جیبەجێ دەکا دەست دەکــا بە تەراش کردنی ردێنی کالۆی، لەدواییدا چاوەکـانی کالۆی بە کلی رەش دەکاو قەلوونەکەی بۆ دادەگرێ لە تووتنێ ئەستـەمبـۆلێ، ئینجـا کالۆ هەلٚ دەستێتەوەو، بەرەو تەولخانە دەچێو، ئەسپی (حەمدانی) لە تەولخانێ دەردەهێنێو، پێی لە رکێفی حەمدانی دەنێو دەلێ هاها «مێرکێ، ئەز کالۆمە:

کالۆ بەرەو خانێ خەربـــەزینێ بەرێ دەکـــەوێ، بۆ ئەوەی بە هاواری «محۆ»ی خوارزای خۆی بچێت، کە دەگاتە شوێنەکە لەدووری لەشکـری خالیــد ئاغـای رەشمـاڵەکـەی خۆی لە بەرزاییێك دادەنێو، چاوەروانی بریاری شەر دەکا، بۆ ئەوەی لە دژی خالید ئاغاو لەشکرەکەی بوەستێو پشتی خوارزای خۆی بگرێت.
لەشکـری خالیـد ئاغـای لەهەر چوار لای رەشماڵی «محۆ»یێ زەرییەدا دادەمەزرێن، کە شەو رادەسکێ «گەورك» لەبن کۆنێ رەشی عەرەبی دیتە دەرێو، تەماشا دەکا ئاگری لەشکرەکە، وەك ئەستێرەی ئاسمان لەهەر چوار لای رەشماڵەکە رۆشنایی دەدا، بۆیە (گەورك) بۆ نێو رەشماڵ دەگەرێتەوەو، ئاگاداری محۆی دەکا کە لەشکرێکی زۆر ئابلوقەی داون.
محۆ دەلێ: [«خوشکا من، ئەوە هەمووی ئەسپی من لە مەیدانێ شەرێدا گەرم ناکـات؛ بەلام خویشك ئەگەر خالێ من ل گەل خالیـد ئاغای دابیت، نە شەرو نە هەلاتن بەمن ناکرێ، بۆیە پێویستە زوو بەزوو جل و بەرگی من لەبەر بکەیەو، بەسواری ئەسپ بچیتــە ناو لەشکـری خالیـد ئاغـای، چونکـە شەوەو کەسیش تۆ ناناسێ، پرسیار بکە بلێ مرۆیەك هەیە ناوی کالۆیە هاتییە نەهاتییە، مردییە یان زندییە]... «گەورك» بە پەلە خۆی ئامادە دەکاو، دەچێتە ناو لەشکری خالید ئاغاو، پرسیار لە کالۆی دەکا، یەکێك پێی دەلێ: ماوەو هاتییە، سەیری ئەو ئاگـرە بکە کە لە دووری لەشکری ئێمە دیارە، ئەوە رەشماڵی کالۆیە «گەورك» کە نزیك دەبێتەوە، کالـۆ دەلێ ئەوە کێیە؟
«گەورك» وەلامی دەداتەوەو دەلێ: «خاڵ ئەز گەورکم».
«کالۆ» خوارزایێ خۆی دەناسێتەوەو دەلێ:
**فەرموو تە خێرە خوارزا».**
**دەلێ: «بەلێ خالۆ، محـۆی ئەز ناردیمە تا بزانی تە ل گەل خالید ئاغای یان نا، ئەگەر ل گەل خالید ئاغای، وەرە بەبێ شەر ئەز بۆ خالید ئاغای ببە ب دیاری».**
کالۆ پێی دەلێ: «کچـا من، ئەز ل گەل خوارزایێ خۆ دامـە، (چونکە چ گافا خوین نابیتە ئاو)، بۆیە بگەرێوەو، دوو دلٚ نەبە بێژە محۆی کە شەر دەستی پێکرد، ئەو ل وێ سەری، بلا ب رمی لەشکری کوبکاتەوەو، منیش لەو سەرەی، زۆری پێناچی خالید ئاغاو، لەشکرەکەی دەشکێنین».
«گــەورك» دەگــەرێتــەوەو، هەلۆیستی «کـالۆ»ی بە محـۆی رادەگەیەنێو، «محۆ» گەلێك پێخۆش حاڵ دەبێ.
کە دەبێتـە بەیانی «رەشەکێ» خالید ئاغای، کە ناوی حەمۆ دەبێ چاوی بە کالۆ دەکەوێ دەچێتە لای خالید ئاغاو پێی دەلێ: «ئاغا وادیارە کالۆ دەهاوارێ خوارزایێ خۆ هاتییە».
خالید ئاغاش دەلێ: «ئەو پیرە مێرە چییە؟ تا دە هاوارێ محۆی بێت، ئەو مرۆڤە بۆی رێك کەوێ بە دەستی خۆی خوارزاکەی بۆمن دینێ».
(حـەمـۆ) رەشـەکێ خالیـد ئاغـای دەیەوێ «کالۆ»ی بەسەر بکاتەوەو، هەلۆیستی بزانێ، بۆیە بەرەو رەشماڵەکەی دەچێ،

که دەگاتە ئەوێ بەندێکی پێدا هەڵ دەداو، دەڵێ:

**حەمۆدبێ :**

وەرە کالۆ بلا زۆزان بشەوتێ ل خانێ خەربەزینێ وەیلا ب سەرێ محۆیدا کالۆ، وەرە لۆلۆ لۆلۆ دەلێلێ لێ کالۆوا ب (جە)یە.
ئەز حەمۆمە رەشەکێ خالید ئاغامە ل ئۆرتا مەیدانێ بەرامبەر (١٥٠) مێرا ئەز ب خۆمە، وەلا قرارێ خودێ ب گیانێ حەمۆی کەتبی، سبەی زوو، نیوا مەیدانێ رمەکی ل نیوا قولنجێ وەیلا محۆی بدەم خوشکا وێ جانێ خالید ئاغای رابینم حەلالیە، وەلا ماتو ئەختیاری چ حەوجەی تەیە.
ئاخ دەلۆلۆ لۆ ئاخ دەلۆلۆ لۆلۆ کالۆ.

**کالۆ پێدەکەنێو وەڵامی حەمۆی دەداتەوەو، دەڵێ:**

**هاها حەمۆ !**

«وەرە حەمۆ ئەسپێ من شێست ماکو ژنێ بابێ تە کوتایێ، حەمۆ چما تو وە دبێژی، بەڵێ وەلا قرارێ خودێ ب گیانێ من کەتبی حەمۆ، وەزێ سبەی زوو ل نیوا مەیدانێ خانێ خەربەزینێ وەزێ رمەکی ل قولنجێ تە بدەم حەمۆ، وەلا من سوند خواریە، سوندێ قەسەمێ (سەورك)و (ئەمرکا) ب سەر گیانێ مێرکێ بینم هەویاتییە، ئاخ دەلۆلۆ لۆ دەلۆلۆ لۆلۆ حەمۆ وەز کالۆمە».
هەروا کالۆ دەڵێ: «حەمۆ خودێ ئەز تە دکوژم».
حەمۆ دەڵێ: «چەوا تە من دکوژی تو پیرو ئەختیاری ئەزیش پالەوانێ مەیدانێم».
کالۆ دەڵێ: «درێژنەکە، ئەز تە دکوژم»
کالۆ هەڵ دەستێتە سەرپێیان و دەڵێ: «با لێرە من و تۆ بکەوینە شەر بزانین کێ کێ دەکوژی».
حەمۆ وەڵامی ناداتەوەو دەگەڕێتەوەو دەچێتە لای خالید ئاغای؛ بەڵام پێی شەرم دەبێ هەڵوێستی کالۆ بە ئاغا رابگەیێنێت.
ڕۆژی سێیەم بڕیاری شەڕ دەدرێو هەر لە یەکەم هێرش دا (محۆیێ زەری) ڕمێك لە نێوەڕاستی قۆڵنجی خالید ئاغای دەداو لەسەر پشتی ئەسپەکەی دەیخاتە خوارەوە، کالۆش لە مەیدانی شەڕیدا ڕمێکی لە نێوەڕاستی قۆڵنجێ دەداو، لەسەر پشتی ئەسپەکەی دەیخاتە خوارەوە.
ئیتر دەکەونە نێو لەشکری خالید ئاغاو، ئەوەی دەیکوژن دەیکوژن، ئەوەی ڕادەکا، ڕادەکا، ئەوانەی دیکە خۆیان بەدەستەوە دەدەن.
بەم جۆرە «محۆیێ زەری» سەردەکەوێو دەبێتە سەرۆکی خێڵی «زیلان و حەیدەران»و، لەسەر ماڵ و سامانی خالید ئاغا دادەنیشێو هەرسێ ژنی خالید ئاغای مارە دەکا.
کالۆی پیرو سوارچاکیش هەردوو ژنی حەمۆی مارە دەکاو بەڵێن و سوێندی خۆی بەجێ دەگەیەنێ.

**فەرهەنگۆك**

١ـ زیلان : خێڵێکی کوردە لە کوردستانی تورکیا
٢ـ حەیدەران : خێڵێکی کوردە لەنێوان کوردستانی ئێران و تورکیادا نیشتەجێن
٣ـ کالۆ : ناوە، هەروا بە مرۆڤی پیریش دەڵێن کالۆ.
٤ـ ئۆغرمە : ووشەیەکی تورکییە تەقەی تفەنگ لەگشت لایەك ـ تەنگانەو ناخۆشی
٥ـ خەربەزینێ : جێگەی ڕووداوەکەیە
٦ـ مشەخت : لێقەوماو . بەلەنگاز . کۆچ وڕەو.
٧ـ زەری : جوان، پەری. خێڵێکی کوردەلەکوردستانی تورکیادا هەروەك لەبەسەرهاتەکەدا دیارە، بەڕای من زەری، خێڵی (زررکا)نە کەلە باکووری شاری دیاربەکر نیشتەجێن
٨ـ کەڤوت : دارکەوەت، دارێکی بۆندارە، دار جگارەو گۆپاڵی لێ دروست دەکەن.
٩ـ ئیتیفاق : ووشەیەکی عەرەبییە ـ یەك گرتن .
١٠ـ بی : دارێکە لەدەم ڕووبارو جۆگەو جێگەی شێدار شین دەبیت.
١١ـ جە : جۆ

**سەرچاوەکان**

١ـ کاسێتی تۆمارکراوی ستران بێژان (عەلی خەنجەر ـ ژەنگاری ـ حەسەن ڕەش ـ ابراهیم حەسەن).
٢ـ سترانێت کۆچك و دیوانا ـ کۆمکرنا ـ مصطفی بامرنی
٣ـ گۆڤاری بەیان ژمارە ١٣٩ سترانا کالۆی ـ محەمەد عەبدوڵلا.



فاضل شەوڕۆ

# جۆلایی و كارگەچێتی و تەون گەری لەناو كوردەواریدا

مێژوونووس و ئەدەبیاتناس و فۆلكلۆرپەروەران ساغیان كردۆتـــەوەكـــە گەلی كورد نەك هەر خاوەن سامـــانێكی گەورەو رەنگینە لە فۆلكلۆردا، بەڵكو رۆڵێكی كاریگەریشی هەبووە لەسەر مێژووی كولتووری میللەتانی رۆژهەڵاتی ناوەراستدا. (ن.یا. مارر) كە رۆژهەڵاتناسێكی ناسراوە، بەم بۆنەیەوە نووسیەتی: «خێڵەكانی كورد لە پێكەیاندنی ئاسیای بچووك و لە سازكردنی كولتـووریكی بەنـرخ لە مێـژووی میللەتانی پشت قەفقاسدا دەورێكی گەورەیان بینیوەو تا ئەمڕۆش لە بینینی ئەو دەورەدا هەر بەردەوامـن.[1]». بەڵام حەیف و مەخـابن، ئەوە سەدەی بیستـەمیش دێ باروبـارگـەی خۆی بپێچێتـەوە، كەچی ئەم گەنجینـە بەنـرخـە، وەك پێـویست وایـە كۆنـەكـراوەتـەوەو نەنـرخێنراوەو لێكۆڵینەوەی زانستی قووڵ و فراوانی ئەوتۆی لەسـەرنـەكـراوە كە تەپ و تۆزی رۆژگاری چەتوونی لەسەر لابدات و شەقڵ و مۆرە كوردەواریەكەی دەست نیشان بكات و بە جیهانی بناسێنێت. ئەمەش ئەوە ناگەیێنێ كە بەهیچ جۆرێ فۆلكلۆرەكەمان بەسەرنەكراوەتەوە. مایەیی خۆشبەختیمانە، كە لەم ساڵانەی دواییدا زۆر لە ئەدیب و هونەرمەندو رووناكبیرانی كورد كەوتـوونـەتـە كۆشش و شەونخـونی بۆ خزمەت كردنی كەلەپـووری نەتـەوایـەتیمـان. بەڵام ئەوەی كە سەرنجمـان راكێشێ ئەوەیە كە زۆربەی زۆریان هەر خەریكی بەرهەمە ئەدەبیە سەر زارەكیەكەن و بەشە فراوان و چڕوپڕەكانی تری فۆلكلۆریان لەیاد كردووە، لەكاتێكدا نرخ و سەنگی ئەم بەشە فەرامـۆش كراوانـە هیـچ لە نرخ و سەنـگـی ئەدەبـە سەرزارەكیـەكـە كەمتـرنـین. ناسینەوەی بابەتێكی ئەدەبی فۆلكلۆری- كوردی- بابڵێین حەقایەت -زۆرمان ماندوو ناكات، چونكـە خاسیـەت و بۆن و بەرامـەی حەقـایەتی كوردەواری دەست - نیشان ئەكرێن، بەڵام ئایا ناسینەوەی (بەرە)یەك یان (بـەرماڵێكی)چنراوی كوردەواری لە مۆزەخانەی (بەرلین)دا، یان لەهـەر مۆزەخـانـەیـەكی تری جیهان، كارێكی سووك و ئاسانەو هەروا بەسەرپێی ئەتوانین شەقڵ و مۆرەكەی خۆمانی لەسـەر دەست نیشان بكەین و بڵێین ئەمە بەرهەمی دەستی جۆلای كوردن و لەو ساڵەدا چنراون ؟

خوێنەری ئازیز: بەشێ لەو گەنجینەی كە فەرامۆش كراوە لە فۆلكلۆرەكـەمـاندا، پیشە میللیەكانە (National - trade)، كوردیش هەر وەكو هەموو نەتەوەیەكی تر بۆ پێویستی ژیانی خۆی گەلێـك پیشـەی هێنـاوەتە بەرهەم وەك: مووتابچیەتی، كەلاش كەری، شیرگـەری، مزگەری، كل نانەوە، ئاسنگەری، دارتـاشی، خەراتـی، میرزاگـەری، كارگـەچـێتی، هەلاجی، سەراجی، كۆپـان دروێتی، چەخمـاخ سازی، لێفـەدروێتی، كارێزكەنی، خومخانەچێتی، تەون گەری، دەباخ چێتی، كەوش دروێتی، پانیبەرز دروێتی، بەرگ دروێتی، بەنایی[2]...هتد. ئەم پیشە میللیانە پێویستیان بە لێكۆڵینەوەی تێرو تەسەل هەیە بۆ ئەوەی خاسیەت و رەسانایەتی بەرهەمەكانی خۆمان دەست نیشـان بكـەین و بزانـین تاچ رادەیـەك هونەری پیشەسازی كوردی كاری كردۆتـە سەر دەوروراوسێكـانیو ئەوانیش بە دەوری خۆیـانـدا چ كاریگـیان كردۆتە سەر بەرهەمی پیشە میللیەكانمان. ئەم نووسینەم دەروازەیەكە بۆ باسێكی فراوانتر دەربارەی (چنین و رستن) لە ناو كوردەواریداو رەنگ دانەوەیان لە جل و بەرگ و رایەخ و دەوارو..... بەرهەمەكانی تردا.

## جۆلایی (Weaving)

پیشـەسـازی چنـین بەیەكێ لەو پیشەسازیە كۆنانە دائەنرێت كە لەگەڵ مرۆڤدا هاتۆتە كایەوە: ململانێی مرۆڤ لە لەگـەڵ سروشتـدا- وەك سەرمـاو سۆڵی زستـانی سەخت - ناچـاریـان كردووە هەوڵی دەستـەبـەركـردنی ئەو كەرستـەو داپێـویستیانە بدات كە یارمەتی مانەوەی لەژیاندا ئەدەن. لە سەرەتادا، مرۆڤ جل وبەرگی لە گەڵای داروردەخت و (Leaves) پێستـەو (animal skin) فەرووی گیانداران (fur) دروست كردووە. دوایی هەر لە سروشتەوە فێری چنینی هێندێ گیاوگۆڵ بووە، لەمـەشەوە فێری رستنی داوو بەن (Wollen - thread) بووە لە خووریو (Clip) مووو (hair) لۆكە (cotton) كە بۆ چنینی جل و بەرگ و رایەخ و رەشماڵ و زۆر چنراوی تر بەكار


وێنە (١): شانەی موو


وێنەی (٣): دوڵاب

هێناون، دووریش نیە هەر لە جالجالۆکەوە (Spider) فێری چنین بووبێت، دوای ڕاهاتنی دەست و پەنجەی لە چنین و ڕستندا، کەوتۆتە ڕازاندنەوەی بەرهەمەکانی بە ڕەنگ و نەخش ونیگار، ئەمەیش بەکەڵك وەرگرتن لە بەکارهێنانی ڕەنگ و داوی هەمە جۆرو لێکدان و دوورمان کردنی چەند پارچە چنراوێکی هەمە ڕەنگ بۆ دروست کردنی بەرهەمێکی جوانترو باشتر.[٣]

هەرچەندە کتێبە کۆنەکان ، زۆر ئاماژەیان بۆ چنین و ڕستن کردووە بەڵام تاکو ئێستا نەزانراوە ئەم پیشەیە بۆ یەکەم جار لە چ هەرێمێکدا یان چ هۆزو میللەتێکدا سەری هەڵداوە. هەموو شارستانە کۆنەکان بەرهەمی چنراوی نایابیان هەبووە.[٤] لەناو کوردیشدا لەکۆنەوە ئەم پیشەیە زانراوەو ڕاژەیەکی بێپایانی بەخەڵك گەیاندووە.

ئەم هۆیانەی کە یارمەتی پەرەسەندنی ئەم پیشەیەیان داوە لەناو کوردا ئەمانەن: (١) کەرستەی خاوی سەرەکی ئەم پیشەیە کە خووری‌و مووو مەرەزو میانەیە، بە ئاسانی بە چەنگ کەوتوون، ئەمانە بەرهەمی مەروماڵات و وولاخی بەرزەن، لەبەر ئەوەی کوردستان ئاوو مێرگ و پاوانێکی یەکجار زۆری هەیە، هەر لە کۆنەوە ئاژەڵ بەخێوکردن لەناو کوردەواریدا باو بووە. (٢) زستانی سەختی کوردستان و ژیان و گوزەرانی کردن لە سروشتێکی دژوارو چڕی ناو شاخ و داخ و ئەشکەوت و دارستاندا، هەر زوو فێری کردوون کە بەبێ جل و بەرگ و ڕایەخ و دەواری باش و گەرم و گوڕ حەوانەوەیان ئاسان نیە.

لە کوردەواریدا جۆلاّ (Weaver) بە کەسێك ئەوترێت کە بە دەست شت بتەنێ لە پێچالا.[٥] جۆلاکانی کوردستان زۆر دەست ڕەنگین بوون و چنراوی زۆر باشیان هێناوەتە بەرهەم . ئەمانەش هێندێ لەو بەرهەمانەن :-

**١- ڕانك و چۆغە (Broad cloth) :**

چۆغە - چۆغەڵ - شەل وشەپك - جۆرە تەنراوێکی خووری خاوداری بەنرخە لەگەڵ ڕانکا لەبەردەکرێ.[٦]

کری (شاڵ) ڕانك و چۆغە بەم شێوەی خوارەوە دروست ئەکرێ:[٧] هەنگاوی یەکەم: کری ڕانك و چۆغە لە مەرەز ئەچنرێت. مەرەز موویەکی نەرمە بە ئەندامی جۆرە بزنێکەوە،[٨] پێی ئەڵێن (بزنە مەرەز)، لە دوای مانگی (خەرمانان) جەوبڕ (shearer) بزنە مەرەزەکان ئەبڕێتەوە. هێندێ جار مەرەزەکە لە لەشی بزنەکە هەڵئەوەرێت و شوان کۆی ئەکاتەوە. ئەم مەرەزەبەشانەیەکی دەست کردی خۆماڵی کە پێی ئەڵێن (شانەی‌موو - Comb ) لەشانە ئەدرێت تا لە درك و داڵ و پشقۆڵ و شتی تر پاك بکرێتەوە. (بڕوانە وێنە ژمارە -١-).

هەنگاوی دووەم : ئەم مەرەزە پاککراوەیە بە تەشی (Spindle) ئەڕیسرێت و داوەکەی پێی ئەڵێن (داوەمەرەز). دوایی ئەم داوەمەرەزە ڕیسراوەی قەدی تەشییەکە ئەکرێت بە کەلاف (Skein of thread)، ئەمەش بە هەڵ کردنەوەی لەسەر چەرخی ئامێرێك پێی ئەڵێن (کورەژەن - Spinning - Wheel ) (بڕوانە وێنەی ژمارە -٢-). ئەوسا ئەم کەلافە مەرەزە ئەخرێتە ناو مەنجەڵە ئاوێکی گەرم و لەگەڵ (گلێخە)دا ئەکوڵێندرێت. (گلێخە- سریش Orinthogalum ) ڕووەکێکە لە سەلکەپیاز ئەچێ، لە وڵاتی خۆماندا زۆرە، دوای پاککردنەوەی ئەکوڵێندرێت تا نەرم ئەبێت، ئەوسا وەك نانە هەنجیرە پان ئەکرێتەوەو لەبەر هەتاودا ووشك ئەکرێتەوەو جوان بە ئاون وورد ئەکرێت و لەهێلەگ ئەدرێت.

هەنگاوی سێیەم: دوایی ووشك بوونەوەی کەلافەکە، بەهۆی ئامێرێکی تری دەستکردی خۆماڵی کە پێی ئەڵێن (دوڵاب) لە سەر چەند لوولکەیەك (reel) هەڵ ئەکرێتەوە. دوڵاب پێك هاتووە لە چەرخێکی دار، ئەختێ لە تایەی ئوتومبیل بچووکترە، تەوەرێکی تێهەڵ کێشراوە کە دەستەندوویەکی هەیە بۆ


وێنەی (٢): کورەژەن


وێنەی (٤): دەستەچاخ



وێنەی (٥) :کارگەی جۆلایی

سووڕانـدن، ئەم چەرخە بە هۆی داوەبەنێکەوە لوولکە دارێك ئەسوڕێنێ کە جەمسەرێکی لوولکە قامیشی تێهەڵ ئەکێشرێت . هەر جارەی پڕ بە سەبەتەیەك لەم لوولکانە هەڵ ئەکرێتەوە. (بڕوانە وێنەی ژمارە ـ٣ـ).

هەنگاوی چوارەم: ئەم لوولکانەش ئەخرێتە سەر ئامێرێکی تری دەستکرد پێی ئەڵێن (دەستە چاخ Spindle – Sticks ) . بەهۆی ئەم ئامـێرەوە جۆلا لەسەر (١٢ـ١٦) بەرچیخ لە گۆرەپانێکی تەختـدا داوەمەرەزەکەی رایەڵ ئەکات. رانك و چۆغە نزیکەی (١٥) گەز شاڵ ئەوێت (ژمـارەی رایـەڵەکـان کە بەگـوێرەی شانەی کارگەی جۆلایی دائەنرێت ١٦×٢٠ یان ١٥×٢٠ یان ١٤×٢٠ ئەبێت). (بڕوانە وێنەی ژمارە ـ٤ـ).

هەنگـاوی پێنجـەم: ئەم رایەڵە هەڵ ئەکرێتەوەو بەشێوەیەکی تایبەتی ئەخرێتە سەر کارگەی جۆلایی (پێچاڵ Loom ). جۆلا شاڵەکە ئەکات بە دوو پارچە: (٧) گەز بۆ چۆغەو (٨) گەز بۆ رانك. (بڕوانە وێنەی ژمارە ـ٥ـ).



وێنەی (٦): شەپکە



وێنەی (٧): کۆڵ

هەنگاوی شەشەم: شاڵە چنراوەکە لە (کۆڵ) ئەدرێت :ـ شاڵەکە لەسـەر دوو شەپکـەدار هەڵ ئەکرێتەوە. دوو کەس بەرامبەر یەکتـری رائـەوەستن، هەر یەکـەی شەبکەدارێکی لەدەست ئەگرێو سەرێکی شاڵەکە هەڵ ئەکاتەوەو بەرەو رووی یەکتری دێن تا دوو شەپکەدارەکە لەگەڵ یەکدا جووت ئەبن. (بڕوانە وێنـەی ژمـارە ـ٦ـ)، دوایی ئەم شاڵەی سەر شەپکەدارەکان لەنـاو ئاودا ئەکـوڵێنـدرێت و ئەخـرێتە ناو کۆڵێك کە لە قەدە دارێکی ئەستووری گردە بڕ هەڵ کەندراوە. بەهۆی چەند پوازە دارێـك توونـد توونـد ئەگوشرێت. (بڕوانە وێنەی ژمارە ـ٧ـ)، دوای شەوو رۆژێك لە کۆڵەکە دەرئەهێنرێت و لە شەپکەدارەکان ئەکرێتەوەو ووشك ئەکرێتەوە. بەم شێوەیە شاڵەکە ئامادە ئەبێت بۆ دروین.

کری رانـك و چۆغـە رەنگ ناکرێت بۆیە هەر بەرەنگی مەرەزەکـە خۆی ئەنـوێنێ، وەك: مەرەزی خورمـایی، سپی، زەرتك، شینکی، گورگی، رەش.

**جگـە لە کری رانـك و چۆغـە، مووتـابـچـی لە مووتابخانەدا ئەم بەرهەمانەشی هەبووە:**

١ـ پۆپە شمین (پەشمینە، پەشمە) پێخەفێکی شاشی هاوینییە لە خووری ریسراوی باریـك و لە دەزوو بەشێـوەی دامەییو راستــە دروست ئەکـرێ. جاران هەمـوو زاوایـەك ئەبـوایـە پۆپەشمینکی خۆی هەبوایە بۆ شەوی بەزاوابوون بۆی ئەکرا بە (پەردە). پۆپەشمینی سلیمانی بە ناوبانگ بووە.

٢ـ جاجم: پێخەفێکی تەنراوی سفتی رەنگاو رەنگی خوورییە جاران ئەدرا بە خۆدا یا بەسەر نوین دا بۆ جوانی. ئەم جۆرە نەخشـانـەشی لەسەر ئەچنرا: نەخشی ئەنگوستیلەیی، نەخشی مەورەت (Zig Zag )، نەخشی کەشکـۆڵی، نەخشی مێراب (هەر چارێکەی لە رەنگێك بوو.)

٣ـ جاو: لە دەزوو دروست کراوەو بەکـارهێنـراوە بۆ هەمـوو چەشنـە بەرگێـك و پێویستییەکی ماڵی، رەنگی سپیو زەردو

وێنەی (٨) :نیگاری سەر بەماڵ





وێنەی (٩): چەرخی مووڕستن





وێنەی (١٠): چەکەو کەوان

سەوزی هەبوون.

٤ـ خاولی: بریتی بووە لە پارچە قوماشێکی چنراو لە لۆکە، لە بری خاولی ئیمرۆ بەکار ئەهێنرا.[٩]

٥ـ بەرماڵ (Praying - rug) لە خووری یا دەزوو بە نیگاری تایبەتی ئەچنرێو نوێژی لەسەر ئەکرێ.[١٠] (بروانە وێنە ـ٨ـ).

٦ـ شالی کۆپـان: کۆن لە خووری دروست ئەکـرا، ئێستا لە دەزوو دروست ئەکرێو ئەدرێ بە بەری کۆپاندا، چونکە نەرمە ئازاری پشتی وولاخ نادات.

٧ـ خرار (Sack) جۆرە تەنراوێکی شاشی زبری مووینە زوو تووتنی تیـادا ئەگیرا.[١١] ئێستا بۆ کا کێشانەوەو دەغل و دان بەکاردێت و تۆشی پێ ئەبەنە سەر گێلگە لە چەشنی (جوال) وایە.[١٢]

٨ـ رەشکـە: لە لێـك پێچان و تووندو بەندکردنی داوە مووی رێسراوی ئەستور لە شێوەی تۆری ماسی گرتن دروست ئەکرێ بۆ کاکێشان لە تارمەی جۆخێن بۆ لەوەدەوکادینان بەکار دێ.[١٣]

٩ـ تێرك (تـێر): دەفرێکی دوولایی وەك جەوال وایە بەلام ئەم دەمی لە تەنیشتەوەیە.[١٤]

١٠ـ شەلتە: دەفرێکی دوولایی گەورەی دەم بەرەللایە ئەدرێ بەسەر پشتی وولاخدا و شتی تێ ئەکرێ.[١٥]

١١ـ جۆرك: توورەکەی ئالیکی وولاخ (feed bag).

١٢ـ توور: جەوالی بچـووك، توورەکەیەکە ئەچنرێو شتی تێ ئەکـرێو سێ جـۆری هەیـە تووری شوان، تووری ئافـرەت ، تووری پیاوان.

١٣ـ شال (Shawl) لە خووری زبری ئەستوور دروست ئەکرێ بۆ پاك کردنەوەی لەشی وولاخ بەکاردێ.

١٤ـ رەشماڵ (دەوار Tent): موو ئەرێسرێو ئەچنرێو ئەکرێ بە دەوارو هەڵ ئەدرێو بەهاوین و زستان ستاری تیا ئەکرێ.[١٦]

١٥ـ گوریس (Rope) شتێکی ئەستـووری درێـژە لە چەند هەودایەکی بەن یان موو ئەهۆنرێتەوەو باری پێشەکەت ئەدرێ.[١٧]

١٦ـ بەن (Wollen - thread) ریسراوی خووری، جاران بەنـدروو تەنیـا بە بەن پینەو پەرۆی دەوارو رایەخ و خورج و....هتد ئەکرد.[١٨]

١٧ـ هەگبە (ruck - bag) جۆرە خور جولکەیەکی دوو تایی‌یە دا ئەبەسترێ بەپاشکۆدا.[١٩]

١٨ـ قۆچەقانی

١٩ـ قالی

٢٠ـ سەر کەڵلەی وولاخ

٢١ـ لفکە

٢٢ـ دەسترازە

٢٣ـ عەبا

٢٤ـ شالی هێنانەوەی بەفر

٢٥ـ راوك بۆ دروست کردنی شەربەت و دۆشاو.

٢٦ـ جۆلانەی گوریس ٢٧ـ خۆی‌دان.

جگـە لەو ئامێرانەی باسمان کردن، جۆلا دوو ئامێری تریشی بەکار ئەهێنا بۆ مەیسەر کردنی کارمکانی:

١ـ ئامـێری چەرخی موو رستن، خەرەك (spinning Genny) بروانە وێنەی ژمارە ـ٩ـ)

٢ـ چەکـەو کەوانـە (Teasing - bow) (بروانە وێنەی ژمارە ـ١٠ـ) تێبینی: دوای ئەوەی مورێس داوو بەنەکەی ئەرێسێ، جۆلا بە گوێرەی نەخش و نیگاری پێویست هەڵدەستێ بە رەنگ کردنی بەنەکە. جاران هێندێ رەنگیان بەهۆی مازوو سماق و توێکـڵی دار گوێزو چوێت و گۆگردو سرکەو هێندێ کەرەستەی



وێنەی (٩): چەرخی مووڕستن



وێنەی (١٠): چەکەو کەوان

سەوزی هەبوون.

٤ـ خاولی: بریتی بووە لە پارچە قوماشێکی چنراو لە لۆکە، لە بری خاولی ئیمڕۆ بەکار ئەهێنرا.[٩]

٥ـ بەرماڵ (Praying – rug) لە خووری یا دەزوو بە نیگاری تایبەتی ئەچنرێ‌و نوێژی لەسەر ئەکرێ.[١٠] (بروانە وێنە ـ٨ـ).

٦ـ شاڵی کۆپـان: کۆن لە خووری دروست ئەکـرا، ئێستا لە دەزوو دروست ئەکرێ‌و ئەدرێ بە بەری کۆپاندا، چونکە نەرمە ئازاری پشتی وولاخ نادات.

٧ـ خرار (Sack) جۆرە تەنراوێکی شاشی زبری مووینە زوو تووتنی تیـادا ئەگێرا.[١١] ئێستا بۆ کا کێشانەوەو دەغل و دان بەکاردێت و تۆشی پێ ئەبەنە سەر گێلگە لە چەشنی (جوال) وایە.[١٢]

٨ـ ڕەشکـە: لە لێـك پێچان و تووندو بەندکردنی داوە مووی ڕێسراوی ئەستور لە شێوەی تۆڕی ماسی گرتن دروست ئەکرێ بۆ کاکێشان لە تارمەی جۆخێن بۆ لەوەدەهو کادینان بەکار دێ.[١٣]

٩ـ تێرك (تـێر): دەفرێکی دوولایی وەك جەواڵ وایە بەڵام ئەم دەمی لە تەنیشتەوەیە.[١٤]

١٠ـ شەڵتە: دەفرێکی دوولایی گەورەی دەم بەرطلایە ئەدرێ بەسەر پشتی وولاخدا و شتی تێ ئەکرێ.[١٥]

١١ـ جۆرك: توورەگەی ئالیکی وولاخ (feed bag).

١٢ـ توور: جەواڵی بچـووك، توورەگەیەکە ئەچنرێ‌و شتی تێ ئەکـرێ‌و سێ جـۆری هەیـە تووری شوان، تووری ئافـرەت ، تووری پیاوان.

١٣ـ شاڵ (Shawl) لە خووری زبری ئەستوور دروست ئەکرێ بۆ پاك کردنەوەی لەشی وولاخ بەکاردێ.

١٤ـ ڕەشماڵ (دەوار Tent) : موو ئەڕێسرێ‌و ئەچنرێ‌و ئەکرێ بە دەوارو هەڵ ئەدرێ‌و بەهاوین و زستان ستاری تیا ئەکرێ.[١٦]

١٥ـ گوریس (Rope) شتێکی ئەستـووری درێـژە لە چەند هەودایەکی بەن یان موو ئەهۆنرێتەوەو باری پێ شەکەت ئەدرێ.[١٧]

١٦ـ بەن (Wollen – thread) ڕیسراوی خووری، جاران بەنـدروو تەنیـا بە بەن پینەو پەڕۆی دەوارو ڕایەخ و خورج و....هتد ئەکرد.[١٨]

١٧ـ هەگبە (ruck – bag) جۆرە خور جولکەیەکی دوو تایی‌یە دا ئەبەستریٚ بەپاشکۆدا.[١٩]

١٨ـ قۆچەقانی

١٩ـ قاڵی

٢٠ـ سەر کەڵلەی وولاخ

٢١ـ لفکە

٢٢ـ دەستڕازە

٢٣ـ عەبا

٢٤ـ شاڵی هێنانەوەی بەفر

٢٥ـ ڕاوك بۆ دروست کردنی شەربەت و دۆشاو.

٢٦ـ جۆلانەی گوریس ٢٧ـ خۆیدان.

جگـە لەو ئامێرانەی باسمان کردن، جۆلا دوو ئامێری تریشی بەکار ئەهێنا بۆ مەیسەر کردنی کارمکانی:

١ـ ئامـێری چەرخی موو ڕستن، خەرەك (spinning Genny) بروانە وێنەی ژمارە ـ٩ـ)

٢ـ چەکـەو کەوانـە (Teasing – bow) (بروانە وێنەی ژمارە ـ١٠ـ) تێبینی: دوای ئەوەی مورێس داوو بەنەکەی ئەڕێسێ، جۆلا بە گوێرەی نەخش و نیگاری پێویست هەڵدەستێ بە ڕەنگ کردنی بەنەکە. جاران هێندێ ڕەنگیان بەهۆی مازوو سماق و توێکـڵی دار گوێزو چوێت و گۆگردو سرکەو هێندێ کەرەستەی



وێنەی (١١): نیگاری سەر لباد (جەلەبی)

خاوی تری خۆماڵی دروست ئەکرد.[20] بەلام لەم دوایەدا لەلای دەرمان فرۆشە میللی‌یەکانا دەرمانی رەنگ کردنیان ئەکری.

★

**«کارگەچێتی Felt - making»**

کارگەچێتیش، وەکو جۆلایی، پیشەیکی میللی کۆنە لەناو کوردەواریـدا شوێنێکی دیاری هەبووە. کارگەچی (لبادچی) زۆر بەرهەمی بە کەڵکی دروست ئەکرد کە زۆر پێویست بوون بۆ بەرگری سەرماو سۆڵی زستان. جاران کارگەچی لە گوندەکان ئەگـەراو لادێیەکان خووریو بەرگن و مەرەزی خۆیانیان بۆ ئەهێنـاو ئەویش بۆی ئەکـردنـە ئەو شتـانەی کە پێویستیان پی‌بوون و حەق دەستی خۆشی لێوەرئەگرتن.

یەکێ لە بەرهەمە بەکەڵکەکانی گارکەچی (لبادە Felt) ئەویش بەم شێوەی خوارەوە دروست ئەکرێ.[21]

هەنگـاوی یەکەم : لباد لە بەرگن (لووا) دروست ئەکرێ، کە بەرخی ساڵ تەمەنی بووە پێنج شەش مانگ ـ واتا پێش ئەوەی گەرمای هاوینی لە پشت بداـ ئەبردرێت بۆ رۆخ رووبارێك و جوان خووربیـەکـەی ئەشـۆردرێت. دوای سێ رۆژان جەوبر ئەیبرێتەوەو بەرگنەکە بۆلبادچی ئەهێنرێت. سا ئەویش بەرگنی بۆرو سپیو رەش و سوور لێك جیا ئەکاتەوەو بە چەکەو کەوان جوان شی ئەکاتەوەو بە تەرازوو بای لبادێکی لێئەکێشێ. (بۆ لبادی ئاسایی یەك هۆقەو بۆهی گەورەش هۆقەو نیوێك).

هەنگاوی دووەم: بەرگنە پەرەکراوەکە لەسەر کارگە رائەخرێت. کارگەی لبادچی دوو جۆری هەیە: لە چیغ دروست ئەکرێ یان لە گونیـە. درێـژییەکەی (١٢م)و پانی‌یەکەی (٤م) ئەبێو لە جەمسـەرێکی کونیـەکـەوە بەلای پانیـەوە، دارێکی ئەختێ ئەستووری بە قەد خۆی درێژ شەتەکدراوە. لەگەڵ راخستنی بەرگـنـەکـە ئەخش و نیـگـاریشی بۆ دروست ئەکـرێت بە بەکـارهێنـانی بەرگنی هەمـەرەنـگ. ناوە ناوە ئەم داخراوەیە ئاورشێن ئەکرێت، ئەوسا لە گونیەیی کارگەکە لوول ئەدرێت و بە گوریس جوان ئەپێچـرێو بە چەنـد کەسێـك ئەکـەونـە پەستـانەوەی بۆ ماوەی (٢٥) دەقیقە، شێوەی پەستانەکەش ئەبێ هەمـوویـان بەیـەکـەوە قاچ بەرزکـەنەوەو بەیەکەوەش دایبگرنە سەر پێچراوەکە.

ئەم هەنگاوە پیٚ‌ی‌ئەوترێت (چیفی یەکەم).

هەنگاوی سێیەم: گونیە پێچراوەکە ئەکرێتەوەو جارێکی تریش بەرگنەکە رێك ئەخرێتەوە تا هیچ شوێنێکی چاڵ و ئەستوورو خوارو خێـچ نەبێ، ئەوسـاکە ئەپێچرێتەوەو بۆ ماوەی (٢٥) دەقیقەی تریش ئەپەسترێتەوە. ئەمەش پێی ئەوترێت (کووتان).

هەنگاوی چوارەم: بۆ ماوەی شەش حەوت سەعات ئەم بەرگنە پێچـراوەیـە لە شوێنێکی گەرم و شێـداردا ـوەك حەمـام ـ ئەپەسترێتەوە. زۆربەی جار شاگردەکان بەم کارە هەڵ ئەستن. ئەم هەنگـاوەش پێی ئەڵێن (بگـێر). لە کۆتـایدا لبادەکەی لە گونیەکە دەرئەهێنرێت و دائەنرێت تا ووشك ئەبێتەوە. (بروانە وێنەی ژمارە ـ١١ـ وە ـ١٢)

ئەمانەی خوارەوەش هێندێ لە بەرهەمەکانی لبادچین:

١ـ کەپەنك (فەرەنجی): جۆرە کالایەکی سەردەمی‌یە، بێ قۆڵە بەلام گویچکەدارە لە بەرگن دروست ئەکرێت لە زستاندا لەبەر ئەکرێو بۆ شەویش وەك پێخەف بەکاردێ.

٢ـ کەچە: فەرەنجی بێ‌قۆڵی ئاودامانە.

٣ـ پاڵتۆ (قاپووت): ئەمیش دوو جۆری هەیە: کڵاودارو بێ‌کڵاو. وەك فەرەنجی وایـە بەلام ئەمـەیـان قۆڵدارەو یاخـەی هەیەو ئەخشی تیا نیە. زستانان شوان لەبەری ئەکا.



نیگاری سەرجاجم



نیگاری سەر لباد (رادایی)

وێنەی (١٢):

٤ـ کەرك: لە شێوەی فەرمنجی‌یە لەسەر جل و بەرگ سەپان بۆ خۆپاراستن لە تیشکی خۆر بەکاری دێنێ.[22]

٥ـ کولەبـاڵ: فەرمنجی‌یەکی کورتی سادەی کوێچکەدارە دوو جۆری هەیە قۆڵدارو بێ قۆڵ.

٦ـ سەرکڵاو (felt – hat) ئەویش دوو جۆری هەیە، یەکێکیان لەسـەر شێـوەی کڵاوێکی قووچی رۆخ پان هاوینان شوان و سەپان لەسەری ئەنێن، جۆرەکەی تریتی لە شێوەی (کۆچکە) لەگەڵ کەپ‌ەك یان پاڵتۆ رۆژانی بەفروباران شوان لەسەری ئەنێ.

٧ـ هیـزەدان: لە شێوەی دەفر دروست ئەکرێ، هیزە روونی ئەخرێتە ناوو لە ئەشکەوتاندا هەڵی‌ئەگرن تا روونەکە تێك نەچێ.

٨ـ لبادی کۆپەران: ئەخرێتە سەر ملی گاجووت لەکاتی جووت کردنا

٩ـ تەرلك: بۆ ژێر زین.

١٠ـ سەرکوشینی ئوتومبیل

١١ـ سەرزین

١٢ـ گۆرەوی لباد

١٣ـ کڵاوی لباس.

**«تەون گەری Rug – making»**

تەون گەری پیشـەیـەکی کۆنـە. فیرعـەونـەکـان و عیراقی‌یـەکانی کۆن زۆر بایەخیان بەم پیشەیە داوە. هەر بۆ نموونە گۆرستانی (کورش) ـپاشای فارس ـ بە رایەخی بابیلی داخرابوو. ئیمرۆش لە مۆزەخانەی (لۆڤەر) هێندێ تاتەبەردی سەردەمی ئاشـووریـەکـان دانراوە کە وێنەی رایەخی کۆنی لەسەر هەڵکەندراوە.[23]

هێنـدێ لە مێژوونووسان وای بۆ ئەچن کە ئەم شوێنەی ئەم پیشـەیـەی لێداکـەوتووە ئەکەوێتە نێوان وڵاتی چین (لە رۆژ هەڵات داو) وڵاتـانـی ئاسیـای ناوەراست (لە رۆژ ئاوادا). هەروەها ئەڵێن دوور نیە خێڵە کۆچەریەکان یەکەم کەس بووبن تەون گەریان زانیبێ.

لە سەرەتـادا ، بۆ رایـەخ پێستـەو فەرووی مەرومـاڵاتیـان بەکـارهێنـاوە، بەڵام کە سەیـریـان کردووە بۆ ئەمـە ئەبێ قوربانی‌یەکی زۆر بدەن، لە کاتێکدا سەرمایەی ژیانی ئەوان هەر مەروماڵاتەکە بووە، بیریان کردۆتەوە کە ژێرخەرەکانیان لە شێوەیەکی تردا دروست بکەن. لە سەرەتادا رایەخەکانیان کە لە خووری‌و مووو مەرەز دروست ئەکرد، بریتی بوون لەچەند رایەڵێك، تیسکە خووری‌و مووی درێژی لێکۆت و بەند کرابوو، لەگەڵ رۆژگاردا ئەم بەرهەمەی لێ هاتۆتەوە کە ئیمرۆ لەبەر چاومانە.[24]

لەناو کوردەواریشدا لە کۆنەوە تەون گەری هەبووە. زۆر لە ئافرەت و پیاوانی کورد دەست رەنگین بوون لەم پیشە میللی‌یەدا.[25] کارگەی تەونیش بەم جۆرەیە:[26]

دوو کۆڵەکە دار (٢٨٠سم) ئەبن بە شێوەیەکی تەریب و ستـوونی لە زەوی چەقێنـراون، پێیـان ئەڵێن (سمتـەك) لە سەرەوە دارێکی درێژ هەیە پێی ئەڵێن (سەرتان) درێژی‌یەکەی (٢م) ئەبێ. لە ژێرەوەش، لە نزیك زەویەوە دارێکی تر رایەڵ کراوە پێی ئەڵێن (بن تان). رایەڵی تەونەکە لە نێوان سەرتان و بن تانەکە بەستراوە، بە دەرزی‌یەکی درێژەو بەنی مەکۆ ئەبرێت بەناو بەینی تان و پۆکەداو هێندی هێندی بە مشتەیەکی تایبەتی

وێنەی (١٣): تەون



ئەکوترێت. (بڕوانە وێنەی ژمارە -١٣-).
تەون گەر ئەم کەرستانە بەکاردەهێنێ:

١- قوولاب کە هێندێ جار لە شاخی بزنە کێوی دروست ئەکرێ

٢- کەلکبیت (Teasel – bur) شتێکی دەسکدارە شانەی ئاسنی تێبراوە وەك پەنجەی دەست، تەونی پێ ئەکوترێ بۆ سفت بوون.

٣- بەوش: دارێکی دانەداری پانە ئەیخەنە ناوەندی تان و پۆی جاجمەوە بۆ ئەوەی کە پێی بکوتن و سفتی بکەن

٤- قەلەمبر بۆ داو برین.

ئەمانەش بەرهەمی تەون کەرن:

١- بەرە: کە دەها جۆری هەیە لەرەنگ و شێوەو قەبارەو نەخش و نیگارەوە.

٢- مەوج: لە جاجم ئەستوورترە ئەکرێ بە پشتی لێفە بۆ گەرمی

٣- جاجم.

**رەنگ دانەوەی چنین و رستن لە ناو فۆلکلۆری کوردیدا:**

ئەدەبی فۆلکلۆر، ئاوێنەیەکی بێگەردی مێژووی میللەتە. تاقیکردنەوەو ئەزموونی ساڵەها ساڵی رەنجدەران و ئارەقە رشتن و زوڵم و زۆرداریو سەرکەوتن و بن کەوتن و خۆشیو ناخۆشی نەتەوەکەی لەناو پەندو هونراوەو حەقایەت و ئەفسانەو مەتەڵ ...هتد کۆکردۆتەوەو وەك فەلسەفەی ژیان پێشکەشی رۆڵەکانی ئەکات. لە ناو ئەدەبی سەرزارەکی کوردیشدا هەمان رەنگدانەوە هەیە.

ئەمانەش مشتێ لەو پەندو ئیدیۆم و مەتەڵەن کە لە پیشەی چنین و رستندا هەڵێنجراون:-

١- تۆم کرد بە جۆلا مەکۆم بدزیت.

٢- ریسەکەمان بووە بەخووری.

٣- ریسی باریك و نانی تەنك بە پیتن.

٤- ریسی راستی باریك ئەبێ بەڵام ناپچڕێ.

٥- نەریسراوە، نەپێچراوە، تەقە تەقی جۆلایە.

٦- نەریسراوە نەچنراوە، گلە گلی دێ لە دواوە.

٧- باریکیان ئەریسی.

٨- جۆلا بەسەر دری خۆیەوە نارازی بێ.

٩- هەوران بروسکە بروسکە/ خووری یەمە هێشا تیسکە.

١٠- جۆلا کراسی نەبوو، تۆپی جاوی لەخەو دێ.

١١- هەموو خوڕەیەك ئاو نیە، هەموو چنراوێکت جاو نیە.

١٢- بەن گوتیەتی: هەڵم بگرە بە کەڵکت دێم، ئەگەر هەڵم نەگریت لە من کەمتر بی. ئەگەر بە کەڵکت نەێم لە تۆ کەمتر بم.

١٣- تەون کێ کردی؟ ئەوەی بڕی.

١٤- سواڵکەر پیخوەسن، جومکەر بێکراسن.

١٥- پیرەمێرد ئەڵێ: کەژنان دەستیان گەیشتە کوتەك/ پیاوان ناچارن بچنە بن خەرەك.

١٦- تەونی بێتان و پۆ هەڵ مەخە

١٧- تەونی بی تان و پۆ بە دارەوەیە.

١٨- دەڵێی مەکۆی جۆلایە.

١٩- جاو دەنێتەوە

٢٠- خەرەك دەریستی

٢١- بەنێ کەسێکە بە من بانادرێت

٢٢- بەنی شلەوە بووە

٢٣- نان گیرا ئاو، ئاو گیرا جاو

٢٤- ئاسن و بەن و گلۆڵە، تێم یەخست رەشی دولا، لێم خوری کردیە قولە «کارگەی جۆلایە».

٢٥- حوشتر حایە لە حەوایە، دایم دەشتە کون لە پشتە. «رەشماڵە».

٢٦- ئەمەش مەنەلوجێکی فۆلکلۆری یە لەنێوان کچ و دایکێك دا:

کچ: دایە مەمدە بە جۆلا
جۆلا تەقە تەقیەتی
دوو پوول و نیو حەقیەتی
ئەویش کرێی ژن یەتی.
دایك: کچم، عیلاجم نییە
قەرەدی جۆلام خواردی یە
جۆلا دەکا رایەڵی
ژنێ بەجێ نایەڵی.

٢٧- جاران یەکێ کە قێی لێنەهات پۆیەشمینکی رەشیان بەسەردا ئەدا.

**فەرهەنگۆکە**

کل نانەوە: دەفری لە قور دروست کراوی تیا سوور ئەکرێتەوە

مێزازگەری: بۆ دروست کردنی بەردی ئاش و دەستارو دۆڵ و باگردێن و دەسکە دۆڵە لەبەرد.

شیرگەری: خەنجەرو چەقۆو کێرد دروست کردنە.

جەوبر: کەسێکە کە ئاژەڵ ئەبڕێتەوە
پارکە: تەشییلەیەکە کلاٌفەی لەسەر هەڵئەکرێ.
بەرگن یالوا: خووری بەرخە کورتەو هێشتا درێژ نەبووە
قرخ: خووری مەرە، دوای برینەوەی کورتە.
مییانە: تووکی گاوو مانگاو وولاٌخی بەرزە.
موتابخانە: شوێنێکە موتابچی کاری تیا بکا.
تیسک: چەند دانە خووری یا موویەکی درێژە.
جەواڵ: دەفرێکە لە بەن و موو دروست ئەکرێ بۆ کێشەی دانەوێلە.
رایەڵ: چەند هەودایەکی راستە کە پۆی شتی لەسەر ئەتەنرێ.
کڕ: رایەڵی جۆلاٌ. شاڵی رانك و چوغە.
جومکەر= جۆلاٌ (کوردی ئازەربایجان)
شەپکە= پارچە تەختەدار.
پواز: جۆرە سنگێکە لەدار یان ئاسن بەدارا دائەکوترێ بۆ قەڵەشتی
هییزە: پێستی خۆشکراوی بەساغی دەرهاتووی هێندە گیاندارەکە رۆن و دۆشاوی تێئەکرێ.
کۆپانە: خووری‌یەکە کە بهێنرێتەوە بەسەر پشتی مەڕو بەرخەوە.
تان: ئەو دەزوەی کە بەباری درێژیدا رایەڵی ئەکرێ لەکاتی چنین دا.
هەودا: داوی دەزوو یان بەن.
دەسترازە: پەتێك یان بەنێکی هۆنراوەیە منالٌی لە بێشکەدا پێ دائەپێچرێ.
شاڵ: جۆرە تەنراوێکی خووری‌یە گەلێ جۆری هەیە.
پائاوشا: تەختەی ژێر پێی جۆلاٌ.


سەرچاوەو پەراوێزەکان :

١ـ قەناتی کوردۆ. کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی. چاپخانەی کوڕ/ بەغدا/ ١٩٧٦. ل .(٤).

٢ـ نەقابەی مامۆستایان لقی هەولێر. سەرنجێك لە دەروازەی فۆلکلۆری کوردەوە. چاپخانەی (ارشاد) بغدا. ل. (١٠٣)

٣ـ د. محمد عبدالعزیز مرزوق. الفنون الزخرفیة الاسلامیة. مطابع الهیئة المصریة العامة للکتاب / ١٩٧٤ ص (٩٧).

٤ـ هەمان سەرچاوە. ل . (٣٣).

٥ـ محمدی خاڵ . فەرهەنگی خاڵ . جزمی یەکەم. چاپخانەی کامران ـ سلیمانی / ١٩٦٠ ل . (٣٥١)

٦ـ هەمان سەرچاوە. جزمی دووەم /ل . (٢٢).

٧ـ مام ابراهیم میخا یوسف کە لە ساڵی (١٩٢١) لە کۆیە لەدایك بووەو لە منداڵیەوە مۆوڕێس بووەو هەموو تەمەنی هەر جۆلاٌ بووە ئەم زانیاری‌یە پێدام .ئیستا خەریکی سەوزە فرۆشتنە.

٨ـ فەرهەنگی خاڵ . جزمی سێیەم .ل (٣٠٦).

٩ـ هەمان سەرچاوەی (٢) ل .(١٠٤).

١٠ـ هەمان سەرچاوە ل (١٠٥) .

١١ـ فەرهەنگی خاڵ . جزمی دووەم ل . (٨٦).

١٢ـ داود محمد شرۆڵ. گۆڵێك لە رەوسەی فۆلکلۆری کوردی. چاپخانەی (حوادث) بغدا /١٩٨٧ ل .(٤٨)

١٣ـ هەمان سەرچاوە . ل (١٢٦).

١٤ـ فەرهەنگی خاڵ جزئی یەکەم ل . (٣٢٩)

١٥ـ هەمان سەرچاوە . جزئی دووەم . ل .(٣٤٢)

١٦ـ هەمان سەرچاوە. ل (١٩٦). بڕوانە ل (٥٤) لە ژیانی کوردەواری نووسینی (تۆمابۆ) چاپخانەی زانکۆ / ١٩٨٠ سلیمانی

١٧ـ فەرهەنگی خاڵ. جزمێ سێیەم ل .(١٨٤).

١٨ـ هەمان سەرچاوە. جزئی یەکەم ل. (١٧٥).

١٩ـ هەمان سەرچاوە. جزمی سێیەم ل .(٤١٤)

٢٠ـ کمال جلال غریب. بیست پیشەسازی کیمیاگەری چاپخانەی کامران سلیمانی ١٩٦٩ ل .(١٢٥ـ ١٢٧ـ ١٢٨).

٢١ـ ئەم زانیاریەم لەوەستا (صمدی رشیدی حاجی علی) وستا (معروف) کە هەردووکیان لبادچین لە کۆیە وەرگرتووە.

٢٢ـ مولود بێخاڵی. بەرهەمی کوردەواری/ چاپخانەی روشنبیری‌و لاوان ـ هەولێر /١٩٨٦ ل. (١٠٤)

٢٣ـ د. محمد عبدالعزیز مرزوق. الفنون الزخرفیة الاسلامیة ص .(١١٩)

٢٤ـ هەمان سەرچاوە ل .(١٢٠ـ ١٢٢ـ ١٢٣).

٢٥ـ تومابۆ. ژیانی کوردەواری. وەرگێرانی حمە سعید حمە کریم چاپخانەی زانکۆ سلیمانی/ ١٩٨٠ ل . (٧٤). بۆ زانیاری زۆرتر بڕوانە ل . (٧٤ـ ٧٦)

٢٦ـ ئەم زانیاریەم لە پوورە (گورچنی مام احمد رسول) لە کۆیە وەرگرتووە تەمەنی (٧٥) ساڵ ئەبێ.

٢٧ـ هەر سێ جزمی (١ـ ٢ـ ٣)ی فەرهەنگی خاڵ.

٢٨ـ جلال مەحمود عەلی. ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا. چاپخانەی (حسام) بغداد /١٩٨٢ ل. (٢٧ـ ٨٤ـ ٨٥ـ ١٥٠ـ ١٧٣ـ ٢٢٤ـ ٢٨٨).

٢٩ـ کمال جلال غریب. القاموس العلمي الجزء الاول، الجزء الثاني، الجزء الثالث.

٣٠ـ کەریم شارەزا. پەندی پێشینان لە شیعری کوردیدا. چانچانەی کۆڕ. بەغدا /١٩٧٦.

٣١ـ م . س . دیماند. ترجمة احمد محمد عیسیٰ. الفنون الاسلامیة. دار المعارف بمصر /١٩٤٤

٣٢ـ عەلی معروف شارەزووری. پەندی پێشینانی کورد.
بەرگی یەکەم و دووەم. چاپخانەی (حوادث) / ١٩٨١ /١٩٨٧.

٣٣ـ شیخ محەمەدی خاڵ. پەندی پێشینان . چ ٢ .بەغدا ١٩٧١.

٣٤ـ هێندێ زانیاریم لە پلە (رابیعەی مام سابیری ـ٨٥ ساڵە) لەکۆیە وەرگرتووە.

٣٥ـ وێنەکان بە قەڵەمی نووسەر کێشراون.

٣٦ـ گۆڤاری کاروانی ژمارە (٥١)، (٦١)

٣٧ـ سعدالله اسماعیل شیخانی. گولبژێرێك لە فولکلۆری کوردیدا. چاپخانەی (ارشاد) بەغدا/ ١٩٨٥ ل . (٦٦ـ ٦٩ـ ٦٧)



# خانوو دروستكردن له كوردەواریدا

شێرزاد قادر هەینی

كە ئادەمیــزاد گوزەرانی خۆش دەبێت و ئاســوودەیی دەدۆزێتەوە بیر لە چاككردنی خانووبەرە دەكات بۆ سەتربوون و ژیـان و پاراستنی خێـزان لە تەوژمی سروشت و بێگـانـەو پەروەردەكـردنی منـالەكـانیو چاوەدێـرییان و گونجانیان بۆ رەوشتی پاك و مرۆیانە. جێگای نیشتەجێی جا خانووی یەك ژوورو بچوك و بێ شووره یان خانووی دوو نهۆم و چەندین هۆدەو دیـوەخـان و خانـووی بابەتی نوێ هۆڵ و مێونخانەو بالكۆن و گەرماوی رۆژهەلاتیو رۆژئاواییو قادرمەی هەڵواسراو یان كەپری سادەو تیرەك و رەشمال .. هەرچی بێت بۆ ژیان و حەوانــەوەیــە بەپێی زەوق و دەست رۆیشتنی خەڵكـەكـەو پەیدابوونی مەوادی دروستكردن. خانووەكە قیت دەكرێتەوەو دەبێتە سێبەر بۆ ژیان یان دەبێتە مایەی خۆهەلكێشان و بە زل زانــین و دەولەمــەنـدی. وا لێرەدا بە گشتــیو سەرەدێــر دەنــووســیــنــەوە كە مرۆڤــی كوردەواری چۆن خانــووی دروستكردووەو . نەمانتوانی هەر ناوچەیەك بەجیا بنووسینەوە، یان زۆر وورد، شارو گوند لێك جیاكەینەوە، چونكە هەر یەكێ لەم بابەتانە تایبەتی خۆی هەیە. پێویستیشی بە راوەستان و تێ رامان و ووردبوونەوە هەیە. وەك كۆكردنەوەی هەندێ زانیاری كەلتووریو ژیـانی ماوەیـەك لەم و بەری ئەو خەڵكـە لەگەڵ زاراوەی دروستكـردنیـان بنووسینەوە، بەلام ئەوەش دەزانین دەبێ بابەتەكە جیا جیا بێت ولق و بەشی تەنیای هەبێت وا لێرەدا بۆ بوارێكی تری جێدەهێلین.

مرۆڤــی كوردەواری چۆن خانــووی دروست دەكـردو ئێستاش چۆن دروستی دەكات: لە شارەكاندا زەوی پارچەكراو بە پێی «یاسای رێگاو بان» «نظام الطرق و الابنية» ئامادەیەو زۆریـان لاكێش و چوار گۆشــەیەو زەوییەكەی تەختەو ئاوو كارەبای لێنزیكە وەك ئێستاو هەموو خوێنەرێك دەزانێ رێگای مۆڵەتدان وەردەگرێت و مەوادی دروست كردن دێتە گۆرەپانی ئیش و نەخشــەی تایبــەتیش پەیرەو دەكرێت و نەخشەكەش

لەگەڵ بارو دۆخی ئابووری‌و زرووف خاوەنەکەی هاتۆتە دروست کردن.

جا ئەو نەخشانە چاولێکەری بێت یان ژیانی رۆژانەی خۆی‌و خێزانەکەی‌و ویستی شارو شارستانیەت ئەوەی ویستبێت، لێرەدا دروست کردن لە شار جێ دەهێڵین چونکە باسێکی تایبەتی دەوێت.
لە گوندەکان زەوی پارچەکراو نی‌یەو نەخشەی دروستکردنیش نی‌یە، بەلام خانووی نازدارو چاك و پتەویش هەیەو هەبووە.
زەوی قەد شاخ یان کۆنە گوند دابرینی پارچەیەکی‌تر لە دامێنی گوند دەست نیشان دەکرێت، پشتی لە کەندەلانە، نزیکی ئاوە، رەشەباو زریان و سەرما کەمتر دەیگرێتەوە سەرە رێگایە، دوورە باخچەیە نزیکە مزگەفتە، نزیکە ماڵە خزم و بابانە، خانوویکی شاخاوی دەکەینە نموونەیەکی زۆر باو وا لەسەری دەنووسین
، لە سەرەوە ووتمان زەوی گوندەکان پارچەنەکراوەو مۆڵەتی دروستکردنی ناوێ، بەلام ئەو نموونەیە لە زۆر لە شارەکانی کوردستانی ناو شاخ و دامێنی چیایەکان ئەم نموونەیە دووپات دەبێتەوەو نەخشەی باوەرپێکراو هەیە وەك ئاکرێ‌و دوکان و رەواندوزو سیدەکان شوێنی‌تر.
ئەو بەشەی پشتی کەندەلان بێت سێ دیواری بۆ دروست دەکەن، گەر راست بێت چوار دیواری خانووەکە بنیات دەنرێ.
بەرد لێرە مادەی سەرەکیە. بەردی بەرووو بەردی بێ‌روو هەیە، واتە بەردی تاشراوو جوان و لووس و بەردی شاخی بێ تاشین، بەردی «گەزەگولە» بەردێکی گرنی گرنی‌یە تەنیشتەکانی لووس نیشان دەدات قور چاك دەگرێت لە ناوچەی رۆستێ بەکار دێت.
بەردی نەرم بۆ خانوو چاکە، چونکە شکاندنی ئاسانترە، بەردە کەشکۆل رەنگی مۆرە بۆ خانوو چاکە، بەردە گەنم سپی‌یە وەك کاغەزکارە بەرد لەبن ئەرز دەردەهێنرێت وەك بەردی حەلانە.
جا هەر ناوچەیەك بۆ بەردی دروستکردن ناوێکی لێ دەنێن، بە کوتکە ماوەل و کوتکە بەردو نوێل و پێك بەرد خۆش دەکرێت.
زۆر جار شوێنی بەردەکە لە خانووەکە نزیکە، ئامادە دەکرێت، دێتە گۆرەپان وەستاو خاوەن ماڵ بیروکەی دروستکردنی دەچەسپێنن، دیوار ئەستوورە بە قور بێت رۆژێ هەر سێ ریز دەکرێت بە قسل بێت یان بە گێچ و چیمەنتۆ زیاتر دەتوانرێ



راوەستێت، بەردی خۆشکراو واتە بەردی بەروو دووڕریزی ناوەندی بۆشە دیوی دەرەوە زیاتر خەریکی دەبن و جوانترە واتە بەردەکانی تاشراون ، ناوەندەکەی مشت دەکرێت لە وردە بەردو قوڕ، شوێنی دەرگا جێ‌دەهێڵن.
دیوار بەرز دەکرێتەوە تا دەگاتە ئاستی ئەوەی دار دیمەك دابنێن «دار دیمەك» داری چاك و تاشراوو توندو لووس و باریکە بە درێژی دیوار لەسەری دادەنرێت تا پتەوتربێت، داری بەنرخ و چاك بە درێژی دادەنێن دوو ریز یان یەك ریز لە تەنیشت یەك بەقەد پانایی دیوارەکە، لە هەندێ شوێندا ئەو دارانە بەپانی لەسەر دیوارەکە لە شێوەی کورتە دار ریز دەکەن. سوودی «دار دیمەك» ئەوەیە جێگای «رباط»ی کۆنکریتی ئێستایە لە دروستکردنی نوێدا.

رباط هێزی زۆرو بەرگری چاکە بۆیە دار دیمەك لە جیاتی یەك جار لەناو دیواردا دووجار سێ جار، هەر سێ چوار ریز ریزێك دار دیمەك دادەنرێت، بەو هەموو ریزە دار دیمەکانە دیوارەکە پتەو دەبێت و رووناچێت ئاستی راوەستانی رادەگرێت، گەر دار دیمەك داری گوێزو دارتوو بێت چاکترە. لە هەورمان لە دیواری ووشکەکەلەك دا هەیە، لە خانووە کۆنەکانی قەلاتی هەولێر کاریتەی درێژی لەگەڵ ریزی کەرپووچ دانراوەو بنکەی ئەستوونەکانی ناو ژێرزەمینەکان داری لووس و کورت و چاککراو دانراوە بۆیەش دار لەگەڵ دیوار بووە چونکە زەویەکەی نەرمەو مەترسی تەقان و رووچوونی هەبووە.

ناوی دار دیمەك لەوەوە هاتووە چونکە زیاتر داری دێمی شاخیان بریوە بۆ ئەم مەبەستە دڵیان نەهاتووە داری بە بەرو ئاوی ببرن.
بەکارهێنانی دار دیمەك لەناو دیواردا تەنیا لە کوردستاندا هەبووە گەر لە شوێنی شاخاوی. تری جیهانیش هەبێت لە ناوچەکەدا تایبەتیە بە بیناسازی کوردستان بۆ پتەوی بیناو تەمەن درێژی بووەو بیری بەکارهێنانی وەستایەتی و پتەوی بیناسازیەو شانازییە لەم بوارەدا.

دیواری بە بەرد تەواو بوو، بنکەی پانەو چەند بەرزتر دەبێت بەکەمی تەسك دەبێتەوە، هەر سێ‌چوار ریزێك دار دیمەکێك دادەنرێت، بە هێواشی دیوارەکە دەروات تا توندتر بێت، سەرە دەرگا گەر هەر ئاسایی بێت ئەوە بەدار دادەنرێت ، یان بە دوو قەوسی کەوانەیی بە گێچ یان مەرمەڕ لە سەر دەرگاو سەرە پەنجەرە دادەنرێت.
کولانکەو کونە هەزار مێردی بۆ جێ‌دەهێڵنەوە لەدوا ریزی دیوارا بە چوار دەورەی دیوارەکە داری چاك دادەنێن تا کۆتاییەکەی ببەسترێتەوە ئەو ریزە دارانەش لەکەم خانوو هەیە، بەڵام بۆ پتەوی زۆر چاکە. ئینجا دارەڕێ دەکرێت، کاریتە دەخرێتە سەر دیوار هەندێ خانوو یان مزگەفتی گەورە زیاتر لە پێنج کاریتەی دەوێت.

لە زۆر شوێندا بە داری دارەڕێ گەورە بە «کاریتە» دەڵێن «نێرگە»، زۆر جار ژوورەکە درێژە کاریتە ناگاتە ئەو سەری دیواری بەرامبەری، سەری دووەمی کارتیە لە سەر گۆی دار ئەستووندە «شادار» دادەنێن کە لە شێوەی ژمارە هەفتە.
قەدی یەکەم خانوو تەواو بوو واتە ئەو خانووە یەك قەدە، گەر کاریتەی دووەم لە ئەستووندەوە بۆ دیواری بەرامبەری دانرا قەدی دووەمی خانوو دادەمەزرێت، واتە ئەم خانووە دوو قەدە، کە درێژتر دەبێت کاریتەو ئەستووندەی تری دەهاوێنێ واتە قەدی ژوورەکە لە دوو قەد زیاترە ئەم ئەستووندەیە یان «پاڵەوان»، لە ناوەندی ژوورەو کاریتە رادەگرێت و بنکەکەی ئەستوورەو سەرەوەی دوو گۆی باریکترە لە قەدی سەری کاریتەی دێتە سەری.
دار کاریتە لە ئەسپینداری هەفت ساڵەی خزمەت چاك و خاك باش دەبێت، تا (٣٢) پێ درێژ دەبێت ئەم ئەسپیندارە دوو کاریتەو یەك شەقرەی باریکی لە سەرە باریك و تیژەکەی دەردەچێت لە هەندێ ناوچەی نزیك هەولێر ووتویانە ئەو ئەسپیندارە دوو دار هەولێرو یەك شەقرەی تێ دەبێت، بۆیەش پێیان ووتوە دار هەولێر، واتە لە هەولێر بۆ دارەڕێ خانوو ئەو درێژیە بەکاردێت. «١٦» پێ دەبێت، بە شەقرەش ووتراوە



«سەرکڵ» لە هەندێ ناوچەدا باخچەکانیان بە تایبەتی داری کاریتەی لێ دەچێنرێ بۆ ئەم مەبەستەش دەبڕێتەوە. دار ئەسپیندارو چنار دەکرێتە کاریتە، بۆ ئەستووندە داربەرووو دارەبەن و دارمازوو و دارگوێز چاکە، واتە زۆرتر داری دێمی باشترە.

دار پەلك دارێکی بەرزە لە ئەسپیندار دەچێت سپییە بۆ دارەڕێ دەبێت. دارەڕێ ئەو کاریتانە بەرێز لە تەنیشت یەك دادەنرێت نێوانیان بەقەد یەکە ئاستی بەرزیو نزمیان لەسەر یەك ئاستە، هەندێ جار بۆ پتەویو چاکی بۆ جاری دووەم دارەڕێ دەکرێتەوە گەر یەك دار دابنرێت پێی دەڵێن «ئاشی» لەلای دووەمی دیوارەکان «رادێرە» دەکرێت چەند رادێرە دێتە سەر ئاشی هەندێ ژوور هەیە لە یەك ئاشی زیاتری تیایە لەسەر رادێرەی «نێرە» دادەنرێت بە پێچەوانەی یەك.

شەقرە «قیسپ» باریکەو ژمارەی بەکارهێنانی لە دارە ڕێدا زۆرە زۆر لەیەك نزیك دەبێت پاش شەقرە حەسیر رادەیەخن، کە حەسیر کەم و بەردەست نەبێت و پێش پەیدابوونی حەسیر چرو دەبڕێتەوە لە سەر شەقرەکان پان دەکرێتەوە، جا هەر ناوچەیەك بەپێی پەیدابوون و زۆری گەڵای دارو جۆری دەخرێتە سەر شەقرەکان وەك «قەمیش»و «پوش»و «شاوێر»و هیتر دادەنرێت «چرپ» دادەنرێت پەلکی دار کونجی بۆ گێرانەوەی خۆڵ و تۆزی خۆڵەبان باشە، مەبەستی سەرەکی چینێکی جیاکەرەوەیە بۆ دارەڕێو قوڕی سەری، پتەو دەبێت دارەکان پیس نابێت، دڵۆپە ناکات، سەربانەکە توندو تۆڵ دەبێت.

خۆڵەبان و قوڕەپەست دەکرێ، دار سواندە «پاسار» چەند ڕیزە دارە لەسەر یەك لە پێشەوەی هۆدەکان زیاد دەبێتەوە، لە هەندێ ناوچەدا بۆ دیواریش دەکرێ تا باران و بەفرکەم بە دیوار بکەوێت.

لە ناوچە دەشتاییەکان حەوشە فراوانەو دیواری دەرەوە نەوییە، ئەو حەوشە گەورەیە چاك بەکاردێت، ژووری نوستن و مێوانخانەو کادین و هۆری وەڵسات و قەسەر داکردن و عەمباری گەنم و خەشیوو «ژووری بچوکی زەخیرە»و کەندەڵان

«قوتان» بۆ کوندەو گۆزەی ئاو دەکرێ دوو دیوارە دوو مەتر بەرز دەبێت، لە ناوەندو ژێرەوەی شوێنی کوندەو گۆزەی ئاوە، سەری بە کەرتە شەقرەو قەسەرو کفر دەگیرێت، لە هاویناندا بۆ ساردو فێنککردنەوەی ئاوی خواردنەوەیە، هەندێ پێویستیو خواردنیش لە بنی ڕێز دەکرێت تا بۆگەن و لە کەڵك نەکەوێت. وەلەبەر فێنکی سەگ لە بنی وەردەکەوێت، عەمباری گەنم و جۆ بناغەکەی بە بەردە، ژوورێك یان دوو ژووری بچوکن، دوو کونی لە بەرزایی سینگی زەلام لە شێوەی چوار گۆشەی تیایە بۆ تێکردنیو دەرهێنانی گەنم و جۆ، جوان بە لووسی ژوورەکان لە ناوەوەو دەرەوە مارنج دەکرێ، ئەرزەکەی لەسەر خۆڵی حەوشەکە نییە بەڵکو ژێری بەردە تا گیانەوەری زیان بەخشی کەم بۆ بخشێت و ژوورەکان کون بکەن . سەکۆی نووستن و دانیشتن جێگای هەیە. لە حەوشەی گەورە بیری ئاو هەیە بە گوریس رادەکێشرێت تا ئەو سەری حەوشە گوریسی درێژ ئاوەکە ڕادەکێشێت. جۆنی ساوەر لە ناوەندی حەوشە هەیە.

کە کوڕ لەماڵەوە جیا دەبێتەوە هەر لەو حەوشە گەورەدا ژوورێك دروست دەکات و تیفێکی «ستارە» ئەویش قیت دەکاتەوە، دانانی خشتەکانی وایە هەوای فێنکی سەربانی زۆر بچێتە ناوی. قادرمە «پەیژە» لە ژوورەوە یان لە هەیوانەوە بۆ سەربان دەچێت، پایەی تەسك و بچووك و گەر لە ژوورەوە بێت بەیتونەیەکی بچوکی هەیەو کونی سەیرکردنی بۆ دەرەوە هەیە، لەم حەوشەیەدا دارتووێك یان هەر دارێکیتر دەچێنرێ، باخچەیەکی بە شوورەیەکی درکاوی دەوری دەدا، سەوزەو گوڵەبەرۆژەی لێ دەچێنرێت بەشی خواردنی خێزان بکات، کۆریتی پەلەوەری تیایە.

گەر نەخشەی ئەم جۆرە خانووانەی گەرمیان وورد ببینەوە ئەنجامی وا دەردەکەوێ حەوشەیەك هەزار مترە چوارگۆشەیە یان هێلکەییە یان زۆر نارێکە، چەند ژووری چوار گۆشەو لاکێش و خرپشی تیایە رووبەریان کەم هەندی یەك دەبێت، ژوورەکان بەیەك وەنووساون، جزیریو لاییانیو بێ لاییانیو لانکانیو نەوی بەرز بە کاریتەی گەورەو پردو کاریتە باریك مارنج کراوو بێ مارنج. هەر ژوورێك بۆ مەبەستی تایبەتیو وەزیفەی خۆی لەگەڵ حەوشەیەکی فراوان و زەوی ڕاست، ژن و پیاو وەرزی پێش باران هەر خەریکی خشت برین و مارنج کردن و نوێکردنەوەن، تا بەرگری زستان بگرێت، ئافرەتی لادێی هەر خەریکە خشت دەبڕێت و قورکاری فەرمانێکی سەرەکیەتی لەتەك پیاواندا.

لەو ناوچەیەدا زۆر بە دەگمەن گەر دووخانوو نەخشەیان بەیەك بچێت، نەخشەی هەندێ خانوو بریتیە لە دەرگایەك دەتباتە ژوورێکی گەورەو چەند دەرگای لێ دەبێتەوەو هەر دەرگایەك بۆ ژوورێك «هۆدە» دەچێت بۆ ژووری نوستن و خواردن و مێوان تەندوورو ئاژەڵ و زەخیرە هەموویان لەناوچەیەکن، پەنجەرەی کەمە، ئاژەل بەتایبەتی وولاخ و گاو گۆلك لەگەڵ مرۆڤدا لەناو یەك خانووی داخراون، نەخشەی تری خانوو هەیە دوو ژوورو هەیوان لە پێشەوە دار کۆترە لە ناوەندی هەیوان داری هەیوان و شەقرەکان ڕادەگرێت یان مەدخەلێك دوو دەرگا دەچێتە ژوورو پەنجەرەی لە پشتەوەیە. لەودەی کا لە دووری ماڵە.

کونە مێش و سەکۆی شوان و ڕەنجبەرو سەپان جێگایان هەیە.

لە ناوچە شاخاوییەکان چ لەگوند یان لە شاردا دەتوانم بڵێم زۆر نەخشەی خانوو دروستکردن و رووبەری ژوورەکان و شێوەیان پێکدەچن. بەردو قوڕو قسڵ و دارو گەڵاو خۆڵی سپیو گێچ و مەوادی دروستکردن، دیوار دەبێ زۆر ڕاست بێت، چونکە بەرد گرانە ڕاوەستانی زۆر راست و یەك ئاست نەبێت بەرگری تەوژمی وەرزی تووش زستان ناکات.

نهۆمی یەکەم نەوییە دەرگایەکی گەورەی توندی پێوەیە، گەر لە زۆر ئاکاری لە ژێر زەمین نەچێت هەندێ شتی تایبەتی هەیە وەك پەنجەرەو دەرگاو بەکارهێنانی کەم و فێنکی هەندێکیان قادرمەیەکی ڕێك لە هۆدەکانی سەرەوە بۆی شۆڕ دەبێتەوە.

بەڵام نهۆمی یەکەم سوودو دروستکردنی زیاتر بۆ راستکردنەوەی ئاستی زەوییەکە بۆ دروستکردنی نهۆمی دووەم یان خانووەکە لە بەر لێژی زەوییەکەی. وولاخ و گاو

گۆلك و وەڵساتی تری بە دەرگایەكەی وەدەچێت.

وێنجەو چرووكاو پووش و گیای پێ هەڵدەگیرێت نهۆمی دووەم لەسەری دروستكراوە، رووبەری بەقەد ژێرەوەیە زۆرجار بچووكترە سەربانەكەی نهۆمی یەكەم دەبێتە حەوشەو بەردەست و رێگا بۆ نهۆمی دووەم.

قادرمەیەك لە تەنیشتەوە بۆی بەرز دەبێتەوە یان هەر ئاستی زەوییەكە لەگەڵ ئاستی یەكن.

لەم ناوچەیەدا ئادەمیزاد زیرەكی دەكات كاتێ هەوڵ دەدات رووبەری سەربانەكان كەم بێت، نهۆمی زۆر لەسەر یەك بێت تا كەمترین بەفری زستان رابماڵێت.

ژوورەكانی سەرەوە دووژوورو هەیوانێكیان لە ناوەندە بە پێچەوانەی خانووی گەرمیان هەیوانی زۆر لە خانووەكان لەپێشەوە لەم هەیوانەدا دەرگای ژوورەكانی تیایە بۆ ماڵ مێوانە یان مێوانخانەی جیایە دوور لە خانووی ماڵ، لە رێزی ئەو دوو ژوورە چەند ژووری سادە هەیە دەرگایان لە ناو یەكن بۆ چرو مەرو ماڵات و تەندوورو مێوەجات و كاو گەنم و جۆو مەبەستی تر.

نەخشەی خانووی كوێستان زۆر بایەخی بە هەیوان داوە. لاكێش یان چوار گۆشەیە ئاگردانی تیایەو هەر پاك رادەخرێت و لە دیوارەكانی تاق و رەف بە قورو بە گێچ دروستكراوی تیایە.

ئەوەی هونەرە لە نەخشەسازی گوندی ناوچەی شاخاوییدا سەربانی هەموو ماڵێك رێگایە بۆ كاروان و ژن و منداڵ و وەڵسات و گاران و چوون و هاتن و بارهەڵ. ئەوەش بێ گومان قایمی و توونەدیی و چاكی دامەزراندنی سەربانەو دارەڕێ چاكەو سەربانیش وەك پارچەیەك كۆنكریتی ئێستای لێهاتووەو بەرگری ئەو هێزە رۆژانەیە دەكات و بەرگرییەكەشی هەڵبەتە پتەوی مەوادەكەیەو وەستایەتی بەكارهێنانییەتی. لە هەندێ سەربانەدا گەر بواری هات وچۆ لە دەرزێكی تردا هەبێت دیوارێكی نەوی یان پەرژین دروست دەكەن تا رێبواران لە سەربانان دوور كەونەوە بەم دیوارە دەڵێن «مێرەرەوە» لە نامەیەكی تایبەتی مامۆستای بەرز دكتۆر محەمەد حەسەن لە بەرواری ٢٥/٦/١٩٨٨دا بۆی نووسیبووم: لە كتێبێكدا كە لە بارەی مێژووی بیناسازی گەلانی رۆژهەڵاتەوە نووسرابوو كەبە زبانی رووسی دەڵێت «بۆ یەكەم جار لە كوردستاندا بیریان لەوە كردەوە كە مادەی سروشتی بەكاربهێنن بۆ بینا لە شێوەی «پارچە ئامادەكراو Precast » وەكو لە قەدی دار كە سەرێكی لە شێوەی «٧» دایە كۆڵەكەیان درووستكرد «دیرەگ» كە ئەمە بیركردنەوەیەكی زۆر راست و لەجێی خۆییدایە»

ئەنجام :ـ

١ـ هەر ناوچەیەك لە كوردستاندا لە نەخشەی خانووو مەوادی درستكردنی جیاوازیەك بەدی دەكرێت، منیش لەم بوارەدا جیام نەكردەوەو زاراوەی بیناسازیش جیایە وەك:ـ

شاداروكاریتەو ئاشی كە هەرسێك یەك مانا دەبەخشن.

٢ـ ئەوناوچەیەی سروشت تووش تر بێت لەوێ خانوو بەهێزتر دروست دەكرێت و بایەخی زۆرتر بە پتەوی دەدەن تەمەنی خانوو درێژترە.

٣ـ لە ناوچەی دەشتایی حەوشە فراوانە بە پێچەوانەی ناوچە زۆزانەكان كە حەوشە لەوێدا دەگمەنە لە جیاتی ئەو هەیوان بەرینەو خانوو چەند خانە.

٤ـ لە نەخشەی هەندێ خانوو دیوەخان «ژووری مێوان» لە هەمان حەوشەیە بەڵام دەرگاو هاتوچۆی لە دەرەوەیە. لە هەندێكی تردا دوورە لە خانووەكە، یان گەر خانوو لە ناویەك بێت دەرگای لە ناو هەیوانە «لێرە هەیوان واتە هۆڵ» لە خانووە كۆنەكانی شارەكاندا ئاودەست لە سەربانە بە بۆری ئاسن یان قوری سووركراوە ئاوو پیساییەكە دێتە خوارێ.

لە دووری گوند ژوورێكی تایبەتی لە باخچەیەكدا بۆ هەنگ دروست دەكەن یان لە سووچێكی حەوشەدا دەكرێت.

بە كورتی هەموو مەبەستێكی پێویستی رۆژانەی ژیان لە نەخشەی خانوودا لە كۆن و نوێدا لە شارو گوندا جێگای هەیەو بایەخی پێدراوەو هەر كەسێك بەپێی زەوق و زرووف ناوچەكە گرنگی پێداوە.





# لەپیشە دەستیەکانی کوردەواری «کارگەچیەتی»

ئەحمەد حەیران

شتێکی بەڵگـە نەویستە کە میللەتی کورد، وەك هەموو خەڵکی سەرگـۆی زەمـین خاوەنی چەند پیشەیەکی دەستیە. رەنگە زۆریش لەو پیشانە بەهەمان جۆرو شێوە لای میللەتانی تر هەبن، جا چ دوور چ دراوسێ. هۆی ئەمەش هەر لە شەرو شۆرەوە دەگـرێتـەوە تا دەگـاتـە هاوبیری مرۆڤایەتی. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ کارو پیشە هەن بەرگێکی خۆماڵیان پێوەیەو دەتـوانـین بڵێـین بۆن و مۆرکی کوردەواریانەی پێوە نوساوە. ئەمەش یا ئەوەتە پەیوەندی بە بارو سروشتی ناوچەکەوە هەیە، یان شێوەو جۆری ژیانی خەڵکەکە ئەمەی داسەپاندووە. بۆیە تاوەکـو ئێستا زۆر لەم پیشە دەستیانە ماون و بەشێوەیەکی بەردەوام ئەنجام دەدرێن جا لە شار بێ یا خود لە دێ. هۆی مانـەوەو بەردەوام بوونـەکـەشی دەگـەرێتـەوە سەر گۆرانـە کۆمەڵایەتیەکان و، پەیوەندیە بەرهەم هێنەکان. هەر وەك دیارە کۆمەڵی کورد لەرێرەوی ژیانیدا رێچکەی قۆناغەکانی گۆرانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی گرتوە: بەڵام شەرتیش نیە لە سەدا سەد ئەم رێچکەیەی بەرنەدابێ چونکە تا ئێستا زۆر بیروڕای دژیەك هەیـە. دەربـارەی قۆنـاغی کۆیلایەتی. زۆر لە زانایان دەڵێن کۆمـەڵی کورد بەم قۆنـاغـە تێنـەپـەریوەو بونیشی نیە. لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ کۆپلەی حەیران و بەندی فۆلکلۆری پەیڤی (کۆلە) بەکارهاتوە کە بەمانای کۆیلە دێ. بەهەر شێوەیەك بێ ئەم گۆران و پێشکەوتنانە زۆر بە سستی رویداوە. تەنانەت لە زۆر باردا گۆرانەکە لە شێوەی سروشتی خۆی داکەلاوەو لایەنی پچڕ پچڕی گرتوەو، بەشێوەی باری ئاسایی خۆی تێنەپەڕیوە. بۆیـە پەیـوەندیەکانی بەرهەم داری دەرەبەگایەتیو، عەشیرەت گەری تا ساڵانی نیوەی ئەم سەدەیەش هەرمابوو لەبەر ئەمە بەرهەم هێنانی وەرزێری‌ی لە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری لایەنێکی زۆری لە ژیـانی کۆمـەڵی کوردەواری رووپۆش کردبوو. دیارە ئەگـەر کار بەم جۆرە بێ دەبێ لە پیشـەو کارە دەستیەکانی کۆمەڵەکەش رەنگ بداتەوە.

کۆمـەڵێك ئەگەر ئاژەڵداریی تیادا بەهێز بێ دەبێ هەندێك لە بەرهەمە چەنگ کەوتوەکانی لە پیشە میللیە ناوخۆکان بەکار بێ. هەر وەك ئەم بابـەتەی ئێمە کە لە دروست کردنیا بە تەواوی

پشت بە بەرهەم داری ئاژەڵ دەبەستێ. بەڵام ئێستاو چەندان ساڵێکی بەر لە ئێستا بەهۆی ئەو گۆڕانانەی بەسەر باری گوزەرانی کوردەواریدا هاتووە، ئەم پیشەیەو زۆر لە پیشەکانی تریش بەرەو کزی ڕۆیشتون، تەنانەت زوربەیان لە بن و بۆتکەوە خاشەبڕ بوینەو نەماون، دیارە ئەمانەش هۆیەکەی لە گەشەکردنی بازاڕی ناوخۆو چەکەرەکردنی پەیوەندیەکانی بۆرژاوی نیشتمانیی خۆی دەنوێنێ ئەمە سەرباری ئەوەی دەبێ باوەڕمان بە بارەگشتیەکان هەبێ، کە نوێ جێگای کۆن دەگرێتەوە کۆنیش دەبێ جێگا بۆ نوێ چۆڵ بکا. ئەمە کرۆك و ناوەرۆکی ژیانەو هەر دەبێ وابێ، چونکە سرووشت وەك هۆیەکی مادیی بەرهەم هێنان هزریش وەك هێزێکی بەرهەم هێنان ئەوا لە دژایەتی دان، هەموو دژایەتیەکی ڕاست و دروستیش دیارە ئەنجامەکەی پێشکەوتن و گۆڕانە ئێمەش ئەو پیشەکیەمان هەر بۆ ڕێخۆشکەرێك هێنایەوە بۆ سانایی چوونە ناو بابەتەکە. ئەگینا مەبەستی سەرەکیمان چۆنیەتی دروست کردنی (لبادو ڕایەخە).

بێگومان لبادو ڕایەخ هەروەك دەزانین یەکێکە لە پێویستیە هەرە گرنگەکانی ناوماڵ بۆ لەسەر نووستن و دانیشتن، هەروەها دیاردەیەکی ئاشکرای ناوماڵ و دیوەخانی کوردەوارین بەتایبەتی ڕایەخ کە تەنیا بۆ دیوەخان بەکاردێ لبادیش لە ماڵەوە بۆ نوستن. لەبەر ئەمە بە پێویستی دەزانین پێشەکی ئەم ماددەیە بخەینەروو کە ئەم دوو کەرەسەیەی لێ دروست دەکرێ.

لبادو ڕایەخ هەردوکیا لە (لوا) دروست دەکرێن، لواش بە خوری بەرخ دەوترێ کە بۆ یەکەمین جار دەبردرێتەوە؛ بەڵام ئەگەر ئەم بەرخە خوری هاتەوەو، بۆ جاری دووەم بردرایەوە ئەوا ئەم کاتە بەم خوریە دەڵێن (ڕوونگ)، کە هەم دیسان بۆ دروست کردنی ئەم دوو کەرەسەیە کەلکی لێ وەردەگیرێ؛ بەڵام لبادو ڕایەخێکی باشی لێ دە رناچێ بۆیە بە ڕاددەیەکی زۆر کەم خەڵك ڕوونگ بەکاردێنێ دەتوانین بڵێین کەس بەکاری ناهێنێ تەنیا (لوا) نەبێ ڕاددەی بەکارهێنانی ئەم لوایەش لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە، ئەوی شوان کارەو خاوەن مەڕ بێ ئەوا دەتوانی لوایەکی زۆر دانێ و تەرخان بکات بۆ دروست کردنی لبادی گەورەو ڕایەخی درێژ، ئەوی نەشیبێ یان یەك دوو سەر مەڕی هەبێ ئەوا بە دوو سێ ساڵ یاڵڵا دەتوانێ لوای ڕایەخێك یان لبادێك دانێ زۆر جاری واش هەبووە بۆی تەواو نەکراوە کڕیویەتی. ڕاددەی بەکارهێنانی ئەم لوایەش دەوەستێتە سەر توانای خاوەن لوا لەبەر ئەمە کورت و درێژیو پانی دەگەڕێتەوە بۆ خۆی کە بە حسابی (هۆقە) دروست دەکرێ بەزۆریش (٣) تا وەکو (٥) هۆقە دادەنرێ، وە زۆر جاریش لەم ڕاددەیە تێپەڕ دەکاو دەگاتە (٨) هۆقە.

کەهەر هۆقەیەکیش دوو کیلۆیە.

**چۆنیەتی دروست کردنی لبادو ڕایەخ:**

پاش ئەوەی بەرخ دەبردرێتەوەو، لواکەی لێ دەکرێتەوە، هەر بەشێوەی خۆی دەپێچرێ واتە بێ شۆردنەوە ڕەوانەی کارگە دەکرێ، بۆ لای وەستا لەوێش بە تەرازوو دەکێشرێ، ئینجا جیا دەکرێتەوە، واتە ڕەش لەگەڵ ڕەش، سپی لەگەڵ سپی سوور لەگەڵ سوورلە پاشا بە جۆرە ئامێرێکی تایبەتی پەرە دەکرێ کە بۆ ئەم جۆرە کارە دانراوە، کە پەرەکرا لە لایەن وەستاوە دەخرێتە سەر (چیغ). ئەم چیغەش لە گوش دروست دەکرێ درێژی بە قەدەر (١٠)م دەبێ پانیەکەشی بە قەدەرایی (٣)م، بەقەدەر درێژیو پانی ئەم چیغە لواکەی لەسەر درێژدەکرێ. ئینجا نەخشەکەی سەری دادەنرێ ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر وەستاکە زۆر هەیە پێش ئەوەی لواکە درێژ بکات نەخشەکە پێش تر لە سەر چیغەکە دادەنێ، بۆ ئەوەی بە توندی لەگەڵ یا تێکەڵ بێ و یەکتری بگرن نەخشیش هەر بە لواکە دەکرێ ئەگەر لباد یان ڕایەخەکە سپی بێ ئەوا نەخشەکە بە لوای ڕەش دەکرێ، ئەگەر ڕەشیش بێ ئەوا نەخشەکە بە لوای سپی دەکرێ، جگە لەم ڕەنگانە ڕەنگی تریش بەکاردێ، وەك (زەرد، سوور، مۆر، پەمبە)؛ بەڵام بە زۆری (زەرد وسوور) بەکاردێ کەئەمەش بە هۆی دەرمانی تایبەتی دەبێ، لەدوای ئەمانە کە لواکە لەسەر چیغەکە درێژکرا ئینجا ئاوی بەدەست پێدا دەپرژێنرێو، هەر بە چیغەوە لوول دەدرێو، بەتوندی بە پەتێکەوە دەپێچرێ، ئەوسا دووکەس بە پێلەقان بۆ ماوەی (٤٠) خولەك لێی دەدەن لە پاشا دەکرێتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەیە

تا وەکو (وەسڵ) بکرێ وەسڵیش بریتیە لە نوشتاندنەوەی ڕوخەکانی، تاکو لایەکانی لبادو رایەخەکە بە جوانی دەرچێ. ئینجا بۆ دووبارە ئاوی لێ دەدرێتەوەو، دەپێچرێ بە هەمان شێوەی پێشوو دەدرێتە بەر پێلەقان، بە چەند خولەکێك زیاتر لەجاری یەکەم لە پاشا دەکرێتەوە لێرەدا هێشتا هەر خاوە.
بەم جۆرە قۆناغێکی تر دەست پێدەکات ئەمیش ئەوەیە دەکەوێتە بەردەست یەکێکی تر پێی دەڵێن (بگێر)، ئەمە کە دەیکاتەوە دەبینێ شێوەیەکی لاکێشەیی وەرگرتووە ئینجا بە ئاو دەپرووشێنێ کە لە ڕشاندنەکە تەواو بوو (قەد)ی دەکات. قەدیش بەم شێوەیە سەرێکی (نیو مەتر) قەد دەکا سەرەکەی تریش چەند ماوە قەدی دەکاو دەیگەیەنێتە سەرەکەی تر. دووبارە ئاوی پێدا دەپرووشێنێ ئینجا قەدەکان داوێتە سەریەکتری‌و لوولی دەدا ئەوسا لەسەر ئەژنۆ بە باسکی رووت وەری دەگەرێنێ‌و دەست بە لێدان دەکات.
هەر سەرێکی (٥) خولەك لێی دەدات. ئەم کردارە چوار جار دەکات، واتە بۆ هەر سەرێك دووجار کە هەمووی بەیەکەوە دەکاتە (٢٠) خولەك لێدان. لە پاشان وەری‌دەگێرێ بۆ دیوەکەی تر کە پێی دەڵێن (تەخت) دووبارە ئاوی لێدەداو لوولی دەکاتەوە بە باسکی دەست بەلێدانی دەکات. بەهەمان شێوەی پێشوو هەر لای دووجار بۆ ماوەی (٥) خولەك کە هەمووی بەسەر یەك دەکاتە (٢٠) خولەك. بەم جۆرە قەدێك تەواو دەبێ، واتە هەر قەدێك (٤٠) خولەك دەخایەنێ بۆ هەردوو دیو، کە ئەم قەدی یەکەمە تەواو بوو دووبارە دەکرێتەوە قەدە گچکەکە واتە نیو مەتری‌یەکە جێگەی گەورەکە دەگرێتەوە گەورەکەش جێگەی بچووکەکە دەگرێتەوە واتە پێچەوانەی جاری یەکەم. بەم شێوەیە دیسان ئاوی لێ دەدرێ هەر دوو قەدەکە دەهاوێشترێتە سەر یەکتری‌و لوول دەدرێ‌و دەست بە لێدان دەکرێت بە هەمان کات و جۆری پێشوو تاوەکو چوار قەد تەواو دەبێ کە هەر قەدی (٤٠) خولەك دەخایەنێ، واتە چوار (٤٠) خولەك.

**کارگەکانی لبادو رایەخ لە هەولێر:ـ**

بێگومان سەرەتاو پەیدابوونی ئەم کارگانە بەتەواوی نەزانراوە لە کەیەکەوە سەری هەڵداوە بۆ ئەمەش پەیوەندیمان بە هەر یەکێ دەکرد، دەمیوت لەوەتی من بەبیرم دێ ئەمە هەر هەبووە. بەڵام بە گوێرەی بۆچوونی بابەتی دیارە شتەکە لە دوای نیشتەجێبوونی کۆمەڵ‌و پەیدابوونی گوندو شارو خەریك بوونی مرۆڤ بە ئاژەڵداری‌یەوە سەری هەڵداوە. نزیك ترین بەڵگەش بۆ ئەم مەبەستە ناوی ئەم کەسانەیە کە لە دوا سەردەمی عوسمانیەکان کارگەیان هەبووە لە هەولێر واتە سەرەتای ئەم سەدەیە کە بە ساڵا چووەکان دەڵێن (زەمانی گرانیێ). بۆ ئەمەی بابەتەکەش زیاتر لە راستی نزیك بێتەوەو دوور بێ لە گرێ کوێرە. ئێمەش خاوەن کارگەکانمان بەسەر سێ قۆناغ دابەش کرد، قۆناغی یەکەم ئەمانەی لە کۆتایی دەسەڵات داری عوسمانی‌و سەرەتای هاتنی ئینگلیز کارگەیان هەبووە، قۆناغی دووەم پاش هاتنی ئینگلیزەکان؛ قۆناغی سێیەم ئەوانەی ئێستا کارگەیان هەیە.

**١ـ کارگەکانی سەرەتای ئەم سەدەیە :ـ**

هەروەك وتمان ئەمانە دەگەرێنەوە بۆ کۆتایی دەسەڵاتی عوسمانی‌و سەرەتای دەسەڵاتی ئینگلیز. بێگومان ئەم کارگانەش هەر یەکە بە ناوی خاوەنەکەیەوە ناونراوە، چونکە هی خۆی بووە نەك هی دەوڵەت. شاگردو بگێر، کاریان لا کردوون لەگەڵ پەرەمچی. گرنگ ترینیشیان ئەمانە کە ئێستا هیچێکیان لەژیاندا نەماون و مردوون
١ـ کارگەی وەستا عەباس.
٢ـ کارگەی سەید رەمەزان عەولا پەروەر.
٣ـ کارگەی وەستا هەمزە.
٤ـ کارگەی سەید کەریم عەولا پەروەر.
جگە لەمانە، لەوانەیە هی تریش هەبووبن بەڵام ئێمە هەر ئەوەندەمان دەست کەوت. دەشبێ ئەمانەش لە هی پێش خۆیان فێربووبن و لەدوایی‌دا کارگەیان بۆ خۆ دانابێ چونکە تاقمی دوایی ئەمانە زۆریان لەسەر دەستی ئەمانەی ناومان بردن فێربوونە‌و کاریان لا کردون لەدوایی‌دا بۆ خۆیان بوونەتە وەستاو کارگەیان دامەزراندووە.
بەڵام دەربارەی کرێی دەستی ئەم شاگردو پەرەمچی‌و بگێرانەی لای ئەم وەستایانەی ناومان بردوون بەم جۆرە بووە.

بگـێر بە (رووپیـەیەکی) کاری کردووە کە دەکاتە (٧٥) فلس پەرەچیش هەر بەم نرخـە ئەمـە لە کاتێکـا ئەمانە بە حسابی (باتمان) کاریان کردووە واتە رۆژانەیان وەستاوەتە سەر باتمان ئەگەر رۆژێ دوو باتمان لوایان پەرە بکـردایە یان بیانگێڕا بائەوا دوو روپیەیان وەردەگرت ئێستاش بگێر هەر بە هەمان حسابی باتمان کاردەکا.

**٢ـ کارگەکانی سەردەمی ئینگلیزو بەرەو دواتر:ـ**

لێرەدا ناوی ئەو کەسـانە دەخەینە روو کە لە کاتی ئینگلیزو، پاشتریش کارگەیان هەبووە بەڵام ئێستا هیچ کامیان لە ژیاندا نەماون تەنیا دووان نەبێ.

**١ـ حاجی حمە رەزا .**
**٢ـ شێخ یونس .**
**٣ـ شێخ تەها .**
**٤ـ عەزیز چاورەش .**
**٥ـ خەلیفە وەلی .**
**٦ـ حاجی خاڵە .**
**٧ـ وەستا قادر .**
**٨ـ محمد حمە رەحیم .**
**٩ـ پیرداود حمە رەحیم .**
**١٠ـ وەستا وەهاب .**
**١١ـ رەحمان مامزە شەل .**
**١٢ـ شێخ محمد سەید کریم .**
**١٣ـ خەلیفە شێخۆ .**
**١٤ـ شەهاب محمد نەبی .**
**١٥ـ دەروێش یەحیا، ماوە تەمەنی (٨٠) ساڵ دەبێ.**
**١٦ـ محمد قادر داود بڵباس، ماوە تەمەنی (٨٠) ساڵ دەبێ.**

ئەمانە تاوەکو ساڵانی چل کارگەیان هەبووە لە دوای ئەمانەش ئەم ناوانەی خوارەوە وەستاو کارگەچی بوونە لە هەولێر

**١ـ حاجی سەعید کوڵچین نەماوە .**
**٢ـ حاجی رەحمان، مردووە .**
**٣ـ ئەنوەر رەشید، مردووە .**
**٤ـ حاجی سلێمان، ماوە .**
**٥ـ احمد عبدالقادر، ماوە .**
**٦ـ کریم عبدالله، ماوە .**
**٧ـ محمد عبالوهاب، ماوە .**

بێگومان لەم ماوەیەدا بەگوێرەی گۆرانی رۆژگارو پێش کەوتنی ژیان کرێی دەستی بگێرو شاگردو پەرەچیەکان زیادی کردوە. بۆ نموونە دوای ئەوەی رووپیە نەماوە، دینارو درهەم پەیدابووە، بگێر لە سەرەتا (١٠٠) فلسی هەبووە، دوایی بەرە بەرە زیادی کردووە بۆ (١٥٠)، پاشـان (٢٥٠) فلس. بەم جۆرە رۆیـووە تاوەکـو هەندێك دەڵێن لە ساڵانی پەنجا، بگێر یەك باتمانی بە (٥٠٠) فلسی دەپەستاوە، ئەمە لە کاتێکا لباد یان رایەخ نرخی (٣ـ٤) دینار بووە، ئیتر بەم شێوەیە لە شەستەکانیش توزێ زیادی کردووە، بۆ (٧٥٠) فلس و، بەرەو ژوورتر.

**٣ـ کارگەکانی ئێستای لبادو رایەخ :ـ**

لێرەدا ناوی ئەوانە دەدرکێنین کە تاوەکو کاتی ئامادەکردنی ئەم بابەتە کارگەیان هەیەو ماون و لە تەمەنی (٥٠ـ٥٥) ساڵ دان.

**١ـ احمد حمد مولود .**
**٢ـ محمد کرد گراوی**
**٣ـ مشیر مامە .**
**٤ـ طلعت حاجی یونس .**
**٥ـ جمیل قادر .**
**٦ـ هەیاس حاجی محمد .**
**٧ـ جوهر انور .**
**٨ـ قاسم عوسمان .**
**٩ـ بکر محمد قادر .**
**١٠ـ کریم فەتاحە سوور .**

ئەوەی شایـانی گوتنیشـە ئێستـا بگێر باتمانی بە (٧) دینار دەپەستێتەوە، واتە دەگێرێ و نرخی لواش بە کیلۆیان بە مۆقەیە؛ بەڵام بەزۆری مۆقـە بەکـاردەهێنن بۆ کرینی لوا، هەر مۆقـە لوایەکیش بە (١٢ـ١٣) پەنجاییە؛ بەڵام نرخی رایەخ یان لباد ئەوا بە گوێـرەی ئەو لوایـەی تێی دەچێ دەفرۆشرێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر رایەخێك (٨) مۆقە لوای تێبچێ، ئەوا هەتا (٤٠)

دینار نرخی دەروا. ئەمە لە کاتێك دا ئەگەر وەستاکە خۆی لوا بکڕێ؛ بەڵام ئەگەر ئەو کەسەی ڕایەخ یان لباد بە کردن دەدات لواکە هی خۆی بێت وەستا لە هەر هۆقەیەك (چوار) دینار بۆ خۆی دەگێڕێتەوە. پێویستە ئەوەش بگوترێ کرێنی دەرمانی نەخش و پەرەکردن لەگەڵ کرێی ئەو دوکانەی کاری تیا دەکەن ئەوانە هەموو لەسەر وەستا خۆی بووە، هەروەها وەستا خۆشی وەك بگێڕ شاگردەکان کاری کردووە، بۆ ڕاخستنی لواکە لەسەر چیغ و پەستانەوەی.

**ئامێرەکان :ـ**

ئەو ئامێرانەی بۆ دروست کردنی ئەم بابەتە کەڵکیان لێ وەردەگیرێ زۆر نین و لە دوو ئامێر تێپەڕ ناکەن کە شەنەو، کوتك و کەوانە، واتە ئامێری پەرە کردن.

**١ـ شەنە** :ـ لەچەند پەلە دارێکی باریك پێك دێت کە دەمەکانیان وەکو شەنە پەرپەر دەکرێت لە قونکەوەش ڕا سەرەکانیان دەگەیەنرێتەوە یەکتری‌و، بە شتێك دەیپێچن. هەر لە سەلکە شەنەش دەچێ، بۆیە ئەم ناوەیان لێناوە، بۆ ڕاخستنی لوا لەسەر چیغ بەکاردێ.

**٢ـ کوتك و کەوان** :ـ ئەمەیان ئامێری پەرە کردن دەگرێتەوە، کە لە دارو چەرم پێك دێت، چەرمەکەش بەزۆری ڕیخەڵۆکی ماڵاتی بۆ بەکاردەهێنن کە بۆ ژێیەکانی ئامێرەکە کەڵکی لێ وەردەگیرێ؛ بەڵام دارەکان کە لە داری تایبەتی‌و ئاسایی پێك دێت هەر یەکە ناوێکی هەیە، وەك [**دەفە، کەوان، کوتك، دارەسما**] ئەم ئامێرە دوای ئەوەی بەرێ‌و شوێنی خۆی دانرا ئینجا پەرە چیەکە لە لایەکەوە ژێیەکە دەخاتە ناو لواکە ئینجا بە کوتکەکە لە ژێیەکە دەدات لەم کاتە لوا پەرە کراوەکە بۆ لایەك دەروا ئیتر بەرە بەرەو، بەم پەرە تا وەکو هەمووی پەرەدەکرێ؛ بەڵام پێویستە ئەوە بڵێین کە ئەم ئامێرە هەر تەنیا بۆ پەرەکردنی لوا بەکار نایەت بەڵکو بۆ لۆکەو پەمۆش بەکاردێ.

**چیرۆکێك دەربارەی ڕایەخ ولباد :ـ**

دەگێڕنەوە دەڵێن لە یەکێ لە شارەکانی ئەم دەورو بەرە پاشایەکی زۆر بە زەبرو زەنگ هەڵدەکەوێت، کچێکی زۆر جوانیشی دەبێت ڕۆژگار دێت و ڕۆژگار دەروا، کورە هەژارێك حەز لەم کچە دەکات. ئیتر ڕۆژ بەڕۆژ خۆشەویستیەکەی زیاتر گڵپە دەستێنێ. تاوەکو ڕۆژێك دێ دەنێرتە خوازبێنی کچە پاشای، پاشا کە بەمە دەزانێ سەری سوڕدەمێنێ. چونکە خۆیو ئەم کابرا هەژارە زۆر بە لێك دوور دەزانێ. بۆیە پێی دەڵێ باشە من کچی خۆم دەدەم بە تۆ؛ بەڵام داوایەکم هەیە دەبێ جێبەجێی بکەیت ئەمیش ئەوەیە یان دەبێ بمریت یان دەبێ جێبەجێی بکەیت. کابراش پێی دەڵێ فەرمو داواکەت بڵێ: پاشا دەڵێ: مادام تۆ داوای کچی منت کردووە ئەبێ تاوەکو بەیانی فەرشێکم لە خوری یا خود لوا بۆ دروست بکەی ئەگەر نا لە سەرت دەدەم واتە هەڵت دەواسم.

کە وای پێ دەڵێ کابرا سەرێك دێنێ‌و سەرێك دەبا، چی بکا تازە توش بووە یان ئەبێ دروستی بکات، یان ئەبێ لە سەری بدرێ، بۆیە بە پەلە دەگەرێتەوە ماڵەوە هەندێ خوری‌و خارو لوا کۆ دەکاتەوە لە ژورێکەوە لەسەر زەوی درێژی دەکات، ئینجا دەست دەکات بە هات و چوو لە سەری، بەم شێوەیە پێوەی خەریك دەبێ تاوەکو بەترەکی شەو، چەندی دەکات و دەکات یەکتری ناگرێ‌و نابێتە فەرەش. هیچ چاریشی نیە بۆ بەیانی دەبێ دروستی بکات، ئەگەر نا بۆ هەر لایەك رابکا هەر دەکەوێتەوە دەست پاشا، بۆیە ئەو شەوە ناخەوێ هەر خەریکی لوایەکە دەبێت تاوای لێدێت زۆر هیلاك دەبی‌و، ئارەقەیەکی زۆر لە قەلبی دەچۆڕێتەوە لە شوێنی خۆی لەسەر لواکە دادەنیشێ. پاشان کە هەڵدەستێ دەبینێ شوێنەکەی لەسەری دانیشتووە توند بووە، مەزانە ئەو ئارەقەی لە لەشی هاتبووە دەر وای لێ کردبوو، ئەویش مەزەندەیەکی لێدەکاو، دەڵێ: بەخودای ئەمە کاری ئارەقەکەیە ئەم شوێنە وا رەق بووە.

بۆیە هەڵدەستێ چەند جامێ ئاو دێنێ‌و، بەسەر هەمو لواکەی دا دەپرژێنێ. ئینجا دەست بە هات و چوو دەکات لەسەری، ماوەیەك وا دەکات دەبینێ لواکە تەواو یەکتری گرتووە ئیتر بەرە بەرە بەمجۆرە تاوەکو بەیانی بە تەواوی رەق دەبێ‌و دەبێتە فەرش و بۆ لای پاشای دەبات، پاشا کە وای دەبینێ ناچار کچەکەی خۆی لێ مارەدەکات و، دەیداتێ‌و لەشوێنی خۆی دەیکاتە پاشا. کە ئەو گۆڕانە ڕوودەدات، جڵەوی فەرمان ڕەوایی

دەکەوێتە دەست کورە هەژارەکە، ئیتر بەتەواوی هێمنیو ئاسایش دەست بەسەر ناوچەکە دادەگرێ، بۆیە کابرا جەماوەرێکی زۆر بەدوای دەکەوێو، خەڵکەکە بەتەواوی لایەنگیری دەکەن، چونکە گوزەرانیان خۆش دەبێو، باری ئابووری‌یان بە هۆی ئەم فەرشە دۆزراوەیە دەگۆڕێو، کارگە پەیدادەبێ، واتە گۆڕانێکی تەواو لە ڕووی خۆشی‌ی گوزەران لە قۆناغی فەرمان ڕەوایی ئەم کابرایە ڕوودەدات، دەڵێن ئەو کابرایە واتە کورە هەژار ناوی (مەنسوور) بووە.

خەڵکەکە بە (مەنسوور هەلاج) ناوی بردووە. هەلاجیش لەزمانی کوردی‌دا، واتە (شیکەرەوە) یا (پەرەچی). هەتا وەکو دەڵێن پاش نەمانی ئەو کابرایە باری گوزەرانی خەڵکەکە تێك چۆتەوەو پەشێوی‌و ناکۆکی باری بەسەردا کێشاون، بۆیە دیسان چاوەڕێ بوونە، کە ئەو کابرایە «مەنسوور هەلاجە» بگەڕێتەوە، دنیایان بۆشی‌بکاتەوەو پەرە بەپەرەی بکات تاوەکو ئاساییش سەر بەوڵات دابگرێ. تەنانەت دەڵێن پێشیان وتووە مەنسوور هەلاجی پێغەمبەر!!!

**فەرهەنگۆك**

بگێڕ : ئەم کەسەیە لەسەر ئەژنۆ بە باسکی ڕووت، ڕایەخ یا لباد دەپەستێتەوە دوای ئەوەی لای وەستا لە چیغ دەدرێو، دەردەچێ.
هۆقە : جۆرە کێشێکە بەرانبەر بە (دوو) کیلۆ دەوەستێ.
باتمان : جۆرێکە لە کێش بەرانبەر بە (شەش) هۆقە دەوەستێ، واتە دەکاتە (١٢) کیلۆ.
ڕوپیە : جۆرێکە لە پارە بەرانبەر بە (٧٥) فلس دەوەستێ دەڵێن پارەیەکی هندیە لەگەڵ هاتنی ئینگلیز کەوتۆتە کوردستان.
چیغ : لێرەدا مەبەست ئەم چیغە نیە کە لە دەوری ڕەشماڵێ دەئاڵێنن؛ بەڵام لەزووێکەوە هەمان چیغ بەکارهاتووە بۆ لوول دانی لباد یان ڕایەخ، بۆیە ئێستاش بە هەمان ناوەوە ناو نراوە، ئەگینا ئێستا گوش بە کاردەهێنن، بۆ ئەم مەبەستە
بەتر : نیوە، درەنگ، بەترەکی شەو واتە درەنگی شەو، نیوەی شەو.

**دوو وردە تێبینی :ـ**

١ـ لە زووەوە بگێڕەکان لە کاتی زستانان دالەحەمام نیشیان کردووە، واتە خۆیان ڕێك کەوتوون حەمامێکیان گرتووە، زستانان کاریان تیادا کردووە، بۆیە زۆربەی زۆریان یەکترییان ناسیوە، چونکە لەم شوێنە یەکدی گیربوون. هەروەها هەندێ جاریش وەستا لەگەڵ شاگردەکان بە گوندو ناوچەکاندا گەڕاون بۆ کارکردن.
٢ـ مام محمد قادر داود : دەڵێ: لە دایك بووی ساڵی (١٩٠٠) ینم، بەڵکو بە (٥ـ٦) ساڵ بچووك ترم؛ بەڵام لە نفوسم وا نوسراوە.

## سەرچاوەکان :ـ

١ـ سەردانێك بۆ کارگەی (ئەحمەد حمەد مولود) ڕۆژی ١٩٨٦/٣/١٢ گفت وگۆ کردن لەگەڵ خۆیو، بگێڕەکەی کە ناوی عبدالواحد شێخ محمدە. هەر ئەویش، واتە کاك عبدالواحد چۆنیەتی پەستانەوەو، گێڕانی لبادو ڕایەخی بۆ دەرخستین و، ڕوونی کردەوە، تەنانەت خۆشی بۆی نوسین.
٢ـ سەردانێك بۆ کارگەی (قاسم عوسمان) ڕۆژی ١٩٨٦/٣/١٩ گفت وگۆکردن لەگەڵیا،. لە هەمان کاتیش باوکی لەوێ بوو، کە ناوی (مام عوسمانە)و لە دایك بووی ساڵی (١٩٠٧)ە، ئەم گوتی لە پەنجاکان دا بگێڕ باتمانی بە (٥٠٠) فلس دەپەستاوە، کە خۆم یەکێ بوومە لەم بگێڕانە.
٣ـ سەردانێك بۆ کارگەی (بکر محمد قادر) ڕۆژی ١٩٨٦/٣/٢٢ گفت وگۆ کردن لەگەڵ مام (محمد قادر بلباسی) باوکی کە لە دایك بووی ساڵی (١٩٠٠)ە، ئەم ناوی خاوەن کارگەکانی سەردەمی گرانی، واتە سەردەمی عوسمانی‌و سەرەتای دەسەڵاتی ئینگلیزو دواتری پێ‌گوتین. هەروەها وتی: «خۆم بگێڕ بوومە لای (وەستا عەباس) بە ڕووپیەیەکی، پەرەچیش هەر ئەوەندەی هەبوو، هەروەها گوتی: «وەستا پاش ئەوەی کرێ‌ی من و پەرەچی‌و شاگردی دەدا، هەر ئەوەندەش بۆ خۆی دەمایەوە، ڕووپیەك یان دووان، لەبەر ئەوەی لبادو ڕایەخ نرخی زۆر نەبووە، هەروەها ئەمەشی گوت: «دوای ئەوەی دینارو درهەم پەیدابوو، بگێڕ بە (١٠٠) فلس لباد یان ڕایەخی دەپەستاوە واتە باتمانی بە (١٠٠) فلسی دەگێڕا»؛ بەڵام دەربارەی سەندیکا. نەقابە، وتی: «لە ساڵی (١٩٥٨) داوایان لە ئێمە کرد داخلی نەقابە بین کە ئەو کات ژمارەمان بە وەستاو شاگردەوە لە دەوری (١٠٠) کەس دەبوو، سەرۆکی بەشەکەشمان واتە کارگەچی‌یەکان ئەمانە بوون (ئیبۆ دلبەر، محمد حاجی وەهاب، خلیل عزیز ـ گوڵناز) کە ئێستاش ماون و لە هەولێر دادەنیشن».
٤ـ دانیشتنێك لەگەڵ کاك (ئازاد ئەحمەد) دەربارەی ئەم چیرۆکە ئەفسانەیی‌یەی لە سەر چۆنیەتی دروست کردنی ڕایەخ و لباد گوتراوە کە ئەویش لە باپیری گوێ‌ی لێ بووە، کە ناوی (محمد حمە ڕەحیمە)، ئێستا نەماوە، کارگەشی هەبووە، شایانی باسیشە دانیشتنەکە لە ڕۆژی ١٩٨٦/٤/٥ بوو لە ژووری کارگەی (بکر محمد قادر).



# گەوەگان.. ئێوە شایەتی دەرگای خودابن!!

محمدامین پێنجوێنی

لالۆ خواکەرەم پیاوێکی گەلێ ماقوڵ و خانەدان و پیاوانەبوو، هەموو ئاوایی سوێندیان بەسەری دەخوارد.. ئەویش وەکو باوکێکی دڵسۆز شانی‌دابووە بەرهەموو گیروگرفت و کێرەوکێشەی خەڵکی‌و قەت نکوڵی نەدەکرد لە بەدەنگەوەچوونی لێقەوماوان و کاروباری هەموو لایەکەوە.

لالۆ کە ئەهات بۆ شار.. سواری ماینەکوێت ئەبوو فەقێیانەی بەسەرشانی‌دا شۆڕ ئەکردەوە، خەنجەری‌مسوماهی لەبەرپشتێنی دەناو مشکیو جامانەی تێکەلاو ئەکرد گوڵنگەی بە سیم هەڵبەستراوی لێبەرئەدایەوەو تەخت و رەختی ماینەکوێت وا رازابوەوە کە ئەکەوتە رێ ئەت وت رەخشی رۆستەمی زاڵە.

بەلێ لالۆ هەموو رۆژانی هەینی ئەهات بۆ شار، بۆ نوێژی جومەعە.. لەشاریش هەندێ کەل پەلی دەکری بۆ ماڵ و منداڵەکەی‌و بژێوی دیوەخان. چونکە دیوەخانەکەی لالۆ بووەتە جێگەی غەریبان و رێبوارانی ئەو ناوچەیە.. لەبەرئەوەی گوندەکەی لالۆ خواکەرەم کەوتبوە چەقی رێگەی ئەو هەرێمە. هەرکەسێ بەوناوەدا گوزەری بکردایە لەدیوەخانەکەی لالۆ لەنگەری ئەگرت.

کاکەرەش کورە گەورەی لالۆیەو تازە مێردمنداڵەو هەرکە لالۆ لە ماڵ دەرئەچوو ئەویش سەرگوێسەوانەی بانیژەی دیوەخانەکەی ئەگرت هەتا باوکی ئەهاتەوە چونکە وای فێر کردبوو کە لەشار ئەهاتەوە هیچ کات بێ دیاری نەدەبوو هۆگری خۆی کردبوو. ئەوا عەسرێکی درەنگەو سێبەرەکان ملیان شۆڕ کردۆتەوە بۆ سەر ملەو سەر کلاوان و وەرزیش بەهارێکی تەرو برو پاراوە.. دنیا هەمووی وەکو بووك رازاوەتەوە، ئەم چیاو دۆڵی کوردستانە بەهەشتێکی راستەقینەیە.

لالۆ بەرەو گوندەکەی خۆی کەوتۆتە رێ لە گێژاوی ئەندیشەو خەیاڵاتدا وا حەمەرەشی لەبەرچاوی دێت وەدەروا بە خۆشییەوە نوقڵ و خورمای دیارییەکەی لێوەردەگرێ. خاتو ئیسافی خێزانیشی خەریکی جێگە راخستن و سەماوەری وەرشەوی لێهێناوەتە گێزەو بەدەم ئەم ئیشانەو گوڵ و ریحانەکانی سەر بانیژەکە ئاودەدا، لالۆ وەبیری هاتەوە چۆن بە هەرزەکاری دەچوە کۆلانەکەی ماڵی ئیساف و ئەویش ریحانە رەشەی بۆ هەڵ ئەدا وەکو پڵنگ ئەی‌قۆزتەوەوهەناسەیەکی هەڵکێشاو سەرێکی بۆ لەقاندو.. ئای دونیا ئای زەمانە کە وەفات بۆ کەس نیە. لالۆ هەمیشە دڵی بەوە خۆش بوو کە ئەوەندەی چاکە لەگەڵ خەڵکی‌دا کردووە ئەوەندە لایان بەرێزو خۆشەویستە، بۆیە خۆی زۆر بە بەختەوەر دەزانی‌و لەبەرچاویش بوو کە حەمەرەش سبەینێ گەورە دەبێ‌و جێگەی خۆی دەگرێتەوە لە دەریای ئەم خەیالاتانەدا بوو، مابووی بگاتە ناودەمی لەغاوگیرەکە.. سەیرێکی کرد ماینەکوێت هەردوو گوێی قووت کردۆتەوەو نەرمە کورکەیەکی کردو پرمەیەکی لێداو ئینجا وەك کیژ حیلاندی.. لالۆ ویستی باش دیقەتی ناولەغاوگیرەکە بداو سەرنجی ئەم لاو ئەولای کردو لەپر کسپەی گوللەیەك لەشانی چەپیەوە هات و لەسەر پشتی ماینەکوێت بەربوەوە ئینجا دوو زرتە بۆز بە ئەسپایی لەغاوی ماینەکەیان گرت و رایانکێشاو کەوتنە رووت کردنەوەی، لالۆ هەرچی پێی‌بوو هەموویان چەپلاوکرد لە خورجی خۆیان نا.. پاشان (ئەلەکە) بە (وەلەکەی) وت: با بە تەواوی ساردی بکەینەوە.. لالۆ هۆشی وەبەرهاتەوەو گوتی: هەرچیم هەیە بیبەن ئەوەش ماینەکوێت ئیتر بۆ دەمکوژن، خۆ من ئێوە ناناسم.. برۆن و بەجێم بێلن! لەم قسانەدابوو (ئەلەکە) فیشەکێکی‌تری لێدا! لالۆ هەر ئەوەندە فریا کەوت شایەتمانی هێناو چاوێکی گێڕا

بینی وا دوو کەو بەرانبەری چینە ئەکەن، ڕوویکردە کەوەکان وتی: ئێوە کەوەکان شایەتی بەر قاپی هەقی تەعالا بن، وا ئەم دوو چەتـەیـە منیـان کوشت: کەوەکان ئێوە شاهێدی ڕۆژی قیـامـەت بن!! ئیتـر لالۆ هەناسە سارد بوو لەملەی لەغاوگیر سەری نایەوە.. بۆ بەیانی ئاوایی لالۆ بوو بەڕۆژی حەشر بوو بەو ڕۆژەی (سیاوەش) تیا کوژرا. کوڕوکاڵ تەرمی لالۆیان هێناو لەبەر دەرگای مزگەوت دایان نا.

ڕۆژهـات و ڕۆژچـوو کاکـەڕەش کوری لالۆ گەورە بوو ئێستە هەرزەکارەو دڵی بە دونیا خۆشە وەخۆ کەوتووە، خەریکە جێگەی باوکی دەگرێتەوە بەڵام ئەوەی لەدڵی دەرناچێ‌و بووتە گرێ‌کوێرەو شەو ڕۆژ بیری لێ‌دەکاتەوە ئەوەیە کێ باوکی کوشت و چۆن تۆڵەی بکاتەوە؟ئەم مەسەلەی تۆڵە سەندنەوە ئارام و ئۆقـرەی لێبـڕیـوەو هەراسـانی کردبوو، لە لایەکی تریشەوە جوانی‌و شوخی مەنیژەی کچی کوێخا (مەنوچەر) گێژی کردبوو وەکو سوێسکە هەر بە کولانی ماڵی کوێخادا هەزارەی ئەکرد. ڕۆژێـك (ئـەولا)ی، کوری کوێخـا لێی‌هـاتـە قسـەو گوتی: حەمـەڕەش ئەزانم ئەم هات وچـۆیەت لەچیە؟ وەدەورو خولی مەنیژە مەدە، تۆ ئەگەر ڕاست ئەکەی پیاوی.. بڕۆ تۆڵەی باوکت بکەرەوە!

ئەم قسـەیەی (ئەولا) وەکو تیرونەشتەر دڵی کاکەڕەشی سمی‌و ئەو شەوە هەتـا بەیـانی پێـوە ئەتـلایەوە، بە هەردانە چیرەیەك بوو ڕۆژی لێبووەوەو بەیانی چوە سەر ڕێگەی کانی.. وەکو دارچنار چەقی هەتا ڕۆژی مەنیژی لێ‌هەڵهات و لێی‌نزیك بوەو حاڵی مەسەلەی بۆ گێرایەوە. ئینجا لەسەر ئەوە پێك هاتن کە هەردووکیان (هەڵێن)! کاکەڕەش گەڕایەوە ماڵێ‌و ڕازونیازی دڵی خۆی بۆ دایکی هەڵڕشت و دەستی دایکی ماچ کردو گەردن ئازای لێکرد بە دڵێکی پڕ لە ئاوات و داخەوە لەماڵ هاتە دەرێ‌و چووە جێ‌ژوان و مەغـریبانێکی درەنگ مانگی ڕووی مەنیژی دیەو پێکەوە بەر محەمەد سەلاوات ڕوویان کردە دەشت و دۆڵ و کێوو چیا.. چەند شەوو ڕۆژێ ڕۆیشتن چەند فرسەقیان بڕی هەتا لەسەر کانی‌و ئاواو مێرگێ لەنگەریان گرت و کوخێکیان بۆ خۆیان دروست کرد، دیارە (هەر دەوەنە ئەبێ بەدار) ئەوانیش وردە وردە بوونـە ماڵ و ئاوەدانی هەتا وای لێهات خەڵکی لە دەوریـان کۆبـوونەوەو بوونە دێیەکی گەورە. کاکەڕەش وەکو باوکی بوە دەم ڕاستی ئاوایی، بوە یەکە پیاوماقوڵی دێیەکە.. دیـوەخـانی کاکەڕەش بوە مەڵبەندی ڕێبواران و لێقەوماوان. ڕۆژهـات و ڕۆژچـوو.. ئێـوارەیـەك کاکەڕەش لەسەر بانێژەی دیـوانێ وەستـا بوو کوڕکاڵ دەوریان دابو، چاوێکی بۆ دوور ئاوایی هەڵخست سەیری کرد وا دوو ڕێبوار بەرەولای ئەمان دێن، دەستووری‌داو گوتی: ئەو زەلامانە بانگ کەن و بیان بەن بۆ دیـوەخـان (هەموو کاتێ کاتی خوایە) ئێوارە پاش نوێژی چوونە دیوەخان نان هات نان چ نان؟! هەر سێنیەو بەرەو لای میوان دەچێ، هەموو دەوریەك برنجێ کەوێکی سورەوەکراوی لەسـەرەو لەبـەردەم زەلامـەکـانـدا دانراوە.. زەلامەکان هەر ئەوەندەیان خۆش بوو چاویان بە (کەو)ی، سوورەوەکراو کەوت دەستیان کرد بە قاقای پێکەنین!! کاکەڕەش لەم حاڵە سەری سوورمـاو گوتی: ئەرێ براینە بۆ پێدەکەنن؟ چ عەیب وعارێ هەیە لە گۆڕێ. وتیان: نەخێر مەسەلە عەیب وعار نیە، مەسەلە ئەوەیـە کاکی خۆم زەمـانێکی زۆر زۆر زوو تۆ لەوانەیە بیرت نەیـەت لە لەغـاوگـیرەی ئەودیـو پیـاوێکمـان ڕووت کردەوەو کوشتمان ناوی (خواکەرەم) بوو.. ئەوەندە بێ ئەقڵ بوو، لەکاتی گیان دەرچونیا سەیری کرد دوو کەو چینە دەکەن ئەویش هەر ئەوەندەی پێکرا وتی:

کەوەکان ئێوە شایەت بن وا ئەم دوو چەتەیە منیان کوشت ئاخر تووخوا کەو قەت بووە بە شاهیـد؟ بە قاقـای پێکـەنینـەوە دەسـتیـان کرد بە گۆشت کەو خواردن.. کاکـە ڕەشیش بە ئەسپایی چووە ژووری‌و برنەوە کوڵی باوکی لێ سیخناخ کرد لە فیشـەك و هەردوو زەلامی سارد کردەوەو هەنـاسـەیـەکی هەڵکێشاو ڕووی کردە ئاسمان و گوتی: بەخوا کەوەکان شایەتی چاك و ڕاستگۆ بوون. شایەتی هەق هەروا ئەبێ، ئیتر کاکەڕەش و مەنیـژ تەرمـەکانیان لەسەر پشتی ماین و ئەسپەکانیان ناو ڕوویان کردەوە دێیەکەی لالۆ خواکەرەم. هەموو ئاوایی هاتن بەپیریانەوە بوە شایی‌و زەماوەند شایەتی کەویش بووە داستانی سەر زاری خەڵکی.



ژ چیروکێن فلکلوری کوردی

# ئەفسانا.. خاتوینا کێتکا وچەند گوتنەك

غیاث الدین عەلی نەقشبەندی

خویندە ڤانۆ ... ئەڤ چیروکە ئێکە ژگەلەك چیروکا کو هاتینە بەرزەکرن ئان دگەل ڤەهوینەرێ خو بن ئاخ بوینە ئان ژی پشتی وان ب چەند چاخەکا بەرزە بووە .

قەمی مروڤ نەزانیت کا ئەڤ چیروکە لکی ژ چاخی هاتیە ڤەهاندن لێ ئەم دزانین کو هەتا نوکە دگەلەك مالا دا دهێتە ڤەگێران .

هەروەسا ڤێ چیروکێ چ رویدانێن وێ نابێژن کا ل کی ژ چاخی هاتیەگوتن و ناڤێن چ گوند و دەڤەرا تێدا نینن کو مروڤ بخو ب کەتە نیشانە دا دمێژویێ دا ب گەرییت و مێژوا وێ ب زانیت ب گورا جوگرافیا وێ دەڤەرێ وبەری چەندێ ئەڤ رویدانە هاتیە دی .

دیسان ناڤێ پالەوانێن چیروکی مروڤ ب دروستی نزانیت تنێ ناڤێ (گولبارینی) وهەندی من پسیار کری و ئەزل دویڤ چویم هەمیا یا گوتی ناڤێ وێ گولبارینە وئەو ناڤێن دی وەکی : دایکا گولبارینێ (بهار) و بابێ وێ (سیتو) من یێ ژهەندەك مروڤا وەرگرتین قەمی رێژا راستیێ گەلەك پاکێم بیت دگوتنا وان دا چونکی چ تشتێ نڤیسی نینە هەمی ئەوە یێ کو ژدایك وبابێن خو وەرگرتنی و قەمی ژبیرێ چوبیت وقەمی ل وێ دەڤەرێ نەژیاین لێ ئەم چ ب کەین مەئەڤ کارە ب گرنگی ڤە نە گرتیە ژبەر هندی گەلەك تێکست و ناڤەروکێن فلکلووری بەرزەبون و سوتن و دگەل ڤەهوینە رێن خو بن ئاخ بون . ژبلی ڤان سالێن دیماهیێ کو بەرێ گەلەك تورەڤانا یێ کەتیەڤ فلکلوری و یێن تێکستێن وی کوم دکەن ول سەر دچن و براستی ئەڤە کارەکێ پیروزە ئەو دکەن چونکی دیروکا مە پاکەڤن ب پێشکەفتنا مەدپارێزیت .

بێ گومان ئەفسانا خاتوینا کێتکا ل چاخێن کەڤنار هاتیە ڤەهاندن و هەتا نوکە د هێتە گوتن . گەلەك تشت دڤێ چیروکێدا هەنە ل ناڤ تورێ بیانیا ژی هاتیەلێ ب شێوەکێ دی ئەوژی ب گورا گوهرینا جیوگرافی ورەنگێ ژیانا وان، دئەفسانا خاتوینا کێتکادا هاتیە: کو پیرەڤی.. ئان سحرباز ب لینکا دفرین و ئەوژی ئەز دبێژم یا ژهندێ هاتی کو هاتنوچون ل ناڤ ریکێن سەخت و چەل وچیا یاب تالی بو ژبەر هندێ خەونا وان یامەزن ئەو بو کو تشتەکێ وەسا هەبیت پێ ب فرن و ژخەلکێ دی دجودابن. وەکی وێ پاهاتی د فلکلورێ گەلەك وەلاتێن روژئاڤادا کو سیحرباز و پیرەڤی ب جەریفکا دفرین و جەریفکێن وان د دەستك درێژن، سیحرباز دا لێ سیاربن وپێ فرن و ل گەلەك ژێدەرا من دیتیە کو فرین خەونەکا دویر بو ل نك وان.



خویندەڤانۆ... بێگومان تورێ مە و فلکلورێ مە چ ژیێ وان کێم تر نینــە لوپـا ئەوان هەر زوی یادەست هاڤێتیێ یێ کومکری و شروڤە کری وەمن ب خو گەلەك فلم دیتینە رویدانێن وان سەرەنجــا من یا راکێشــای چونکی ئەو رویـدان گەلەك دنێزیکی فلکلورێ مەنە لێ ئەوان ئەڤ فلکلورە یێ فەرمان بەر کری وکارێ تێدا کری، گەلەك دبێژن کو ئەو لینك ڤروکەبون ژستێرێن دن هاتینە وئەو مروڤ بون دگەل مروڤێن ڤی خاکی تێکەل بوینە وەچکی دپەرتوکێن (انیس منصور)ێدا هاتی.

هەروەسا ئەڤ چیروکە رەفتارا دروست نیشا بچویکی د دەت کو مننەتە هەلنەگریت چونکی چیا دەیکەکا بێ مننەتە یا هەمیــا نە ونیشا ددەت کو ب جوانیو ناسکی رەفتارێ دگەل ئاژەلا ب کەت هەکە دێ وەکی خالەتا گولبارینێ لێهێن؟.

چیروکـا فلکلورێ کوردی ب چ رەنگا ڤە نەچویە دناڤ جیهانا ئەسمانیدا چونکی وەکی هەمی مروڤایێ ژ ئەنجامێن وێ ترسیای و نەوێریایە ب چ رەنگا بەحسێ وێ ب کەت ژبەر رویدانێن سروشتی کو هەردەم جهێ ترسێ بونە ل ناڤ هەمی مروڤا ل چاخێن کەڤنار وەکی بروسی، گرگرا ئەسمانا، شەق بونا ئەردی ولەرزینا وی، بورکان ئەڤە هەمی یێ ب جیهانا ئەسمانا ڤە گرێداین هەر وەچکی دنەفسانێن کەڤن دا هاتیە وییێن گەلەك ملەتا.

ڤە هوینەرێن ڤێ ئەفسانێ یێن چوینە دەرگەهێ ژیانا بن ئەردی وەکی هەکو بهار دچیتە دبن ئەردی ڤە وپشتی بێهنەکێ ورێکەکا سەخت دبن ئەردی ڤە... ئەسمانی دبینتەڤە، روناهیێ دبینتەڤە هەروەچکو دگەلەك فلیمێن ئەمریکیدا هاتیە دیارکرن فلیمێن هزر و بیرێن زانستی. چەوا بهارێ روناهی دیتەڤە پشتی تارستانەکا حوتم؟.

دیسان ئەڤ ئەفسانە دیاردکەت کو ئەو خاتویتنێن کێتکا سێپــەری بون و یاخو دکەسەتیا کێتکادا ڤەشارتی (التقمص بالشخصیە) چونکی ژکێتك د بنە کوتر و پاشی د بنە پەری و وان دزانی کو حالێ بهارێ یێ شرە و مێرێ وێ یێ فەقیرە چونکی دچیروکێدا نەهاتیە کو بهارێ حالێ خو بوگوتبیت.. ڤەمی ئەوە کو ئەو جیهانا سەر عەردی دبینن و هەکە دەست کارێ تێدا نەکەن چونکی ئەوان چاڤێن بهارێ چێکرنەڤە و ئەوان پەسنێن خو یێن باخوسی دانە گولبارینێو دگەل بهارێ راوستیان دەما بچویك دبو...

خویندەڤانۆ.. ژبەر گرنگیا ڤی کاری ئەز نەوێریام پتر ل سەر بچم نەمازە ئەز دزانم کو کومکەرێ فلکلوری یێ ژ لێکولەر و شروڤەکەری جودایە.. وئەڤە نە هزروبیرێن منن ل سەر ڤێ

چێروکێ و نابنــە بریــارێن دیمــاهیێ قەمی هەبن ل سەر ڤێ چەندێ بچن ژ من چێترو کوپرتر.

## ● خاتوینا کێتکا ●

★ جارەکێ ژجارا رەحمە ل دایك و بابێن گوهدارا... دبێژن: دو خویشك هەبون ئێکێ ژوان شوی ب میرێ وەلاتی کر ویادی شوی ب گاڤــانێ گونـدی کر.. وەهەر ئێك چو سەر رزقێ خو. بێ‌گــاڤان چ ناڤ مالی نەبو (کوریا مشکی ل مالا وان ب ئار نەدکەفت) وەکە روژەکێ نەچوبا شولی وێ روژێ دا ژبرسادا مریت.

روژەکێ دلێ کابانیا گاڤانی چو گوشتی چونکی مەهبیران دبــرن هزرا وێ بو خویشکــا وێ چو بەری هەمی کەسەکی چونکی ژنا میرییە واربو قەستا ویرێ کر دیت خویشکا وێ یا ل سەر تەخــتــەکــی وسێ خدام بێ ل بەر دەســتــێ وێ دراوستیاینە.. بهارێ سلاڤ کرە خویشکا خو.. لێ‌خویشکا وێ بەرسڤەك سار لێ ڤەدا. بهارێ سەرێ خو برە بن گوهێ وێو گوتێ :ـ خویشکێ دلێ من بێ دچیتــە گوشتی... ماتــونزانی؟ ئەزیا مەهبیرانا دبەم؟.

خویشکا وێ ژی ب سەری دڤنێ گوتە خدامەکێ :ـ وەرە برتەکا (دیدکێ)[1] باڤێژە بەر ڤێ بەلەنگازێ‌دا ژڤێرێ بچیت و ل سەر سەرێ مەنەکەتە قەرەبالغ.

دەما بهارێ ئەڤ قەسە گوهـ لێ بوی تژی چاڤێن وێ رونـدك بون وریکــا خو گرت ژویرێ دەرکەفت و ددلێ خو دا دگوت :ـ ئەز دێ چمە چیای بخو (کویزرکێ)[2] ژیڤەکەم چێترە ژڤی گوشتێ هو بێ ب منەت.

بهار چو مال پارزینکێ خو هاڤێتە پاش پێلا خو وقەستا چیای کر گەلەك بێ نەچو پارزینکێ خو تژی کویزرك کر. ل هاتنا ڤە چاڤی وی چو بنەکێ کویزرکا رێ دلێ وێ گەلەك چویێ و ددلێ خودا گوت :ـ



ئەز دێ چم بنێ هەنێ ژی ژیڤەکەم ودێ چمەڤە، چیخنێ خو داینو هەلشکافت دیت بنێ وی بێ خلولەیە و دیرگەهەکێ ئاخ دگــەل رابــو بهــارێ هێڤ کرێ کو بنێ کویزرکێ بێ ل سەر حەلانەکی... وێ ژی ئەو حەلان راکر دیت کونەکا تاری لێ دیار بو، سەرێ خو بدە هنداڤ.. دیت پێسترکەك یا پێڤە.. بهار ب پێسترکێ داچو هەتا گەهشتیە بنی دیت کونەکا دی یا تێدا یا تەنگ و تاری.... سەرێ خو برە دوێ تارستانێ داو تێدا چو دەمەکی چو دبەرا و پیخرا هەلنگڤ دیت کونەکا دی یا تەنگ هاتە بەر ددلێ خودا گوت :ـ ئەز هەر یاهاتیم دڤێت ئەز بچم هەتا دیماهیێ ب کوتەك خو دوێ کونێ رابر وهێدی هێدی فرهە بو دیسان گاڤەکێ چو شرشرا ئاڤێ هاتێو روناهی دیتەڤە بەرەڤ روناهیێ چو دیت قەسرەکا سپی یا مەزن یا ل سەر گرەکی و دار و بارێن رەخێ قەسرێ وەکی داروبارێن وی جهی نەبون یا ژێ

عارەبی، خۆی لەخۆیدا لە چاو زمانە بیانییەکان بەتایبەت لەم رووەوە هەژارو دەست کورتە...! چ جای زمانی کوردی...! بۆیە پێشەکی دەڵێم ئەگەر کەم و کوڕی و لاوازی پێوە دیار بێ، ئەوا لێم ببورن...

ئەوەی شایانی باسە، تارادەیەك باسی زاراوەی فۆلکلۆر بە کوردی کراوە، ئەویش زۆر بەکورتی، یان بە چەند دێرێك راو پێناساندنەکانی زانایانی ئەم مەیدانە باس کراوە؛ بەڵام وابزانم وا بەفـراوانی لەمـەوپێش نەکـراوە... چونکـە ئەم وەرگـێڕانە پوختەی ـ خلاصة ـ زادو بیرو لێکدانەوەو شیکردنەوەی کۆمەڵە زانایێکە، کە «ئیکە هولتکرانس»، پاش بیرو لێکدانەوەی وردی خۆیی و هەڵسـەنگـاندنیان، دوو بارە دایڕشتۆتەوە.. هەروەها شایـانی سەرنجـە، ئەم فەرهەنگە نزیکەی ـ ٥٠٠ ـ لاپەڕەی قەبـارەی گەورەیـەو پشـتـی بە ـ ١٣٠ ـ زانـاو پسپـۆرە بەناوبانگەکانی مەیدانی ئەتنۆلۆژیاو فۆلکلۆر بەستووە.

ئومێـد دەکەم خوێندەوارە خۆشەویستەکان سوودی لێ وەرگرن.. سوپاسیش لە منەوە... م. حیدری].

★★★

فۆلکلۆر کەلەپـووری گیـانیی میللەتـە، بەتـایبـەت کەلەپووری زارەکی، هەمیسان ئەو زانستەیە کەلە کەلەپوور دەکۆڵێتەوە.

وامان بە باش زانی ـ لەبەر چەند هۆیەکی کردەوەیی ـ بیکەین بە دوو بەش:ـ

١ـ ئەوەی لە بابەتەکانی فۆلکلۆر دەکۆڵێتەوە.

٢ـ ئەوەی لە زانستی فۆلکلۆر دەکۆڵێتەوە.

**بەشی یەکەم :**

## بابەتەکانی فۆلکلۆر

فۆلکلۆر کەلەپـووری گیـانیی میللەتـە، بەتـایبـەت کەلەپـووری زارەکی. ئەم پێنـاسـاندنە لەگەڵ راسپاردەکانی نوێنەرانی کۆنگرەی ئەرنهایم Arnhem لەهۆڵەندە، ساڵی ١٩٥٥ یەك دەگرێتەوە. کە لەگەڵ رووکاری زانستی فۆلکلۆر دەگونجێ. یان بڵێین ئەو رێگایەی ئێستاکە پەیرەو دەکرێ. راستییەکەی ئەم زانستە گۆڕانی بەسەردا هاتووە، پاش ئەوەی ویلیام جۆن تۆمـز Thoms ، بۆ یەکـەم جار لە سـاڵی ١٨٤٦ ئەم زاراوەی دارشت... فۆلکلۆری وا ناسـانـدووە کە: «چـەند بیرو باوەرو ئەفسانەو داب و نەریتی باو ـ ی نێو خەڵکی سادەیە». واتە: «شێوە رەوشت و داب و نەریتەکان، ئەوانەی کۆمەڵانی خەڵك رەچاویان دەکات و شتی پرووپووچ و گۆرانییە میللییەکان و پەنـدی پێشینـان... هتـد، ئەوانـەی بۆ سەدەکـانی رابردوو دەگەڕێنەوە». ئەوە وا دەگەیێنێ، کە «تۆمز» فۆلکلۆری بە بەشێك لە رۆشنبیریی میللی لە قەڵەم داوە. کە خۆی لە کەلەپووری کۆن دەنوێنێ. دەبینین تۆمز گیانی رۆمانسییەتیی سەردەمی خۆی کاری تێکردووەو مەسەلەی داب و نەریتی سەیرو شتی پرو پووچ گرنگی پێداوە، تا ئەو سەر دەمە: «بەناوی شوێنەواری کۆنی باو» دەناسرا. ئەو تێگەیشتنە لە بارەی فۆلکلۆرەوە، دوا بە دوای ئەو کاتـە بووە هۆی گفتـو گۆیەکی درێژ خایەن لەمەر چەمکی ئەم زاراوەیەو ئەو جیاوازە گەورانەی لە ناساندنەکاندا، کە تا ئەمڕۆکەش هەر بەردەوامە. هەر ئەوەش لە پەیوەندیی ئاڵۆزی نێوان ئەتنۆلۆژیاو فۆلکلۆر بەرپرسیارە.

دەتـوانین، پێناساندنە جیا جیاکانی فۆلکلۆر کە لێرەدا باسیـان دەکـەین، بۆ چەند بەشێکی سەرەکی بەم شێوەیەی خوارەوە رێکیان بخەین:ـ

**یەکەم :** فۆلکلۆر پاشماوەکانی رۆشنبیریی

کۆنی لەمەوپێشی شارستانییەتە، یان پاشماوەکانی لە فۆلکلۆر پاشمـاوەکـانی رۆشنبـیریی ژینگـەی شارستـانییە نوێیـەکـانـە... ئەم پێنـاساندنە زۆر لەو واتایەی کە «تۆمز» مەبـەستی بوو نزیـك دەبێتـەوە.. بەڵام ئەنـدرو لانگ Alang زیاتری سەلماند، کە زانستی فۆلکلۆر، بریتییە لە لێکۆڵینەوەی پاشماوەکانی رۆشنبیریی تا ئەم رۆژگارەش تووشی ئەم بیرۆکەیە دەبین.. بەم شێوەیە دەبینین ڤارانیاك Varagnac دەڵێ:ـ بابەتی راستەقینەو رەوای لێکۆڵەرەوەکانی فۆلکلۆر ئەوەیە: «ئەو بەشەی لە رابردوو ماوەتەوە کە ناوەرۆکی ئێستاکەیە..».

سەرەرای ئەوە چەمـکی فۆلکلۆر لای ئەو بریتیـیـە لە لاسـاکـردنـەوەی میللیی شێوە زاراکانی ئۆرۆستۆکراتیانەی [شـارستـانییـەتی شوێنـەوارەکـان] و رەگـەزە کۆنەکان، تا رادەیەکیش [شارستایەنییەتیی لاساکردنەوە]. بەڵام تیۆدۆرو پۆلۆس Teodoro Pulos وای دەبینێ کە: «فۆلکلۆر تەنیا بریتییە

لە پاشماوەکانی لەبن نەهاتووی داهێنانی میللی، بەشێکە لەو کانی‌یە دوورەی کە هەردەم لە یارمەتی دانمان وشك نابێتەوە».
هەمیسان ئەو پێناساندنانەی خوارەوە، کە لە فەرهەنگی فونگ ـ ی لەمەڕ فۆلکلۆر وەرگیراون بەراورد بکە. Standard Dictionary : کە «مـێش ـ Mish » بەم جۆرە فۆلکـلۆر دەنـاسـێـنێ کە: «قەوارەیەکی تەواوی بیرو باوەڕو داب و نەریتی لاساکردنەوەی میللی‌ی کۆنە»... ئەوانەی تا ئەم ڕۆژگارەمان ماونەتەوە لە نێوان ئەو رەگـەزە کەم خوێندەوارانەی کۆمەڵگە شارستانی‌یەکان.. «پوتێر ـ یش: Poter » دەڵێ: «فۆلکلۆر ئەو کۆڵینە زیندووانەیە، کە نایانەوێ بمرن».

دووەم :

فۆلکلۆر ئەو بەشە لاساکەرەوەیە لە ڕۆشنبیرێتی‌ی میللی [بە راوردی بابەتی کەلەپوور بکە] ئەم پێناساندنە وا دەژمێرێ، لەوەی پێشـوو راست کراوەتـەوە.. کە «لیموان Lemoine » لە ساڵی ١٨٩٢ پێش کەشی کردووەو، دەڵێ: فۆلکلۆر بریتی‌یـە لە هەموو ئەو شتانەی کە میللەت لەڕێگای کەلەپوورەوە دەیزانێ، ئەویش کەلەپـووری چاخـەکـانـی رابـردووە». لەگـەڵ پێناساندنەکانی بالیس Balys و هارمۆن Harmon و تایلور Taylor و تومپسون Thompson و ڤۆگلین Voeglin ، ئەوانەی لە فەرهـەنگی فونکی فۆلکلۆر هاتـون بەراوردیان بکە. بالیس وا دەبـینێ: کە «فـۆلکلۆر داهێنـانی میللەتـانی سەرەتـایی‌و شارستـانی‌یـەت خواز بەبێ جیاوازی دەکرێتەوە. تایلوریش دەڵێ: «فـۆلکلۆر لەو بابـەتانە پێك دێت، کە بەلاساکردنەوە لە وەچـەیـەك دەگـاتـە وەچەیەکی دیکە، بێ ئەوەی بخرێتە پاڵ داهێنـەرێـك، یان دانەرێکی دەست نیشان کراو». ئەم چەند پێناساندنە دەمانگەیێنێتە ئەم بۆچوونانەی خوارەوە:ـ

سێیەم :ـ

فۆلکلۆر ئەو زاراوە فراوانەیە، بگرە نیشانەی ئەو کۆمەڵە دیـاردە لاسـاکـردنـەوانـەیـە، کە لە نێـوانیـاندا راستی‌یەك کۆدەبێتـەوە، ئەو راستی‌یـەی زیـاتـر لە دیاردەکانی دیکەی کۆمەلایەتی، یان ڕۆشنبیرێتی‌ی لەمەڕ ڕۆڵی کەلەپوور دەر دەبڕێ.

ئەم پێناساندنە جیاوازی‌یەکەی لەوە دایە، کە نیشانەی رەنگ دانەوەی ڕووکارەکانی تۆمز دەنوێنێ. ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکـات کە تاچ رادەیـەك کەلەپووری زانستی ئەوەی دەست نیشان کردووە، کام لە بەشەکانی ڕۆشنبیرێتی‌ی پێویستە بە فۆلکلۆر دابنێین. ژمارەیەك لەم چەشنە پێناساندنانە ئەوانەی لە فەرهـەنـگـی فونکی فۆلکلۆر هاتـوون، دووبـارە دەوریـان دەکـەینـەوە. [وەك پێنـاسـاندنەکانی: «گاستر ـ Gaster » و «جیمسـون ـ Jameson » و «مـاك ئیدوارد لیچ ـ Leach » و «تۆمپسۆن».. لێرەدا دەتوانین دەقەکەی تۆمپسۆن بهێنینەوە کە دەڵێ: «فـۆلکلۆر بریتی‌یـە لە سەماکردن، گۆرانی، هەقایەت، شتی پڕوو پووچ، ئەفسـانـە Legends ، داب و نەریت، بیرو باوەڕ، پەندی پێشینانی گەلان، ئەویش بە گوێرەی هەموو شوێنێك».

هەمیسـان داب و نەریتی کۆمەلایەتی، هەندێ کاری ڕۆژانە، خان و بەرەو کەل و پەلی ماڵەوە، تاد... ئەم شتانەی دوایی لە کۆمـەڵی خوێندەوار ـ واتە پێشکەوتو، «م.ح» ـ بە بابەتەکانی ڕۆشنبیرێتی ناژمێردرێ... [بەراوردی ئەوانەی دادێ بکەن] لەو پێناساندنانە پێناساندنی کراپ Krappe دەهێنینەوە: «فۆلکلۆر بریتی‌یە لە چوار چێوەی ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە لە کەلەپووری میللی‌ی تۆمار نەکراو دەدوێ، ئەوەی لە ڕۆمان، داب و نەریت، بیرو باوەڕی جادوگەری‌ی میللی دەر دەکەون...» ڤارانیاك دەڵێ: «فۆلکلۆر چەندەها بیرو باوەڕی کۆمەڵی‌یە، بێ ئەوەی بنەرەتێکی تیـۆریی ڕروتی هەبێ...، چەنـدەها کارو کردەوەی ڕۆژانەی کۆمـەڵی‌یـە، بێ ئەوەی تیـۆری هەبێ. بۆدکەر Bodker دەڵێ: «فۆلکلۆر ئەو زانستەیە کە لەو لایەنەی شارستانی‌یەت دەدوێ کە پێ‌ی دەڵێن میتـۆلۆژیـا [داستـانی پڕوو پووچ] Myths ، ئەفسـانـەکـان Legends ، هەقـایـەتـەکـان، مەتـەڵەکـان، گۆرانی‌یەکان، پەندی پێشنیان، شانۆگەری، یاری‌یەکان، سەما کردن، بیرو باوەڕە میللی‌یـەکـان، ئەوەی شایانی باسە، بەشە گەورەکەی لەم کەلەپوورە، بە ڕێگای زارەکی بڵاو دەبێتەوە». فەرهـەنـگـی ویـبستـێر Webster دەڵێ: «فـۆلکلۆر زانستی لێکۆڵینەوەی داب و نەریت و بیرو باوەڕو شێوەی لاساکردنەوەی تایبەتە بە میللەتێکی دەست نیشان کراو».

## چوارەم :

فۆلکلۆر بریتی‌یە لە ئایینێک کە گەیشتۆتە حاڵەتێکی رووچوون ـ نزمی ـ إنحطاط ـ هەر چەند کورات G. Kurath لە بنەرەتەوە لەگەڵ پێناساندنەکەی لەمەوپێش رێك دەکەوێ؛ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێ: «تەسکترین پێناساندنی فۆلکلۆر لە چوار چێوەی پاشماوە لێڵەکانی داب و نەریتە ئایینی‌یە کۆنەکان دەمێنێتەوە، ئەوەی تا ئێستا کە پەیوەستە بەژیانی نەخوێندەوارو پاشکەوتووەکان». ئەم لێکدانەوەیە جێگەی گومانە لەمەڕ پێناساندنەکەی «تۆمز» لەبارەی زاراوو ئەو رووکارانەی کە بە دوای زانستی فۆلکلۆر هاتن.. هەر چەندە هەندێ لە لێکۆڵینەرەوەکان، لەوانە «کراپ» ئایینی میللی بە بابەتێکی سەرەکی‌ی مەیدانی فۆلکلۆر دەزانن.

## پێنجەم :

فۆلکلۆر، واتە هەقایەتەکانی میللی، «لیومالا ـ Luomala» راست دەکات، کە دەڵێ: «زاراوەی فۆلکلۆر هەندێ کات، کۆمەڵێك لەو چیرۆکانە دەگرێتەوە، کە بە چاکی لە میتۆلۆژیا جیا ناکرێنەوە». هەروەها دەگوترێ: «گێرەرەوە سەرەتایی‌یەکان، میتۆلۆژیا بە هەند هەڵناگرن». ئەم پێناساندنە زۆر لەوەی دادێ نزیك دەبێتەوە.

## شەشەم :

فۆلکلۆر لەبنەرەتدا بریتی‌یە لە ئەدەبیاتی میللی، بەشێوەی زارەکی بڵاودەبێتەوە. زانا ئەتنۆلۆژیا ئەمریکاییەکان، ئەوان بابەتی ئەم مەیدانەیان بەم شێوەیە تەسك کردۆتەوە، بابەتەکانی رۆشنبیریتی بە پێی پەیوەندی‌یەکانی ناوەوەی رۆشنبیریتی بە چەمکێکی فراوان رێکیان خستوون. فەرهەنگەکەی «فونکی» فۆلکلۆر لەم بابەتە پێناساندنانەی لە ئامێز گرتووە. [لەوانە، پێناساندنەکانی: «باسکۆم ـ Bascom» و «فۆستێر ـ Foster» و «هیرسکۆڤیتس ـ Heroskovits» و لیومالا، و سمیس و فۆگلین، و «وترمان Waterman». لەمەر تەسك کردنەوەی پێناساندنی فۆلکلۆر بەم شێوەیە لەلایەن «هیرسکۆڤیتس»ەوە، بووە هۆی ئەوەی گفتو گۆیەکی گەرم و گور بەرپابێ. هەر چەند لە رۆژگاری ئەمرۆماندا، زاراوەی وەك: «ئەدەبیاتی نەنووسراو»، یان «ئەدەبیاتی سەرەتایی» ـ میللی ـ، لە دەزگاکانی ئەتنۆلۆژیا زیاتر لە زاراوەی فۆلکلۆر باوە. سمیس Smith زاراوەی «بابەتەکانی گوتن» زیاتر پەسند دەکا.. باسکۆم ـ یش دەربرینی: «هونەری گوتن» زیاتر پەسند دەکا.. باسکۆم دەڵێ: ئەو زاراوەیەم پێشنیار کردووە، بۆ ئەوەی «لە هەقایەتەکانی میللی‌و داستانە پرووپووچەکان و ئەفسانەو پەندی پێشینان و شێوەکانی دیکەی ئەدەبیات کە دەچنە خانەی چەمکی فۆلکلۆرەوە لەیەکتری جیا بکرێنەوە». بەڵام زانا ئەتنرۆبۆلۆژیاییەکان لە ژێر چەند سەر دێرێکی دیکە ریز دەکەن .

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەلایەن خودی فۆلکلۆر پەروەرەکان مەیلی لە باوەش گرتنی ئەم پێناساندنە دەکەن زانای ئەمریکایی «utley» فۆلکلۆر بەم جۆرە دەناسێنێ: «ئەو ئەدەبەیە کە لەسەر زاری خەڵکەوە بڵاودەبێتەوە». تۆمپسۆن، وا هەست دەکا، کە زۆربەی زاناکانی فۆلکلۆر لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا «بەلای ئەوەدا دەچن؛ کە فۆلکلۆر تایبەتە بە ووشەی بێژراو ـ گوتراو ـ. شتێکی ئاسایی‌یە، ژمارەیەکی زۆر بەرهەڵستی ئەم پێناساندنە دەکەن، لەوانە بەتایبەت «بایارد ـ Bayard»، لە ئەوروپا هەندێ لێکۆڵەرەوە، وەك: «کرۆن ـ Krohn» و «ڤۆن سیدۆڤ Von sydow»، گەیشتۆنەتە ئەو بروایە، کە فۆلکلۆر بە پلەی یەکەم بە ئەدەبی میللی دەژمێرن.. ئەم پێناساندنەش بە شێوەیەکی سەر بەخۆو پەیوەندی بەهاوکارە ـ زملاء ـ ئەمریکایی‌یەکانەوە نی‌یە.. بگرە لە ئەوروپا بەگشتی چەمکی لەوە فراوانتر بۆ فۆلکلۆر بەکار دێنن.

## حەوتەم :

فۆلکلۆر بەگشتی ئەو رۆشنبیری‌یەیە ـ ثقافة ـ کە لە رێگای زارای خەڵکەوە بڵاوبوویەتەوە. ـ کەلەپووری زارەکی ـ «گایدو ـ Gaidoz» لە دوانەکەیدا ساڵی ١٩٠٧ لە بارەی فۆلکلۆرەوە، ئاشکرای کرد: «لێکۆڵینەوەی گیروگرفتەکان و کەلەپوورو، داب و نەریت و، شتی پروو پووچ و، ئەدەبی میللی هەمووی بریتی‌یە لە لێکۆڵینەوەی کەلەپووری زارەکی، ئەوەش بە مەبەستی گەراندنەوەی بۆ پێناسە راستە قینەکەی». لە لێکۆڵەرەوە تازەکانیش، ئەم پێناساندنە پەسند دەکەن. لەوانە: «بۆتکین ـ Botkin» و، «ئیسپینۆزا ـ Espinosa» و، «هیرزوك ـ Herzog»... لەم بارەیەوە تەماشای فەرهەنگی فونکی فۆلکلۆر بکە.

**هەشتەم :**

فۆلكلۆر: رۆشنبیری‌ی میللی‌یە، واتە، فۆلكلۆر لە دیاردەكانی رۆشنبیریتی‌ی میللەت و. شارستانی‌یەت دەكۆلێتەوە. «ڤان گینپ ـ Vari Gennep » لە ساڵی ١٩٢٤ ئاشكرای كرد، كە فۆلكلۆر«زانستێكی ئاوێتەیی‌یە بەتایبەتی لە جووتیارەكان و ژیانی لادێی‌ی دەكۆڵێتەوە، هەروەها لە ژینگەی پیشەسازی‌و شارستانی‌یەكاندا». هەمان ئەم پێناساندنە «كۆرسۆ ـ Corso » و «سانتیف ـ Saintve » پێشكەشیان كرد ... سانتیف وای بۆ دەچێ ، فۆلكلۆر :"لە ژیانی میللی لە وولاتێكی شارستانیدا دەكۆڵێتەوە.. مەبەست لەو پێناساندنانە ، ئەو بەشە تەقلیدی‌یە كۆمەڵگەی ئەوروپایی‌یە ، كە تۆمز بە دەستی‌یەوە ئازاری دیوە ، ئەو كاتە گوتویەتی : فۆلكلۆر لە كەلەپووری چینەكانی ژێرەوە دەدوێ ... هەر ئەمەش بۆوەتە هۆی ئەوەی كە ئەم جورە پێناساندنانە بە زۆری ئەورووپاو ژاپۆن بە خۆیان بگرنەوە ، چونكە لەم دوو شوێنەدا كۆمەڵگەی فرە جۆری سەرەوەو ژێرەوەی تێدایە .

بەڵام ئیریكسۆن یەكەم كەس بوو كاری تێكرد ، كارتێكردنێكی ئەوتۆ كە تارادەیەك چەمكەكانی ئەمریكایی لە بارەی فۆلكلۆرەوە بڵاو بكاتەوە .. ئاماژەی بۆ ئەوە كرد ، كە ئەتنۆلۆژیای هەرێمایەتی ، یان هەندێ جار لێكۆڵینەوەی ژیانی میللی بە فۆلكلۆر لەقەڵەم بدا. هەروەها دەبینین ستیس تۆمپسۆن لە كۆنگرەی فۆلكلۆر، كە لە بلومنگتون ساڵی ١٩٥٠ ساز درا، دەدوێ: «من تەنیا كەس نیم حەز لەوە بكەم مانا بەخشی‌و نیشانەی ووشەی فۆلكلۆر بەو جۆرە فراوان بكرێ، تا ئەو شێوە لێكۆڵینەوانەی رۆشنبیریتی‌ی مادیش بگرێتەوە.. ئەوەی لەدەمی ئیریكسۆنمان بیست ـ لەوانەیە ئێستاكێ ئەوە پەسند نەكرێ، كە چەمكی فۆلكلۆر فراوان بكرێ، ئەویش لەبەر پەیوەندی‌ی ئاڵۆزكاوی نێوان ئەتنۆلۆژیاو [ئەنترۆ پۆلۆژیا]و فۆلكلۆر لە وولاتە یەككرتوەكاندا ـ ئەمریكا ـ لە سەرێكی دیكەوە سەرنج دەدەین، دەبینین، «باربو ـ Barbeau » لە ـ كەنەدا ـ ئەم چەمك فراوانەی فۆلكلۆر بەكار دێنێ، هەروەها هەندێ لە هاورێكانی لە ئەمریكای لاتین پەیرەوی دەكەن.

پاش ئەو پێداچوونەوەیە بە پەلەیە لەمەر واتای ووشەی فۆلكلۆرەوە، سێ كۆمەڵی گەورەی پێناساندن دەست نیشان دەكرێن. ئەوانە هەموویان [واتە هەر سێ كۆمەڵەكە] پشتیان بە كەلەپوورێكی زانستی تایبەت، یان بە باروكاتێكی مێژوویی ناوەخۆیی دەست نیشان كراو دەبەستنەوە. لەوانە

**یەكەم :ـ** ئەو بیرەیە دەڵێ: فۆلكلۆر، كەلەپووری رۆشنبیریتی‌ی‌و بەتایبەت لە هەندێ مەیداندا دەنوێنێ.. ئا ئەمە ئەو میراتە راستەقینەیە كە تۆمز بۆ ئێمەی جێهێشتوە... هەروەها بیرۆكەیەكی دیكە دەڵێ: پێویستە فۆلكلۆر تەنیا بە ئەدەبی میللی بەندبێ.. ئەوەش رای زاناكانی ئەنترۆپۆلۆژیای ئەمەریكایە، كە فۆلكلۆر بە رۆشنبیریتی‌یەوە بەند دەكەن. [لەگەڵ باری سەرنجمان لێرەدا، ئەم چەمكەی دوایی كەمتر ئاڵۆزترە لە هی لەمەوپێش. دوایی‌یەكەی: فۆلكلۆر وا نیشان دەدرێ، كە سەرچەمی رۆشنبیریتی‌ی میللی‌یە، بۆ ئەوەی لە رۆشنبیریتی‌ی چینەكانی سەرەوە جیا بكرێتەوە. ئەم بیروباوەرەیش بە ئاسانی لە ئەوروپادا لەمەر فراوان كردنی بەكار هێنانی پێناساندنەكەی تۆمز نەشونەمای كرد.

ئەندامانی كۆنگرەی ئەرنهایم ـ ئەوەی لەمەو پێش باسی كراوە ـ بریاری‌دا لێكدانەوە دوایی‌یەكەی فۆلكلۆر رەت بكاتەوە. بەڵكو كۆنگرە هەر دوو پێناساندنەكەی پێشو بە یەكتریان ببەستێتەوە. لە راسپاردەكانی‌دا هاتووە: «پسپۆرەكان لە سەر ئەوە رێك كەوتن، كە دەزگای ـ دەستەی ـ جیهانی‌ی هونەری میللی‌و فۆلكلۆر «CIAP » راسپێرن، زاراوەی فۆلكلۆر لە ئاستی جیهانی بەم جۆرە بێ :ـ فۆلكلۆر رۆشنبیریتی‌ی گیانی‌یە ـ ثقافة روحية ـ راستی‌یەكەی لە رۆژگاری ئەمرۆماندا ژمارەیێكی زۆر لە زاناكانی ئەتنۆلۆژیا، زیاتر لایەنی ئەم مانایە پەسند دەكەن، بەتایبەت زۆربەی پسپۆرەكانی ئەدەبی زارەكی».

## بەشی دووەم
## زانستی فۆلكلۆر

فۆلكلۆر ئەو زانستەیە، كە لە كەلەپووری گیانی‌ی ـ نامەتریالیزم ـی میللەت دەكۆڵێتەوە، بەتایبەت كەلەپووری زارەكی ـ سەرزار ـ. ئیسپینۆزا و كراب لەپێشەوەی ئەو زانایانە بوون، مەسەلەی رێكخستن و مەیدانی ئەم زانستەیان ناساند. ئیسپینۆزا دەڵێ: «زانستی فۆلكلۆر، ئەو لقەیە زانیاری مرۆڤایەتی لە بابەتەكانی فۆلكلۆر بەشێوەیەكی زانستییانە كۆیان دەكاتەوەو، رێكیان دەخاو لێیان دەكۆڵێتەوە. ئەوەش لە پێناوی شی كردنەوەی ژیانی گەلان و رۆشنبیریتییان بە درێژایی

چاخەکان».

کراب دەڵێ: «مەیدانی فۆلکلۆر دووبارە کردنەوەی بینای وێنەی مێژووی گیانیی مرۆڤە، ئەویش بەو شێوەیە نا کە لە کارو کردەو شاکارەکانی گەورە شاعیرو هونەرمەندو بیرکەرەوەکان، بەڵکو لەو دەنگە ساکارانەی میللەت خۆی دەنوێنێ». فۆلکلۆر؛ لێرەدا وا دەر دەکەوێ وەك زانستێکی مێژوویییە، ئەمەشیان لەلای ئیریسکۆن بەشێوەیەکی تەسك لەمەڕ چەمکی فۆلکلۆر بەراست دەزانرێ.. لەلای ڤاریناك بە چەمکی فۆلکلۆری بەراوردکاریی نێوان پرۆگرامی چەند هەرەمێك دەگرێتەوە. لەلای «شرینین ـ Shriinen » بەهیچ جۆرێك چەمکی فۆلکلۆری فەرمانبەرایەتی ناگرێتەوە.. لای «مارینوس ـ Marinus » بە فۆلکلۆرێتیی نوێ لەقەڵەم دەدرێ، تەنانەت دەبینین زانا کۆنەکانی فۆلکلۆر وەك «گۆم ـ Gomme »، بەشێوەیەکی ئاشکرا باسی ئەوەیان نەکردووە، کە گرنگیان بە مێژوو داوە. «گۆم» فۆلکلۆروا دەناسێنێ کە لێکۆڵینەوەیەکی سایکۆلۆژیی نیشتووەکانی مێژووییە، لەو ڕۆشنبیرییانەی تارادەیەك نوێیە. لەلایەکی دیکەوە سەرنج دەدەین، دەبینین تۆمز درووست کەری فۆلکلۆرە ساڵی ـ ١٨٤٦ ـ مەیلی بەلای مێژووییەوە ڕۆشن بوو.

فۆلکلۆر، لەسەرەتاوە درووست کردنێکی ئینگلیزی بوو، سەرەرای ئەوەی لەوانەیە ووشەی فۆلکلۆر وەرگیراوی ووشەی ئەڵمانی [فۆلکسکندە] ـ فۆلکلۆر ـ بوو بێ، کە لە ساڵی ١٨٠٦ هەبووە، ووشەکە لەو کاتە جێگیر بووە، کە «کۆمەڵەی فۆلکلۆر» ساڵی ١٨٧٧ لە لەندەن دامەزرا. کێشوەری ئەورووپا ـ لەسەرەتادا ـ چەند ناوێکی دیکەی، نەك زاراوی فۆلکلۆری پەسند کرد؛ بەڵام لەو وولاتانەی بە زمانی لاتین دەدوێن، ووشەی فۆلك ـ Folk» » میللەت بە ووشەی یۆنانی ـ دیمۆس ـ یان «demos » میللەت گۆرییەوە. فەرەنسە هەردوو زاراوەکەی «لێکۆڵینەوەی میللەت» demologie یان «زانستی دەروونی میللەت ـ demopsychlogie » پەیرەوی دەکرد.

[هەمیسان ناو نرا زانستی دەروونی مرۆڤ: «Anthro Pop- sychologie » تا «جایدو، سبیوت» لە هەشتاکانی سەدەی هەژدەمین هاتن، زاراوەی فۆلکلۆریان پەیرەو کرد.. تا رادەیەك لە هەمان کاتدا، ئیسپانیا زاراوی فۆلکلۆری زانی... کە لەوەپێش زاراوەکانی: demotechngrafia, demosofia, de- mologia [هەموویان مانای «لێکۆڵینەوەی میللەت» دەگەیەن][1] بەڵام لە وولاتی پورتەگالدا بۆ ماوەیەکی درێژ «براگا» «Braga » ووشەی «دیمۆتیکای ـ demotica » بەکارهێنا، کە بەرامبەرەکەی ووشەی فۆلکلۆر «دیمۆلۆژیا» و «سینسا دیمیکا» [واتە زانستی میللەت ـSienza DEMICA ] لەوولاتی ئیتالیا دەگرێتەوە. هەروەها زاراوە کۆنەکە، زانستی دەروونی میللەت « demo- psicologia »، ئەوەی «پیتری ـ Pitre » بە کاری هێناوە زاراوەکەی زۆر سەربەستانە ناساندو گوتی: بریتییە لە لێکۆڵینەوەی ژیانی مادیو گیانی گەلانی پێشکەوتووو پاشکەوتوو.. بەڵام زاراوەی فۆلکلۆر لە ئاخرو ئۆخری سەدەی رابردووو سەرەتای ئەم سەدەیە شوێنی هەموو ئەو زاراوانەی گرتەوە.

**قوتابخانەکانی فۆلکلۆر:**

قوتابخانەکانی فۆلکلۆر زۆر بوون، لە ئەنجامی جۆرەها لێکدانەوەی چەمکی فۆلکلۆرو ئامانجە جیا جیاکانیو پرۆگرامە پەیرکراوەکانی لە کۆڵینەوەدا...

لێرەدا بە کورتی باسی هەندێ ڕووکارەکانی لێکۆڵینەوەی هەقایەتی میللی دەکەین:ـ

* : قوتابخانەی ئەدەبی : [لەناسراوەکانیان «کۆسکان ـ Cos- quin » و «بینفی Benfey ]، ئەم قوتابخانەیە هەوڵی ئەوەی داوە، کە نەژادە هیندییەکەی هەقایەتەکانی میللیی ئەورووپایی بسەلمێنێ.
* : قوتابخانەی میتۆلۆژیا : [لە ناسراوەکانی، ماکس موللێر ـ max Muller » و «دی جو برناتیس De Gu bernatis » و «گاستۆن پاری - Gaston Paris ». ئەم قوتابخانەیەش وای بۆ دەچێ، هەقایەتە میللییەکان تەنیا نیشتووەکانی میتۆلۆژیای کۆنە، بەتایبەت ئەوەی بە سروشتەوە بەندە.
* : قوتابخانە ئەنترۆبۆلۆژیا «لە ناسراوەکانی: لانج و گایدو وبواس... هی دیکەن»: ئەم قوتابخانەیە ڕایەکانی هەر دوو قوتابخانەکەی لەوەپێش بە درۆ خستنەوەو، بنەرەتی ڕۆشنبیرێتیی هەقایەتەکانی میللیی ڕۆشن کردەوە.
* : قوتابخانەی داب و نەریت و نەقش، لەناسراوەکانی:

«راگلان ـ Rglan » و «هایمان ـ Hyman » و هی دیکەن...». ئەم قوتابخانە هەوڵی ئەوەیدا، کە نەژادی داب و نەریت و نەقشی هەقایەتەکان بسەلمێنێ.

* : قوتابخانەی مێژوویی‌و جوگرافیایی، لە ناسراوەکانی: «کرۆن ـ Krohn و «ئارنی ـ Arne » و تۆمپسۆن»، ئەم قوتابخانەیە بە فراوانی‌و پەرت و بڵاوی لە هەقایەتە جیا جیاکان دەکۆڵێتەوە.

* : قوتابخانەی شی‌کردنەوەی دەروونی‌ی [لە ناسراوەکانی: «رۆهایم ـ Roheim » و «لاگرکرانتس ـ Lagercrantz » هی دیکەن

* : قوتابخانەی فەرمانبەرێتی‌ی نوێ، ئەم قوتابخانەیە، لە هەقایەتەکان لە ژینگەی خۆیدا دەکۆڵێتەوە.

فۆلکلۆر، وەك زانستێکی سەربەخۆ جێگیر نەبووە، لەبەر سرووشتە ناگونجاوەکانی.. بۆ نمونە: دەبینین یەکێك لە زانا فۆلکلۆر پەروەرەکان، وەك سانتیڤ وای بۆ دەچێ، کە دەڵێ: «لێکۆڵینەوەکانی فۆلکلۆر دەبێ لە خانەی هەمە جۆری پسپۆرێتی‌ی بێ؛ ئەدەبی میللی بۆ زانای زمانەوانی بێ، بابەتەکانی ئایدۆلۆژی‌و ئایینی بۆ فەیلەسوف بێ، زانستەکانی میللی بۆ زانایان بێ، هونەرو پیشە میللی‌یەکان بۆ زانای تەکنەلۆژیا بێ.. هەندێ لەفۆلکلۆر پەروەرەکانی دیکە وەك: «شارلوت بیرنز ـ Burns » و «براتانیتس ـ Bratanic » وای پەسند دەکەن، کە زاراوەی فۆلکلۆر لە چوار چێوەی ئەو بابەتانە بێ، کەزانست لێیان دەکۆڵێتەوە. ئەوانە، ئەو بەکارهێنانە رەت دەکەنەوە، کە بەڵگەی خودی زانست بێ.. [لەم رووەوە، بەراوردی چەمکی ووشەی «مێژوو» بکەن، کە خودی ووشەکە ئالۆزیی پێوە دیارە.

گیروگرفتی سەرەکی لەبارەی چەمکی فۆلکلۆرە، وە بەوپێیەی زانستی لێکۆڵینەوەی فۆلکلۆرە، ئەوەیە بە گژا چوونی‌یەتی لەگەڵ زانستی ئەتنۆلۆژیای فراوان کە رێکخستنەکی پتەوو توندی هەیە، ئەوە لەبنەرەتەوە دەربارەی چەمکی دەست نیشان کراوی رۆشنبیرێتی تا پلەیەکی گەورە دەسورێتەوە. هەندێ لە زاناکانی فۆلکلۆر وەك کراپ، توانیان ئەو هێڵە جیاکەرەوەی نێوان هەردوو زانستەکە بدۆزنەوە. کراپ: کەلەپووری میللەتانی خاوەن رۆشنبیرێتی‌ی باڵا دەداتە پاڵ کەلەپووری میللەتە سەرەتایی‌یەکان. لەلایەکی دیکەوە، ئەتنۆلۆژی‌یەکان، فۆلکلۆر بەلقێکی زانستەکەی خۆیان دەزانن.. هەندێ لە فۆلکلۆرپەروەرەکان و ئەتنۆلۆژی‌یەکان، بە نوزە هەردوو ناوەکە لەواتا بەخشی‌دا هەردوو زانستە دەست نیشان کراوەکە بەکار دێنن. لەوانە: «کورزو ـ Korso » و «ئیریکسۆن» و «هۆیلر» و «فۆگلین» کە ئەم ریبازە پەیرەو دەکەن، بۆیە دەبینین هەڵوستەکە نەختێك پەشووکاوە.

لەم رووەوە ئەو چارەسەرەی بکرێ ئەوەیە، فۆلکلۆر بەزانستێکی سەربەخۆ بژمێرین... هەر وەکو «لیڤی شتراوس ـ Levi – Stauss » باری سەرنجی وایە: «لێکۆڵینەوەی فۆلکلۆر، بێ‌گومان بە ئەنترۆپۆلۆژیا بەستراوەتەوە، ئەوەیش لە رێگای بابەتی لێکۆڵینەوەکەی یان پرۆگرامەکانی، [لەوانەشە لە رێگای هەردووکیانەوە] تۆمپسۆن هەمان باری سەرنجی خۆی نیشان داوە. هەر وەکو کاجارۆڤ ـ Kagarov بەر لە «٣٠» سی ساڵ گوتوویەتی: دەتوانین فۆلکلۆر بەبەشێکی تایبەتی لە بەشەکانی فۆلسکندە کە بە مانای فۆلکلۆر دێ بە زمانی ئەڵەمانی بژمێرین.. لەو رۆژگارەماندا، ژمارەیەکی زۆر لە فۆلکلۆر پەروەرەکان، بە ئاشکرا دەڵێن:ـ فۆلکلۆر بەشێکە لە ئەتنولۆژیا جا ئەوئەتنولۆژیایە گشتی بێ یان هەرێمی.. لەم رووەود ئاماژە بۆ زاناکانی ئەمریکایی دەکەین، وەك: باسکۆم و جیمسۆن، هەروەها زاناکانی ئەمریکای لاتین، وەك: دی کارڤالۆنیتۆ... زانا ئەوروپایەکانیش، وەك: دیاس و براتانیتس. دیاس دەڵێ: «چۆن بە پسپۆری نوژدارو پسپۆری دڵ ناوی پزیشکیان پێ دەگوترێ، ئەوهاش دەبێ پێمان بگوترێ ئەتنولۆژی‌یەکان.

بەڵام راستی‌یەکەی ئەوەیە کە لە راسپاردەکانی کۆنگرەی ئەرنهایم ـ ی ساڵی ١٩٥٥دا هاتووە کە دەڵێ: فۆلکلۆر زانستێکی سەر بەخۆیە، هەروەها لقێکە لە لقەکانی ئەتنۆلۆژیا.

★★★

١ـ: شایانی سەرنجە، بەرامبەر ئەم سێ زاراوەیە، بەعارەبی‌یەکەی «لێکۆڵینەوەی میللەت» نووسراوە، کەچی لەوە زیاتر دەگەیەنێ، بەڵکو مانای لێکۆڵینەوەی داب و نەریت و سروشتی میللەت و چوار چێوەی جوگرافیش دەگرێتەوە. «م. ح»





# گەرانی مەیدانی
# البحث «یاخود» المسح المیداني

وریا ئەحمەد

دیارە ڕێکخراوێکی گرنگی جیهانی وەك «یونسکۆ» ڕۆڵی گرنگی فۆلکلۆری بە باشی بۆ ساغ بۆتەوە بۆیە لە (١٤ ـ ١٨)ی کانـوونی دووەمی ساڵی (١٩٨٥) بەڵگـە نامـەیـەکی نوێی دەرکـرد، [بـەڵگەنامەکە بریتی‌یە لە شێوە دراسەیەکی نیمچە تەواوی فۆلکلۆر] بۆ ئەوەی لە ئاینـدەدا لەبـەردەم لێژنەیەکی تایبـەتی (کەبۆ ئەم مەبەستە دادەمەزرێت) دابنرێت، تاوەکو ڕژێمێکی دەوڵەتی‌و گشتی بۆ کۆکـردنـەوەی فۆلکلۆر دابنێت، ئەمـە لە کاتێـك دا، ئەگـەر ڕژێمـەکـە لە کۆنفرانسی گشتیی یونسکۆدا بڕیاری لە سەر بدرێت.

بەڵگەنامە نوێیەکەی یونسکۆ دەڵێت :ـ هاوکاری‌کردنی وڵاتـانی دنیـا لە بواری ناساندن و بڵاوکردنەوەو پاراستنی فۆلکلۆردا بە تایبـەتی بەهۆی گۆڕینەوەی زانیاری‌و ڕاهێنانی پسپۆڕی ئەم لایەنە بە ناردنیان بۆ دەرەوەی وڵات و ئەڵقەی دراسی لەمیانی فۆلکلۆر پەروەران و تیپەکانی کارگێر ڕێکخستن دەبێت. (مـەبـەست لەو تیپـانـەیـە کە بە دوای کۆکردنەوەو تۆمارکردنی فۆلکلۆردا دەگەڕێن) بەمەبەستی پێرست کردن و بۆ چەن لق دابەش کردنی بەرهەمی فۆلکلۆری، بەپێی ئەوبۆنەو بوارانەی بۆیان گوتراون.

بۆیـە بە ڕای من :ـ ئێمـەش وەك میللەتێکی خاوەن سامانێکی لە بن نەهاتووی فۆلکلۆر، چاك وایە تا زووە هەوڵ دەین لایەنی گەش و زیندوو (ئی سوود بەخشی ئەم کەلەپوورە) لەفەوتان و لەناوچوون ڕزگارکەین، بۆ ئەوەی قوتابخانەی نوێی هونەری ئاوازو گوتنی کوردی کە لە دوا ڕۆژێکی نزیك گەشە دەکات و دادەمەزرێت، لەسەر بناغەیەکی ڕەسەن بوەستێت، بۆ ئەوەی ئەو ئاوازو گوتنـانـەی لەمـڕۆ بەدواوە دادەنـرێن، لە ڕەسـەنایەتی بەدەرنەبن و هەوڵ بدرێت بەم کەلەپوورە لە بن نەهـاتـووەی لە باوك و باپیران بەجێماو پشت ئەستوور بێت. تاوەکـو هەردەم مۆرکی نەتـەوایەتی خۆمانی پێوە دیاربێت و

ئاوازو گوتنی نویمان تام وبۆی کوردی لێ بتکێت.

**ماناى (بحث) واتە گەڕانی مەیدانی چیە؟**

مەبەست لە (المسح الميداني) یاخود (البحث الميداني) گەڕانە: بەناو گوندو دێهات و شارو ناوچەو گەڕەکە میللیەکانی شارە گەورەکانیشدا، بەدوای دۆزینەوەی هەموو بابەتە فۆلکلۆریەکان، کەواتە کرداری گەڕانی مەیدانیو، پشکنین و دیتنەوەو دۆزینەوەو قۆزتنەوەو کۆکردنەوەو وەرگرتن و پەردە لەسەر بەرهەمی شاراوە لادان و تۆمارکردنی فۆلکلۆرە.

بەڵام ئەمڕۆ من لەم نووسینەمدا گرنگی تەنیا بەلایەنی کۆکردنەوەو بەدوادا گەڕان و تۆمارکردنی گوتن و ئاوازی فۆلکلۆری خۆمان دەدەم.

**ئایا ئێمە تا ئەمڕۆ گەڕانی مەیدانیی تەواومان هەیە؟**

ئەوەندەی من ئاگادارم تا ئەمڕۆ زۆربەی ئەو گەڕانە مەیدانییانەو کۆکردنەوانەی لای خۆمان بۆ ئاوازو گۆرانی فۆلکلۆری کراون، لە سەدا (٩٥٪)ی یان، ناتەواون، چونکە من ڕام وایە:ـ هیچ کاتێك ئاواز لە گۆرانیدا (جا ئەو [1] گۆرانیە میللیو فۆلکلۆری یانیش تازە بێت) لە هۆنراوەی ئەو گۆرانییە کەمتر نیە، بۆیە ئەمڕۆ لە هەندێ وڵاتی پێشکەوتووی دنیادا، ئاوازدانەر ئاوازی خۆی دادەنێت و، دواتر بۆ شاعیرانی دەژەنێت، بۆ ئەوەی لە ئاوو باو بەرزیو نزمی نۆتەکان و غەمگینی، یا شادی ئاوازەکە بەپێی سووکی یاگرانی ڕەزمەکەی بکەن، تاوەکو هۆنراوەیەك پڕ بە بەژن و باڵای ئاوازەکە ببڕن.

ئەم جۆرە شاعیرە [شاعیری گۆرانی] ناودەبرێت، لە مۆسیقاوە نزیکە، مەبەستم خاوەنی گوێچکەیەکی مۆسیقای سووکەو، ڕەنگە تا ڕادەیەك شتێکیش دەربارەی ژەنینی ئامێرێکی مۆسیقا بزانێت یا هیچ نەبێ خاوەنی کتێبخانەیەکی مۆسیقایەو، بەردەوام گوێ لە بەرهەمی هەمەجۆر دەگرێت، بۆیە مۆسیقای (مارش) کە پڕهێزو هاندەرە، لە هی خەم و پەژارەو، مۆسیقای ئایین و ستاییش لە هی هەڵپەڕکێو شادی.... تاد جیادەکاتەوە.

بەڵام ئەوەی جێگەی داخە ئەو برا گەڕۆکانەی ئێمە تا ئەمڕۆ تەنیا هۆنراوەی گۆرانیە فۆلکلۆریەکان کۆدەکەنەوەو بە چاپی دەگەیەنن، هەندێ هەن کاسێتی پڕ لە بەرهەمی فۆلکلۆری پەیدادەکەن و گوێی بۆ شل دەکەن و هۆنراوەی گۆرانیەکان دەنووسنەوەو بە چاپ دەگەیەنن، شایانی باسە ئەو شایەرانەی کاسێت پڕدەکەنەوە گەلێ جار لە خۆیانەوە شت بۆ هەڵبەستە فۆلکلۆریەکان زیاد دەکەن، کەچی هەندێ لەو برا کۆکەرەوانە بێ سێو دوو ئەو بەیتە یاخود پارچە زیادکراوانەش بە فۆلکلۆر لەقەڵەم دەدەن و لەگەڵ هەڵبەستە ڕەسەنەکەدا بەچاپی دەگەیەنن!؟

بۆیە دەڵێم: ئەو کەسەی لەمەودا بە کاری گەڕانی مەیدانی هەڵدەستێت باشترەو سوود گەیەنترە، گەر لە فۆلکلۆردا پسپۆڕو شارەزابێت و لەهەمان کاتیشدا مۆسیقا ژەنێکی (نۆتە) زان بێت، بەڕادەیەك لە توانایدا بێت، نۆتەی ئاوازەکانیش لە تەك هۆنراوەی گۆرانیەکاندا بنووسێتەوە. خۆ ئەگەر دوو هاوەڵ بن (ئەمەیان ڕای خۆمە) یەکێکیان گرنگی بە شیکردنەوەو لێکدانەوەو بۆ چەن لق دابەش کردنی هۆنراوەی گۆرانیو، ئەوی دی گرنگی بە ئاوازو ڕەزم شیکردنەوەی گۆرانیەکان بدات، دیارە گەڕانە مەیدانییەکە سوودی زۆرتر دەبێت، چونکە بێشك ئەدیبەکە توانای شۆڕبوونەوەی بۆ ناو ناخ و قووڵایی هەڵبەستەکان لە مۆسیقاژەنەکە زیاترەو، مۆسیقاژەنەکەش لە مۆسیقاو ئاوازو ڕەزم و پەیژەی گۆرانیەکەدا، دیارە تواناو دەسەڵاتی لە ئەدیبەکە گەلێ زیاترە.

**گەڕانی مەیدانی لە کوێ بکرێت؟**

باشترین شوێن بۆ گۆرانیو ئاوازی فۆلکلۆری کۆکردنەوەو تۆمارکردن، وەك من بیستوومەو خوێندوومەتەوە، لە گوندو ناوچە سنووریەکان دا (ئەوانەی لە شارستانیەتەوە دوورن) بکرێت، چونکە دانیشتوانی ئەم شوێن و ناوچانە، تا ڕادەیەك، زمان و مۆسیقایان بەڕەسەنی ماوەتەوە، ئەمەش بەهۆی کەم تێکەڵیو نەبوونی ڕێگەی تازەی هاتووچۆکردن و.... تاد بۆیە لە فۆلکلۆری ناوچەو شوێنە سەرەڕێو قەرەباڵغەکان پاك ترەو تام وبۆی ڕەسەنی زۆرتری پێوە دیارە، لە کارتێکردنی

رادیۆو تەلەفزیۆن و تۆمارکەریش بەدوورتر بووە.

### ئەو کادرەی بە گەرانی مەیدانی هەڵدەستێت دەبێ چی رەچاو بکات؟

یەکەمجار ئەو کەسە دەبێ ئاگاداری تەواوی کەسانی پێش خۆی بێت (واتە ئەوانەی پێش ئەو بەگەرانی مەیدانییەوە هەستاون) بۆ ئەوەی بزانێ چ گۆرانییەك کۆکراوەتەوەو

نووسراوەتــەوە، تاوەکو ئەو جارێکی دی خۆی لەگەڵدا خەریك نەکات، بەڵکو هەوڵ لەگەڵ گۆرانییەکی کۆنەکراوەو بزر بدات و بەئەرشیفی بگەیەنێت.

### گەرۆکی میللەتانی دی چییان بۆ فۆلکلۆری خۆیان کردووە؟

هەردوو مۆسیقــای هەنگــاری (کــۆدای‌و پارتــۆك) لە ساڵەکانی زووی ئەم سەدەیەوە دەستیان بەگەران کردووە، بە دوای مۆسیقاو گۆرانی فۆلکلۆری خۆیان و بەشێکی چاکیان لێ کۆکردۆتەوەو بە ئەرشیف گەیاندووە، کەچی گەرۆکە هەنگارییە تازەکــان تا ئەمــرۆش لەم کارە بەردەوامن!؟ بە هیوای ئەوەی زۆرترین گۆرانی‌و ئاوازی فۆلکلۆری بدۆزنەوە، ئەو گۆرانیانەی دوو گەرۆکەکەی یەکەمجار بە تەواوی بەدەستیان نەکەوتووە، ئەمە لە لایەك و لە لایەکی دی، شتێکی سەلمێنراوە کە رۆژ لە دوای رۆژ رێگەو ئوسلووبی تازەتر لە بواری گەرانی مەیدانیدا دەدۆزێتــەوە کە پرۆگرامی رێك وپێك پەیرەو دەکات بۆ ئەوەی ئامانجی زیاتر لەم کارەدا بێتە دەست.

### کۆکردنەوەی فۆلکلۆر سوودی چیە؟

ئاوازە فۆلکلریەکان، لە هەنگاوە یەك بە دوای یەکەکانی مۆسیقا لە ئەوروپا، تا دەگاتە ئەمرۆش، سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندبوونە بۆ مۆسیقارەکان ، وەك سوود وەرگرتن لە رەزم و هەندێ پارچەی ئەو ئاوازانــەو تێکەڵ کردنیان لەگەڵ ئاوازی خویانا[2] . ئەوەی شایانی گوتنە:ـ پێش ئەوەی گۆرانیی فۆلکلۆری دەستکاری هەڵبەست یا ئاوازی بکرێت، پێویستە گۆرانیەکە بە هەڵبەست و ئاوازەوە بە ئەرشیف بگات[3].

### کۆکــردنــەوەی گۆرانــیی فۆلکلۆری‌و گەران بەدوایــدا کارێکی ئاسان نیە:ـ

١ـ مۆسیقــاری هەنگــاری بلیمــەت و بەنــاوودەنگ «پارتۆك»، بەرلەوەی دەست بەکاری گەرانی مەیدانی ـ (بەدوای گۆرانی‌و ئاوازی فۆلکلۆری خویــانــدا) ـ بکات مۆسیقاو زمانی هەموو میللەتە دراوسێکانی خۆیانی خوێندو فێربوو، وەك یوگۆسلاڤی‌و رۆمانی‌و عارەبی، چونکە رای وا بوو:ـ بەبێ ناسینی مۆسیقاو گۆرانیی فۆلکلۆری میللەتــە دراوسێکان، ناتوانرێ مۆسیقای فۆلکلۆری هەنگــاری بنــاسرێ. بەم پێیــە ئێمــەی گەرۆکی کوردیش گەر دیــراســەی گۆرانی‌و مۆسیقاو زمانی میللەتانی دراوسێی وەك عەرەب و تورك و فارس و ئازەری هی‌تر نەکەین و نەخــوێنــین، ناتوانین جیاوازی لە میانی ئاوازێکی فۆلکلۆری رەسەنی کوردی‌و یەکێکی رەسەنی عەرەبی یا تورکیدا بکەین، کەواتــە چەنــد لە ئاوازی فۆلکــلۆری‌و زمــانــی میللەتــانی دەوروبەرمان دا، ووردبینەوەو شارەزابین، ئەوەندە لە هەڵە بە دوور دەبین.

٢ـ خاتوو «پۆرشۆی ئیلۆنا»ی مامۆستاو پرۆفیسۆری ئینگلیز، ماوەی یەك ساڵ و نیوی رەبەق، لە گوندێکی «میسری»دا ژیانی بردەســەر، بۆ ئەوەی شارەزای زمــان و ئاوازو مۆسیــقــای فۆلکلۆرییــان ببێت، ئنجا ساڵی (١٩٧٠) توانی پەرتووکێکی بچکۆلانە دەربارەی گۆرانیی فۆلکلۆری زەماوەند لەو گوندەو، گوندەکانی دەوروبەریدا بەچاپ بگەیەنێت!؟

٣ـ خاتوو «جەمیلە جەلیل» کچە کوردی سۆڤیەت، کە هەڵگری بروانــامــەی (مــاستــەر)ە ماوەی حەفت (٧) ساڵان، لەنــاو دێهاتەکانی کوردنشینی ئەوێدا، خەریکی گەران و هەوڵدان بووە، ئەوجا توانیویەتی کۆمەڵێك گۆرانیی فۆلکلۆری خۆمان؛ (بــەلام بەهــۆنــراوەو نۆتەی مۆسیقای ئاوازی گۆرانیەکانەوە) بەچاپ بگەیەنێت.

٤ـ مامــۆستاو برای بەرێزم (حوسێن قەددووری)یش، ماوەی (٩) ساڵان تەنیا بە دوای گۆرانی‌و یاریی مندالانی ناوچەکانی ناوەراســت و، خواروو، رۆژئــاوای عێراق دا گەراوە؛ بەلام تا ئەمرۆ تەنیا دوو کتێبی بەچاپ گەیاندووە.[1]

## بۆچی دەبێ ئاوازو هۆنراوەی فۆلکلۆری بە ئەرشیف بکات؟

میللەتی ئێمە لە بواری (گەرانی مەیدانی)دا دواکەوتووە، لە کاتێکدا میللەتانی جیهان، هەتا ئەوانی دراوسێو دەوروبەریش هەموو جۆرە هەل ومەرجێکی پێویستیان بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە لا دەست دەکەوێ، بۆیە مافی خۆمانە لە سامانی نەتەوایەتی خۆمان بترسین، چونکە ئەوان گەر هیچ نەکەن، دەتوانن ئاوازو لاوك و گۆرانیی رەسەنی ئێمە، وەرگرن و بە هەڵبەستی خۆیان تۆماریکەن!؟ هەر بۆ نموونە:ـ

١ ـ عوود ژەنی عیراقی بەناوودەنگ خوالێخۆشبوو «جەمیل بەشیر» کاتێك هەندێ لە ئاوازی لاوکە کوردییە رەسەنەکانی وەك [عەبدالَیو سوارۆ.... تا] بەتۆمار گەیاند، لە زۆر لای دنیادا دەنگیدایەوە....... هەندێ گوتیان:ـ داهێنەری مۆسیقای نوێی عەرەبە!؟ تاقمێکی دی وەك خاوەن قوتابخانەیەکی نوێی مۆسیقا ناویان برد. (*)

٢ـ ماوەی چەن ساڵێکە گەلێ گۆرانیو لاوکی فۆلکلۆری کوردی کوردستانی تورکیا، لەلایەن هەندێ گۆرانیبێژی وەك «ئیبراهیم داتلی سەس»ەوە بە هۆنراوەی تورکی بە تۆمار دەگەن!؟

بۆیە دەڵێم:ـ مۆسیقا ژەنی نۆتەزانی خەمخۆری هونەری رەسەنی لە باوك و باپیران جێماوەوە، ئەوەی بەرژەوەندی هونەری میللەتەکەی وەك بەرژەوەندی خۆی، بگرە زیاتریش رەچاودەکات، تا زووە با قۆڵ و بازووی کارکردنی لێ هەڵماڵێت، ئەم کارە تا رۆژێك زووتر بێت چاکترو سوود گەیەنترە، تاوەکو رادیۆو کاسێت و تەلەفزیۆن و ڤیدیۆ، لە لایەك و لە لایەکی دی گۆرین و شێواندن و دزین و زەوت کردن، کاریان لەکار نەترازاندووە.

**فۆلکلۆر وەك زانستێك چی بۆ کراوە؟:ـ**

ئەمرۆ لەجیهاندا بە دەیان قوتابخانەو پەیمانگە هەن، تایبەتن بە فۆلکلۆر خوێندن، لە هەندی زانکۆی جیهانیشدا گرنگیدان بە فۆلکلۆر خوێندن و کۆکردنەوەو شیکردنەوەی بەردەوامە، هەروەها کادری پسپۆر بۆ ئەم بوارە پێدەگەینن. (٦) کەچی ئێمەی کورد بەداخەوە، تا ئەمرۆ نە کۆمەڵێ نە دەزگایەکی تایبەت بە فۆلکلۆر شك نابەین. ئەوەی تا ئەمرۆ هەیە کاری تاکە کەسە، چونکە گەرانی مەیدانی بۆ ئەم مەبەستە «تفرغی» دەوێ، ئەمەیشیان بەهاسانی مەیسەر نابێت.

**ئەو کادیرەی بەگەرانی مەیدانیەوە هەڵدەستێت:ـ**

گومانی تێدا نیە کە کاری گەرانی مەیدانیو، کۆکردنەوەو، تۆمارکردنی گۆرانیی فۆلکلۆری، پێش کاری خوێندن و شیکردنەوەو، هەڵسەنگاندن و، بۆ چەن لق بەش بەش کردنی فۆلکلۆر دێت، ئێمە یەکەمجار دەبێ هۆنراوەو ئاوازی فۆلکلۆری پەیداکەین، ئەوجا دەتوانین بەراوردو خوێندن و شیکردنەوەو بۆ چەندین جۆر دابەشی بکەین؛ بەڵام تەنیا بەکرداری کۆکردنەوەو تۆمارکردن قایل بوون (لەگەڵ گرنگی ئەم کارەدا) کارێکی ناتەواوە، کەم کورتی تیادا بەدی دەکرێت، بەرامبەر زانستێکی ئینسانی وەك «فۆلکلۆر».

ئەوەی ئەم زانستە لە زانستەکانی دیکەی ئینسانی جیادەکاتەوە ئەوەیە، تۆ لە زانستی فۆلکلۆردا ئەو شتەی گەرەکتە مامەڵەی لە گەڵدا بکەیت، ئامادەو لە بەردەست نیە، بەڵکو پێویستی بە هەوڵدان و گەران و کۆکردنەوەو تۆمارکردن هەیە، بۆ ئەوەی بەردەستی بخەیت، ئەوکاتە بەکاری خوێندن و شیکردنەوەو جیاکردنەوە هەڵدەستی تا وەکو جۆرو هۆو رەگ وریشەو ئەسڵ و چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئەم فۆلکلۆرە تێ بگەیت و روون بکەیتەوە.

یەکەم کاری گەرۆکی مەیدانی، سنوورو پرۆگرام و پلان دانانە، لە هەمان کاتدا رەچاوکردنی تایبەتییەتی ناوچەییە بناغەو بنچینەی هەر رژێمێکی خوێندنیش بەندە بەو شتانەی کە باس و خوێندنی لەسەر دەکرێت بۆ نموونە:ـ

(مێژوو نووس) لەگەڵ زانیاری مێژووییدا و، (ئەدیب) لەگەڵ باسی ئەدەبیدا مامەڵەدەکەن. کەچی لە فۆلکلۆردا مامەڵە لەگەڵ شتە کۆکراوەکەدا دەکرێت. ئەویش وەك گوتمان بەیەك تاکە رێگە پەیدادەبێت، کە گەران و پشکنین و کۆکردنەوەو تۆمارکردنە، بۆیە ئەو کەسەی کاری گەرانی مەیدانی دەگرێتەبەر گەرانەکەی بە بربرەی پشتی کارەکەدا دەنرێت.

ئەگەر لەناو لاپەرەکانی گەلێ کتێبی پەیوەندیدار بەم

بابەتەوە بگەڕێین، بۆمان دەردەکەوێ، کە لە جیهاندا زیاتر لە ڕێگەیەك و قوتابخانیەك هەیە بۆ ئەم کاری فۆلکلۆر کۆکردنەوەیە.

گەلێ کەسی فۆلکلۆریی واش هەن سەر بە هیچ یەکێك لەو ڕێگەو قوتابخانانەنین، بەڵکو لە هەڵبژاردن و گرتنی ڕێگەو شێوەی کارکردن و کۆکردنەوەو گەڕان، سەربەستن. بەڵام ئێمە لە هەموو ئەو ڕێگەو شێوەکارکردن و قوتابخانانە دەتوانین شێوەیەکی ناوەندی هەڵبژێرین.

### خۆ ئامادەکردنی گەرۆك پێش گەرانی مەیدانی

ئەو کەسەی دەیەوێ بە کاری کۆکردنەوەو، گەرانی مەیدانی هەستێت، لە یەکەم چرکەوە، (واتە لەو چرکەیەوە کە لەگەڵ خۆیا بریار دەدات، دەست بەم کارە بکات) پێویستە هەر زوو خۆی بە باشی ئامادە بکات، لەوانەیە ئەم خۆ ئامادەکردنەش مانگێك یا زیاتر بخایەنێت؛ بەلام کارەکە گرنگەو گەرۆك بە هیچ جورێك نابێ پشت گوێ ی بخات. گەرۆکی مەیدانی هی خاوەن تاقیکردنەوە، ئەوەی زووتر بەکاری گەرانی مەیدانی هەستاوە، لە ناوەراستی کارەکەیداو لە گەرمەی ئیش کردندا، کاتێك دێ خۆی لەناو چەندین تەنگوچەڵەمەدا دەدۆزێتەوەو کارەکەی لێ ئاڵۆز دەبێ، [ئەوە گەر بەبێ خۆئامادەکردن دەست بە گەران بکات]، بۆیە پەیرەو کردنی ئەم چەن خاڵەی خوارەوە بەووردی، دەبنە هۆیەك کارەکەی بۆ ئاسان دەکەن:-

أ - گەرۆکی مەیدانی، پێش هەموو شتێك پێویستە ئاگاداری هەموو ئەو شتانە بێت، کە دەربارەی ئەو ناوچەیەو، دانیشتوانی‌یەوە نووسراون، کە ئەو نیازیەتی تیایدا دەست بە گەران و کۆکردنەوەی گۆرانیی فۆلکلۆری بکات، چونکە ئەم جۆرە نووسینانە دەربارەی مێژووی کۆمەڵایەتی ناوچەکەو، خووو نەریتی دانیشتوان و، رۆشنبیری‌و ئایین و باری ئابووریان، شارەزایی باشی دەدەنێ، دیسانەوە جوگرافیای ناوچەکەو، ڕێگەی هاتوو چۆکردن، زۆر گرنگن بۆیەو، شارەزای دەکەن، رەنگە ئەم خشتەیەی خوارەوە تارادەیەك یارمەتی گەرۆك یارمەتی گرۆك بدات بۆ ئەوەی دوای سەرچاوەی پێویست بۆ کارەکەی بگەرێت:-

١- زنجیرەو کتێب و زانیاری فۆلکلۆری بە چاپ گەیشتوو، لەوانە، کتێب و گۆڤاری نەك هەر لەمەیدانی فۆلکلۆردا؛ بەڵکو ئەوانەیش کە پەیوەندی‌یان بە فۆلکلۆرەوە هەیە وەك:- ئەدەب، ئەنسرۆپۆلۆجی، مێژوو، زمان، دیالێکت و، بابەتی کۆمەڵایەتی.

٢- بابەتی دیراسەی رۆشنبیریی گشتی.

٣- بلاوکراوەی مۆزەخانەیی ناوچەکە.

٤- دەلیل یا ڕێگەنیشاندەری (گەشت و گوزار - سیاحة).

٥- بلاوکراوە گشتی‌یەکانی میری (هی تەندروستی‌و، سەرژمێری دانیشتوان و، راپۆرتی ئابووری‌و... تاد).

٦- مێژووی ناوچەکە.

٧- رۆژنامەی ناوچەیی گرنگە گەر دەست کەوێت.

٨- فەرهەنگەکانی دیالێکتەکانی ناوچەکە.

٩- شتە نووسراوەکانی‌دیکە کە پەیوەندی‌یان بە بابەتەکەی ئەوەوە هەیە.

هەموو ئەو شتانەی لەسەرەوە نووسیمان، رەنگە بۆ گەرۆکی مەیدانی، مەیسەر نەبێ بەلام گرنگ ئەوەیە گەرۆك هەوڵدات زۆرترین سەرچاوەی تایبەت بەم بابەتەی دەسکەوێت و، بە زووترین کات تێبینی‌خۆی دەربارەیان بنووسێت و لای خۆی هەڵیگرێت یا لەسەریان بگرێتەوە.

### پەیوەندی‌کردنی گەرۆك بەوانی پێش خۆی

گەرۆکی تازە پێویستە پەیوەندی بە گەرۆکەکانی پێش خۆی بکات، بۆ ئەوەی هەرچی زانیاری‌یەکی سەبارەت بەم ناوچەیە هەیە [کە ئەو نیازیەتی گەرانی تێدا بکات] لەهەموو روویەکەوە لێیان وەرگرێت، دیسانەوە رەنگە گەرۆکە کۆنەکە، یارمەتی گەرۆکی تازە بدات بەوەی، ئەیەلێ لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکەدا بکەوێتە تەنگ و چەڵەمەوە، هەروەها چاکترین ڕێگەی نیشان بدات، بۆ وەرگرتنی زانیاری لەدانیشتوانی ناوچەکە، بە ئاسانترین شێوە، رەنگە ناوی ئەو کەسانەشی بداتێ کە لەناوچەکە دەست رۆیشتوون و، جێگەی باوەری خەڵکن، بۆ ئەوەی پشتیان پێ ببەستێت، لەکاری زانیاری کۆکردنەوەدا، لەگەڵ ئەوەی کە [ئەنجومەنی دەوڵەتان - هی مۆسیقای میللی] بەم دواییە بریارێکی دەرکردووەو، تیایدا ئامۆژگاری دەکات و دەڵێت:-

**(باشتر وایە گەرۆك بۆ کاری کۆکردنەوەی فۆلکلۆر بۆ ناوچەیەك نەچێت، گەر زانی لەو ناوچەیە گەرۆکێکی دی خەریکی گەرانی گۆرەپانە تیایداو هێشتا لە کاریش نەبوتەوە).**

**پەیوەندی کردن لەگەڵ کەسانی دیار لە ناوچەکەدا**

پەیـوەندیکردن بەم جۆرە کەسانە، تا نەگەیتە شوێنی کارکردن، بۆت ناکرێت، دوای گەیشتن، گەرۆك هەوڵ دەدات، چاوی بەو کەسانە بکەوێت و بیان ناسێت و لەگەڵیان دانیشێت و، داوای یارمەتییان لێبکات، بۆ ئەوەی گەرانەکەی لەهەموو رووییەکەوە ئاسان و تەواو وبێ کەم و کورتی بێت، هەر چەندە لەوانــەیــە ئەو کەســانــە نەتوانن هەموو جۆرە زانیارییەکی پێبـدەن؛ بەڵام پەیـوەنـدیکـردن بەو کەسانەوە، بەبێ شك سوودی هەیە، بۆ ئەوەی گەرۆك ناوچەکە بەباشی شارەزا ببێت.

**ئامێرو کەل و پەل :**

ئەو شتانەی یەکەمجار گەرۆك دەبێ گرنگییان پێ بدات و هەوڵی پەیدا کردنیان بدات ئەمانەن :ـ

کاغــەزی سپی، ئامــێری کارەبــایی وەك هی دەنــگ تۆمــارکردن، (ئەوەی بەکارەباو پاتری ئیش دەکات)، هەروەها تێپ و کاسێت و کامــێراو فلیمی هەمەجۆر، لێرەدا چاکتر وایە گەرۆك نەخشــێ شارەزایی لەبــارەی ئاوو بای ناوچــەکــەش پەیدابکات، بۆ ئەوەی ئامێری ئەوتۆ لەگەڵ خۆیا ببات بە کەڵکی ئەو ناوچەیە بێت، شایانی گوتنە :ـ هەر تۆمارکردنێك و وێنەیەکی گەرۆك لە ناوچەکەوە دەستی دەهێنێت، یەکەیەکی گرنگن لە کارەکەیدا.

**ناسین و شارەزابوونی کەلەپووری گۆرانی:**

بۆ گەرۆك شتێکی بە سوودە، کە زانیــاریو شارەزایی لەسروشتی گوتنی ئەو ناوچەیە هەبێت، کە گەرانی تیادا دەکات، هیچ نەبێت چەن گۆرانیەکی ناوچەکە بە هەڵبەست و ئاوازەوە لەبــەرکــات. بۆ ئەوەی دڵی خەڵکی ناوچــەکــە بۆ لای خۆی راکێشێت، بەوەی جار جار شتێکیان بۆ بڵێت، تا وەکو بارو دۆخ و، پەیوەندییەکی ئەوتۆ دروست کات، شەرم و ترس لە میانا نەمینێت، چونکە تۆ گەر یەکەمجار (مەبەستم لەگەڵ گەیشتنت بۆ ناوچــەکــە) بە پانتــۆڵ و چاکەتەوە لە ئۆتومبیل دابەزیت و ئامێری کامــێراو تۆمــارکــەرت داگرت و دامەزراند، زۆربەی ئەوانەی نیازت هەیە شتیان لێ وەرگریت، تووشی شەرم و جۆرە شێوانێك دەبن، بۆیە لەژێر بارو دۆخی وادا گەر شتیش بڵێن، هەڵبزرکاوو ناتەواوو هەناسە سواری پێوە دیار دەبێت، دوای ئەوە گۆرانیی گوتنی گەرۆك دەبێتە هۆی ئەوە خەڵکی ناوچەکە، گۆرانیی کۆنیان بێتەوە یاد.

**سنوور دانان بۆ کاری گەرانی مەیدانی :**

پێویستە (دلیل - رێ نیشاندەر)ێك بۆ ئەم کارە دابنرێت:ـ

١ـ چونکە سنوور دانانە بۆ ئەو بابەتەی دەمانەوێ خۆمانی پێوە خەریــك بکــەین وەك:ـ یاریو گۆرانیی منــدالان، یاخــود گۆرانیی کارکردن... تاد.

٢ـ سنووردانان بۆ ماوەی کار، هەندێ هۆکار هەن پەیوەندیی راستەوخۆیان بە کەسایەتی گەرۆك و تواناو لێهاتوویی و رادەی شارەزاییو... تاد ئەوەوە هەیەو، کاریگەرن بۆ زوو یاخود درەنگ تەواوبوونی کارەکە.

٣ـ دەست نیشان کردنی ئەوشوێنەی تیایدا دەست بە کاری گەرانی مەیدانی دەکەین.

٤ـ سنــوور دانــان و دەست نیشــان کردنی ئەو ئاگــاداریو زانیارییانەی دەربارەی ناوچەکەوە کۆی دەکەینەوە.

**جۆرەکانی گەرانی مەیدانی :**

**لە جیهاندا چوار رێگە هەیە بۆ ئەم کارە :ـ**

١ـ رێگــەی گەران [مســح] :ـ ئەم رێگەیە لەلایەن کەسانێك بەکاردێت کە پسپۆر بن لەم کارە داو گرنگیش تەنیا بە یەك جۆر یاخود لق دەدەن وەك «گۆرانی شایی».

٢ـ رێگەی قووڵ [العمیق] :ـ ئەمەشیان بریتییە لە کۆکردنەوەو گەرانێکی فراوان بە دوای هەمــوو جۆرو لایــەن و لقــەکــانی گۆرانیی فۆلکلۆری، لە کۆمــەڵگەیەکی یەك ناوچەییدا یاخود

زیاترو هەندێ جاریش لە کەسێك یا زیاتر وەری دەگرێت.

٣- ڕێگـەی ناوچـەیی :- ئەمەش بریتییە لە جۆرێك یا زیاتر گۆرانیی فۆلکلۆری کۆکـردنەوە، لە ئەندامانی خێزانی خۆی یادراوسێکانی، یانیش لە خاوەن کارو پیشەکان وەری دەگرێت.

٤- کۆکـردنـەوەی لابـەلا [عـرضي]:- ئەمـەشیان بریتییە لە کۆکردنەوە، بە شێوەیەکی لابەلا واتە کەیو لە کوێ ماوەو پشوو هەبوو گۆرانیی فۆلکلۆری کۆدەکاتەوە، ئەمەیان کۆکردنەوەیەکە بێ ڕژێمە.

ئەمەی سەرەوە ڕێنیشاندەرە، واتە دەلیلی کارکردنە، هی [گـەرانی مەیدانی - المسح یاخود البحث المیداني]، شایانی باسـە تا ڕۆژێ زووتـر دەست بە گەران بکرێت، هێشتا هەر درەنگە، ئەم کارە شایانی دواخستن و گوێ پێنەدان نیە، بە پێچـەوەنەوە پێویستی بە پەلەکردن و، تازوو خۆ ئامادەکردنی تەواوو قوڵ هەڵماڵین هەیە، بە مەرجێك کارەکەمان پرۆگرام دار بێت و، تارادەیەك سوود لە خاڵەکانی ناو ئەم باسە وەربگیرێت.

شایـانی باسـە نووسەری ئەم کورتە باسەش، هەر لە ساڵی (١٩٧٩)وە، بە تاکـە کەسیو بێ پشتگـیری هیچ دام و دەزگایەکی رەسمی تەنیا هاندەری هونەرمەندو هونەردۆستانی ئازیز بوونە، بۆیە بەهەڵ و تەقەڵلاو هیمەت و کاغەزو ئامێرو.... تاد، خۆی؛ بەڵام نەك بەردەوام بەڵکـو بەپێی دەرفـەت، بۆ نموونە: لە پشووی هاوین و نیوەی ساڵ و جەژن دا، هەروەها دوای قوتابخانەو کاتی بێئیشی، سوودیشی لە هەموو ئەم ڕێگەو قوتـابخـانـانـەی گەرانی مەیـدانی وەرگـرتـوە، هەروەهـا لە مامـۆستـایان (حسین القدوري) و (اسعد محمد علي) و هی دیکەش سوودی دیتووە. ئەمرۆش هەندێ لەو ئاوازو هۆنراوە فۆلکلۆریانەی کۆی کردوونەتەوە، نەك هەمووی، لەگەڵ هەندێ لە ئاوازەکانی خۆیا، لەدووتۆی کتێبێك دا، بە ناوی (باڵەبان) لە دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی لەژێر چاپدان؛ بەڵام لەو کتێبـەدا هۆنـراوەی گۆرانیـەکـانی وەك خۆی، واتـە بێ شیکردنەوە داناوە، شیکردنەوەی ئەم هەڵبەستانەی بۆ ئەدیبانی پسپـۆر جێهێشتـووە، بەڵام بۆ ئاوازەکان، تا ڕادەی دەست ڕۆیشتنی، هەوڵی شیکـردنـەوەی (ڕەزم - ئیقـاع)و مەقـام و پەیژەی ئاوازەکانی داوە.

**پەراوێزو سەرچاوە**

١- کچـە کوردی سۆفییەت - جەمیلە جەلیل - تا ئەمرۆ دوو کتێبی لەو بابەتەی (مەبەستم لە هەڵبەست و نۆتەی مۆسیقای گۆرانیەکانە) بە چاپ گەیاندووە.

٢- گ. ڕەنگین. ژمارە (١٠)ی ئابی ١٩٨٨ . ل. (١٤).

٣- لە چاوپێکەوتنێکدا کە لەگەڵ مۆسیقاژەن و نووسەری ناسراو «ئەسعەد محـەمـەد عەلی، لەبـەغـدا لەماڵی خۆیاندا کردم گوتی: [[ئەو کەسەی دەسکـاری هۆنـراوە یا ئاوازی رەسـەنی گۆرانیـەکی فۆلکلۆری بکات، بەڕلەوەی ئەسڵی ئاوازو هۆنراوەکە بە ئەرشیف بکات، بەرامبەر میللەت بە (تاوانبار) دادەنرێت]].

٤- حوسێن قەددوری - کتێبی «لعب واغاني الأطفال الشعبیة - في العراق» بەشی یەکەم و، بەشی دووەم.

٥- وریا ئەحمەد - جەمیل بەشیر. گ. ئۆتۆنۆمی ژمارە (٢)ی ساڵی ١٩٨٥. ل. ٩٥-٩٩.

٦- وریا ئەحمەد - پەیمانگەی کۆدای. گ. ئۆتۆنۆمی ژمارە (٥٩)ی ساڵی ١٩٨٨. ل. ٨٧-٩١.

٧- گ. الموسیقیٰ العربیة ژمارە (٢)ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٨٣. ل. (١٣١).

٨- گ. الموسیقیٰ العربیة. ژمارە (٨)ی شوباتی ساڵی ١٩٨٧. ل. (١٠٠).

٩- گ. الموسیقیٰ العربیة ژمارە (٥)ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٥. ل. ٦٢-٦٧.

تۆمارکردن

**(فایلێکی تایبەت بەکۆکردنەوەی مۆسیقاو گوتنی فۆلکلۆری)**

زنجیرە    ناوی بەرهەمە تۆمارکراوەکە    ناوی ئەو کەسەی بەرهـەمەکەی لێ وەرگیراوە    هەندێ زانیاری دەربارەی ئەو کەسە    شوێن و کاتی تۆمارکردن    ناوی تەواوی گەرۆك    ماوەی بەرهەم    تێبینی

ناوی گۆرانی :-    پارێزگە:    قەزا: گوند:    تەمەن: مەقام :-

ڕەزم :-    گوتن:    ژەنین:    بەروار:    ئیش:    تێبینی





# كاروان

عدد خاص بالفلكلور والتراث الكردي

مجلة ثقافيـة شهرية، تصدرها الامانة العامة لادارة الثقافة والشباب باللغتين الكردية والعربية

رئيس التحرير
محمد أمين مد

نائب رئيس التـ
حسين رشوانـ

٦
حزيران
السنة الـ

الثمن ...

في هذا العدد



العنوان : اربيل الامانة العامة للثقافة والشباب ـ مطبعة الثقافة ـ مجلة كاروان : هاتف : ٢٢٦٥٨ .

# ماذا يعني الفولكلور لأي شعب؟

**تعددت تعاريف الفولكلور او التراث الشعبي بتعدد المذاهب والمدارس المعنية بهذا الحقل الخصب الواسع الذي لم يستقطب اهتمام الباحثين الا في هذا القرن.**
**وقد تناول الباحثون في شتى بقاع الأرض وبلغات مختلفة جوانب الفولكلور وقلبوها على وجوهها المختلفة ونقبوا عنها وافاضوا في ذلك الى درجة الاشباع.**

ولأجل شمول الفولكلور لشتى نواحي حياة الأنسان وتواجده مع وجوده وفي جميع ادوار حياته واطوار نموه من لحظة ما يستقبلونه اثناء ولادته إلى ان يودعوه الوداع الأخير ويودعوه باطن الأرض - ولأجل ذلك فان الفولكلور لايخص مرحلة معينة من مراحل حياة البشرية .. في وحشية وبداوة ومدنية وحضارية، ولا مرحلة من مراحل عمره كفرد، ولايخص فئة او شريحة من المجتمع وانما هو عام شامل يغطي الحياة كاملة و يتشابك في الوانها وحالاتها من صغير وكبير ومن فقير وثري ومن خطير وحقير، ومن ذكر وانثى وفي حالة السراء والضراء، وفي حالة الحزن والفرح، وفي حالة الرضا والغضب، وفي حالة الطمأنينة والفزع، وفي حالة الذل والجبروت، وفي حالة الزهو والتواضع، وفي حالة الزهد والجشع.

انه يشمل الحياة كلها في المجال الفكري والعاطفي والمهني والمادي بمعناه الأوسع ليشمل طراز البناء وطراز الملبس وطراز المأكل والمشرب وطريقة تحضير المأكل والمشروبات وطريقة تناولهما واقتناء الاثاث وطريقة الاهتمام بالدواجن وطريقة الصيد وصنع ادواته وممارسة الحرف وصنع ادواتها وطريقة استعمالها.

ويشمل ممارسة الحب، والحركات والتعابير التي يتخذها المحبان من الجنسين لأنشاء صلة الحب وفي كافة مراحله مع اختلاف بين الرحّل واهل الريف واهل المدن في بعض منها واتفاقهم في معظمها ويقال الشئ نفسه في تنوع الأساليب والتعابير والحركات المتعلقة بمراحل الحب بين الشعوب حتى يكاد ان ينفرد كل شعب ببعض الأساليب مع اتفاقهم في نقاط معينة.

والفولكلور يظهر وينتشر ويعيش ويتطور وينتقل من جيل الى

جيل ويضيف اليه كل جيل ما يستجد لديه منه بتأثير العوامل والمتغيرات الثقافية والسياسية والاجتماعية والاقتصادية ويحدث كل ذلك بدون تخطيط وتوجيه وتعليم مبرمج ، بل يدوم ويستمر ويزداد ويتوسع ويتغير بعفوية وبصورة تلقائية كما تتعاقب وتتوارث أجيال النباتات والأشجار الطبيعية في الغابات والسهول والمروج .

والفولكلور يمازج الانسان في فكره وعاطفته ولسانه وحركاته وممارسته في كل ميادين حياته ويتلقاه بدون قصد ووعي في جميع مراحل عمره كما يتلقى لغة الأم في مرحلة الطفولة والحداثة والفتوة والرجولة والكهولة .

وقد بدأت الدول تولي اهتماماً كبيراً بتناول الفولكلور في جمعه وتصنيفه وشرحه وتبسيطه وتحليل اصنافه وبيان اهميته في حياة الشعوب وارتباط الكيان والمقومات القومية به بشكل عضوي محكم وقد خصصت الدول مبالغ طائلة لخدمة الفولكلور وانشأت صحفاً خاصة به ومؤسسات خاصة لخدمته .

وفي العراق توجد مجلة متخصصة في التراث الشعبي وبهذا الأسم تصدر في وزارة الأعلام وقد سدت هذه المجلة فراغاً كبيراً في هذا المجال .

وبالنسبة للفولكلور الكردي فقد إنتبه بعض الكتاب والادباء الى اهميته وتبادر بعضهم ليكتب عنه مقالة في جريدة واخر ينشر بعض نصوصه في احدى الصحف بدون استمرار ودوام على منهج معين لتناوله .

وأول عمل جاد وواسع ـ حسب علمنا ـ ماقام به الشاعر الفيلسوف (پيرەمێرد) في اهتمامه المتواصل بجانب من الفولكلور وهو العظات والعبر في جمل قصار ونظماً في جريدة ژين تحت عنوان (پەندەکانی پیرەمێرد ـ امثال پیرەمێرد) وبعده يأتي الكاتب والاديب والباحث الراحل علاء الدين سجادي الذي جمع منه كمية لابأس به في مسلسله القيم الثمين (رشتەی مرواری ـ عقد اللؤلؤ) ويتسم ماجمعه پیرەمێرد ـ كما قلنا ـ بطابع العظة والعبر والنصائح . ويتسم ما جمعه السجادي بالطرف والنوادر والفكاهة .

وقد ازداد اهتمام بعض الكتاب والادباء في الآونة الأخيرة بالفولكلور الكردي وازدانت المكتبة الكردية بجملة صالحة من انتاج هؤلاء في عدة فروع من الفولكلور الكردي ، ولكن ماتم تحقيقه في هذا المجال وحفظ من التلف لايشكل الا جزءاً يسيراً من البحث الزاخر للفولكلور الكردي . لذلك لاتزال الحاجة ماسة الى مزيد من اللحة للأسراع بتسجيل ماتبقى من فروع الفولكلور الكردي قبل ان تمتد اليه يد الفناء . بل قد وصلت الى بعضه . ومما يجب الالتفات اليه في مجال الفولكلور الأهتمام بتحليله وشرح مراميه والمقارنة بين النصوص الواردة على معنى واحد في المناطق المختلفة والمقارنة بين مالدى الكردي من صنوف الفولكلور وتشابهها مع مالدى الشعوب الاخرى وأوجه الأختلاف فيما بينهما .

واذا كان الفولكلور شاملاً ومستوعباً لحياة الاقوام بكل مفاصلها وجوانبها لنا ان نثمن المقدار الذي دون وحفظ من الفولكلور الكردي الذي يتعرض للآفات اكثر مما لدى الاقوام الأخرى وتزداد قناعتنا بوجوب مبادرة من يستأنسون في انفسهم المقدرة للعمل في هذا المجال بأقصى سرعة لانقاذ ما يمكن انقاذه مما تبقى من الفولكلور ، لأن تغيير الحياة بهذه السرعة يفضي الى ضياع اكثر جوانب الفولكلور مع ذهاب الجيل المخضرم الذي يتعلق الفولكلور بوجوده .

فحبذا لو وجهت المؤسسات الرسمية المعنية بالثقافة الكردية عنايتها الى هذا الجانب وقامت بحملة منظمة لجمع وحفظ الفولكلور الكردي لصيانته وايصاله الى الأجيال القادمة قبل فوات الأوان .

حسين رشواني

# العنقاء في التراث الأدبي الكردي

سرفراز علي النقشبندي

● **التراث** عالم غزير متشعب إستوعب الكثير من التفسيرات وعكس الدلالات والمعاني التي ظهرت بأشكال مختلفة.. وللحيوان دور كبير وتواجد مستمر وبمظاهر شتى في مداخل التراث، فكما نعلم أن الصلة بين عالم الانسان وعالم الحيوان قديمة قدم تواجدهما وقد أدت هذه الصلة الى بروزه معبراً عن تساؤلات الانسان البدائي وحيرته ازاء الظواهر التي صاحبت وجوده على الارض وعلى نحو رمزي كاشفاً تطلعاته ومخاوفه متخذاً شكل الأساطير والحكايات والطقوس والمعتقدات التي ترسبت لتكون تراثاً شعبيا يكون البداية للعلوم والفنون والأديان.

وتقودنا دراسة الحيوان في التراث الى معرفة الكينونه الاجتماعيه والمعتقدات التي كانت تؤمن بها تلك الشعوب، وتحديد البعد التأريخي لها والطبيعة الجغرافية لتلك المواطن ومدى تأصل وعمق تلك المعتقدات في نفوس ذلك المجتمع.

والحيوان في التراث إما أن يكون رمزاً لمدلول معين أو قد يعبر عن أفعال تمثل قوى الخير والشر حيث يحكى عن لسانه العبر والمواعظ لترسيخ القوانين والأسس والاخلاق المراد توطينها في نفوس البشر كما نلاحظ في كتاب كليلة ودمنة.

(وليس بعيداً أن تتطور الأسطوره تحت الظروف الاجتماعية والدينية عبر العصور حتى تتخذ شكل الخرافة عند ذلك ينسى أصلها الديني وتدرج مع الحكاية الخرافية[١]). «كالعنقاء» التي نحن بصددها، واختلاف الناس من حيث تصورها وقدرتها الخارقة.

وعلينا أن لاننسى دور الأديان في الحقبات التأريخية المختلفة في ترسيخ وتطوير وتغيير هذه المفاهيم واذابتها في بوادق تتلاءم مع مايؤمنون به ومايدعون اليه.

وللكرد تصوراتهم الخاصة بهم عن هذا الطائر تظهر بشكل أو بآخر في حكاياتهم الشعبية أو خلال استخدامهم له كرمز شعري له مدلولاته، أو عبر آثاره الشاخصة على جدران وأبواب المدن الأثرية في كردستان كما سنأتي الى سردها تباعاً

فالعنقاء أو كما يسميها الكرد ـ سيمرخ ـ والتي تعني ثلاثين طيراً في لغة الفرس. وفي الأفيستا جاءت ـ سيمرغ ـ ويذكرها الجاحظ في (الحيوان) (ج٢ ص١٢) تحقيق عطوى «كانت مصورة في بسط الملوك واسمها عندهم ـ سيمرك ـ واستعملها المسيحيون رمزاً للولادة واستعملها ابن عربي للتعبير عن (فكرة قيام المهدي[٢]).

(وفي الصين تعرف العنقاء بأسم ـ فينك هوانك ـ وقيل بأن ـ الفينك ـ ذكر ـ والهوانك ـ أنثى ويعني ذلك بأن العنقاء ثنائية الجنس أي خنثى[٣]) ويقابلها باللغة الانكليزية ـ فينكس ـ Fenix ـ وقد جاء ذكر العنقاء في تأريخ الحضارات القديمة (بأن التسمية أتت من ـ Purple ـ أي بمعنى أحمر قان كالدم ـ Black Red ـ إشارة الى الارض أو الساحل الارجواني لسوريا المشهور بصناعة الاصباغ الارجوانيه والقرمزيه والذي يعتبر موطناً للعنقاء[٤]).

وقبل تقصي أخبار العنقاء وصفاتها تقودنا الضرورة الى الحديث عنها كونها سيدة الطيور وتسعى جميع الطيور للمثول أمام حضرتها ورمزاً للآلهة عند الغابرين. (وقالت الطيور إن العنقاء سيدتنا وملكتنا فأشكو لها وكيل البحر. لقد خاف وكيل البحر واعاد فراخ الطيطوي[٥]).

لقد أوقد هذا الطائر القرائح وألهم الحاكين والشعراء والفلاسفة حتى بات رمزاً إلهيا كما في رسالة الطير لأبن سينا والغزالي وفي منطق الطير لفريد الدين العطار متأثرين بما جاء عن الطيور في السور والآيات الكريمة كسورة النور «والطير صافات كل قد علم صلاته وتسبيحه والله عليم بما يفعلون» مستلهمين خيالهم من أخبار الطيور واحوالها ومن هنا نشأ أدب جعل الطير يسعى للأتصال بذات الله.. ويتخذ ابن سينا الفلسفة الى رحلته سبيلاً بينما يسعى الغزالي والعطار لبلوغ تلك الغاية عبر التصوف.. (فالفلسفة تستخدم العقل والعقل



عاجز عن إدراك سر الفناء. أما التصوف فيصل الى ذلك عن طريق العشق الألهي الى حد الفنــاء والبقــاء مابعـد الفنــاء «التفتازا في المدخل الى التصوف ص[١٣٣] وينطلق بعض الصوفية في حالة الفناء الى القول بالاتحاد والحلول ووحدة الوجود التي لاتفـرق فيهـا بين الانسان والله وبين العالم والله[٦]). ويذكر العرب المسلمون بأن العنقاء طائر عظيم لايرى إلا في الدهور «والعنقاء» هي العقاب لأنها تعنق بصيدها، (وان العقاب جميعه أنثى «نهـايـة الارب للنـويـرى ج[١٠] وحياة الحيوان الكبرى للدمــيرى ج[٣] ص[١٢٦] وان ذكورها من طير آخر لطيف الجرم (نهـايـة الارب ج[١٠] ص[١٨١] المخصص ج[٨] ص[١٤٢]) (ولأبن عنين الشاعر في هجو شخص يقال له ابن سيدة:

**ما انت إلا كالعقاب فامه / معروفة وله أب مجهول[٧])**

ونحن نرى بأن العنقاء شئ والعقاب يختلف عنه. فالعقاب من فصيلة الجـوارح وهناك نوعان منه عقاب وزمج، فأما العقاب فمنهـا (السـود والخـوخيـة والابيض والاشقر ومنها مايأوى الجبال ومايأوى الصحارى ومايأوى حول المدن[٨]). ويحكى ان قيصر ملك الروم أهـدى كسرى ملك فارس عقـابـاً فأعجبتـه وصـادبهـا ثم وثبت في صيدها على صبي من حاشيته فقتلها كسرى[٩]).

ويذكر القزويني بأن (العنقاء تخطف الفيل، واذا طارت سمعت لأجنحتهـا دوي كدوي الرعـد القاصف وتعيش الفي سنـة. امـا ارسـطاطا ليس فيقـول انها تصطاد فيصنع من

